


# تەفسیری کوردی

## لە کەلامی خوداوەندی

مەلای گەورە
( مەلا محمدی کۆیی )

بەرگی شەشەم

# تەفسیری کوردی

## لە کەلامی خوداوەندی

مەلای گەورە

( مەلا محمدی کۆیی )

بەرگی شەشەم

جوزئی ( ١٦-١٧-١٨ )

لەسەر ئەرکی بەڕێز مام جەلال سەرۆک کۆماری عێراقی فیدراڵ لەچاپدراوە

## سورەتی (الكهف)

### له ئايەتی ٥٣ تا كۆتايی

﴿قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكَ؟﴾ (زيادة) (تأكيد)ە ﴿إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِي صَبْرًا﴾ ديارە هەريەك (نَوعاَمـا) بـه دروشـتی و (آمـال)ی تـوڕەيـی قـسەيان كرديـه ﴿قَـالَ إِنْ سَأَلْتُكَ عَنْ شَيْءٍ﴾ كـه بيكـەی ﴿بَعْدَهَا﴾ پـاش ئـەمجارە ﴿فَـلاَ تُـصَاحِبْنِي﴾ (رفاقەت)م مەكە ﴿قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّي﴾ له (طرف) من ﴿عُذْرًا﴾ گەيشتيه (عُـذر) بۆ (نزك)ی ((مُصاحبه)م، وه من چيتر نهانم نامينیٚ ﴿فَانطَلَقَا حَتَّـى إِذَا أَتَيَـا﴾ هەردووكيان ﴿أَهْلَ قَرْيَةٍ﴾ ديارە (قصد)ی (أهل)يان كرديـه، بـۆ نـان خـواردن، تووشەيان پـیٚ نەمايـه بۆيـه ئەفـەرموی: "﴿اسْـتَطْعَمَا أَهْلَهَـا﴾ ئـەوی (قابـل)ە (سؤال)ی لیٚ بكریٚ، بۆ ميوان داری.(سؤال)لـه (تكرر)ی (أهـل) كرايـه. (صـلاح صفدی) (شـعراً) (سـؤال)ی لـه(سَبك)ی كرديـه؛ ئـەويش بـه (شـعر) (جـواب)ی دايتـەوه (وكـذا عزالـدين علـی الموصـلی) (في الحقيقـة) لـەو (تكـرار)ە (زيـد)ە (تشنيع)ی ئەفامرێتەوه. ئەو دوو (ذات)ە (ولَوْ) نەشيان ناسـن، ڕوو كەنـه هـەر مالیٚ (طلب)ی ميوانـداريان لـیٚ بكـەن ﴿فَـأَبَوْا أَنْ يُـضَيِّفُوهُمَا﴾ (إبـا) بكـەن لـه ميوانداريان، شايانی (تشنيع) و (ولَوم)ن ﴿فَوَجَدَا فِيهَا﴾ لـه دیٚ يـدا ﴿جِـدَارًا﴾ ديارە (أوّلاً) بۆ ديوار نەهاتينه ﴿يُرِيدُ أَنْ يَنقَضَّ﴾ پـەل بـوو، نێزيكـی ڕووخـان بوو ﴿فَأَقَامَهُ﴾ ديارە (حضرەت)ی (موسی) (معاونەت)ی نەكرديه. لـه (فكـر)م نـەبوو، (خـلاف)يـان لـه نـاوی دیٚ يەكـه (عـرض) كـەم؛ چۆنی (إقامـه) كـرد؟ دەستی پێداهێنا، هەستاوه، ڕاست و (مُحكم)بـوو! ج (قەيـدی)يـه (أُعجوبـه)ی

(بنی إسرائلی) تەواو نابیٚ، چی بلّیٚ هەیە! (مساحە)ی دیوارەکە (عرض) کەم؟ (سیّدی آلووسی) ئەفەرمووێ: "(نَوَوی) لە (وَهَب)ی (بن)ی (مُنَبّهْ) (نقل) ئـەکا (طول)ی (١٠٠) (ذراع) بوە" باسـی پـانی و بلّنـدی نیـە. (یَفْري) لـە (ثعلـب)ی (نقل) ئەکا (بلّندی (٢٠٠) (ذراع) بە (ذراع)ی دیٚ یەکە؛ (طـول)ی (٥٠٠) (ذراع)؛ پانی (٥٠) (ذراع)) ئەمە دیوارنیـە، (سدّ)ی (سـکندەر)ە خـوا (عـافو)یـان کـا! ﴿قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا﴾ دیـواری (ثعلـب)ی (أجـر)ی زۆر ویستیە؛ (معلـــوم) نیـــە (أهـــالی) (تحمیـــل)یـــان کردبـــا! مـــاوەی مانـــەوەت زێـــتر هەلّناگری﴿قَالَ﴾ (عبد)ی خوای: ﴿هَـٰذَا فِـرَاقُ بَيْنِـي وَبَيْنِـكَ﴾ " ئەمـە جـودایی (بَین)ی من و (بَین)ی تۆیە؛ (رفاقەت)ت تەواو بوو؛ من بەلایە، تـۆ بەلایـە، لیـك جوایەز ئەبینەوە " ﴿سَـأُنَبِّئُكَ﴾ (الْآنْ، مُؤَكّداً) ﴿بِتَأْوِيـلِ مَـا لَـمْ تَـسْتَطِعْ عَلَيْـهِ صَبْرًا﴾ دیارە (فعل)یش وەکی (محو) (تأویل) ئەکری؛ (ظـاهراً) شـتیٚ؛ (معـنیً) شتیٚ تر ﴿أَمَّا الـسَّفِينَةُ فَكَانَـتْ لِمَـسَاكِينَ﴾ بـیٚ دەسـەلات؛ (مقابـل)ی (ظـالم) و (جبّار)ە؛ (آلووسي)یش ئەمـە (ترجیـع) ئـەکا، وە (تفـسیر)ي بـە (محتـاج)یـش (نقـل) ئەفـەرمویٚ ﴿يَعْمَلُـونَ فِـي الْبَحْـرِ﴾ بـۆ (نفـع)ی خۆیـان لـە (بحـر) بـە (سفینە)ی خۆیان هات و چۆیان ئەکرد ﴿فَأَرَدْتُ أَنْ أَعِيبَهَا﴾ بۆ (غـرق)یـان نـا؛ بۆ (حِفظ)ي (مالّ)ی ئەو (مساکین)ە، بیٚ هێزانە ﴿وَكَانَ وَرَاءَهُمْ مَلِكٌ﴾ دووایان؛ (یعنی) (تعقیب)یان ئەکا، (لازم) نیە بە (ذات)ی خۆی. دیارە (مقصد) لە پـاش و پێش (عین)ی (شخص)ی (ملك) نیە ﴿يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ﴾ خۆ (معلوم)ە خـۆی بو (غصب)ی (کُلّ)ی (سفینە)یە ناچیٚ ﴿غَصْبًا﴾ ئەوی بـیٚ (عیـب) بـیٚ، ئـەوی بە (بحر) دا بڕوا، لە (مُلك)ی وی، دەستی بەسەردا دەگری. (إحتمـال)ی هەیـە (محاصـرە)ی (مجـری)ی کردبـیٚ، وەك (ألمانیـا) لـە (حـرب)ی (عمـومی). وە (معلـوم) نیـە، ئـەو (مـساکن)ە، لـە دەریـای وی بـووین﴿وَأَمَّـا الْغُـلَامُ﴾ ئـەوي کوشتم.﴿فَكَانَ أَبَوَاهُ﴾ باب و داکـي. ﴿مُـؤْمِنَيْنِ﴾ هـەردوو مُـؤْمِن و مُوَحّـدْ، وە خۆي کـافري ڕێگـري مُفْسِدْ. ﴿فَخَـشِينَا﴾ ئێمـە ترسـاین. دیـارە ئـەو کَـلامـەی

عَبْدەكەيە، أما بلێین ئەمە رأسا كلامي خوايە تأويلي (خشينا) بكەين، نە موسى راضيە نە رَفيقي، بەڵكو خواش پێی قايل نيە! لام وايە (زُمَخشَري) بەو كشفە راضي نيە!. ئەڵێ ترساين ﴿أَنْ يُرْهِقَهُمَا﴾ بەسەرياندا بێ دايانگرێ. ﴿طُغْيَانًا﴾ لەسەر خەلق﴿وَكُفْرًا﴾ دەربارەی خوا، وە كُفراني نعمەتی بەخێوكردن دەربارەی داك و بابی، ئەوانيش مُحَقَّقيان بووە لێی بێزار بووين خوا خوايان بووە لە كۆڵيان بێتەوە. ئەڵێن(أفلاطون) داينابوو منداڵی بەوَلَدْ بووبا أطِبّا فَحصيان ئەكرد، ئەگەر بيانزانيبا إنساني توندو مەندو بە قوەت و چاكی لێ پەيدا نابێ، نەياندەهێشت نوور ببينێ! داك و باوكيش لايان گران نەبوو! ﴿فَأَرَدْنَا﴾ بە تَمَنّا و دوعا و پاڕانەوە لەبەر خوا. ﴿أَنْ يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا﴾ مادام ئەوان بۆ خوا فەوتانی جگەر گۆشەي خۆيان ئارەزوو ئەكرد، مەرحەمەتي إلاهي واينواندیە بۆيان تُبديل بكا بە وَلَدي ﴿خَيْرًا مِنْهُ زَكَاةً﴾ لە جِهەت پاكيەوە، زائِدْ، وە زەكي، بە تەواوي تێ گەيشتي.﴿وَأَقْرَبَ رُحْمًا﴾ رُحمي أولاد، كەم وايە دەربارەي داك و باب تەواوبێ! أغْلَبْ نِسْبيە، خاصَّةً كە بكەوێتە أيّامي پيری. ﴿وَأَمَّا الْجِدَارُ﴾ ديوارەكە ﴿فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ﴾ ئەگەر نەيفەرمووبا ﴿يَتِيمَيْنِ﴾ فَهم نەدەكرا كە گچكە بووين. ﴿فِي الْمَدِينَةِ﴾ دێيەكە، يا شارێ دێێ نێزيك لە دێيەكە. نازانم بە دێ دەبێژرێ (مَدينە)؟ ئەگەر ببێژرێ، ئەبێ بێ تأويل بێ؟!. يا لە وادي تأويلدا ئەيلێين؟! ﴿وَكَانَ تَحْتَهُ كَنزٌ لَهُمَا﴾ خەزنە، ديارە! خەزنەكە إطْلاق بكرێ، پارەو زێڕو زيوو و موجەوهەرات دێتە ذِهن! بە لَوْحە هەرچی لێی نوسرابێ، ناگوترێ كَنز!. قوربانی(إبنُ عَبّاس) بم ئەيكاتە كَنْزي عِلْم- شُكُر خۆی تێرو مَعْدەنی عِلم بووە-. ﴿وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا﴾ باوكيان. ديارە باوك كە إطلاق كرا بۆ بابی بێ واسِطە ذِهن ئەڕوا!. نازانم بۆ چی يەكێ ئەڵێ: بابی دەيەم؟ يَعْني جَدّي نۆيەمينی بووە. (جَعفَري صادق) ئەڵێ: بابی سابِعي بووە! نازانم كاميان صادقن؟ مُمْكنە ئەو زاتە حەقي لەسەر ئەو مبارەكە بوو بێ؟ يەكتريان ناسی بێ. ﴿فَأَرَادَ رَبُّكَ﴾ ديارە، وە إلا ئێمە بۆ

ئەو ديوارە نەهاتين بزانين ئەڕەمێ نارمێ؟ ئەو أهاليە دڵيان ڕەق بوو نانيان نەدايني وە دايان نەكردين، نا عِلاج ڕوومان كردە پەناى ئەو ديوارە، كە وام ديت چاكم كردەوە!. گەلێ جار موسولمان بەسەر جێى شەڕ ئەگەن، ئەبنە مانعي فتنە، ئەڵێن: خوا إرادەى كرد لەو وەختە پێ ڕاگەيشتن، وە إلاّ وا وا ئەبوو خراپ ئەقەوما. ديارە خواي توو إرادەي كرد﴿أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا﴾ قووەتي خۆيان، مُمْكِنە لەدەرووپشتي إحْتِلام بوون بووبن!. ﴿وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا﴾ ديارە زانيويتيان، وە ياخود كەسێ بووە ئاگاداربێ و خَبَريان بداتێ. ﴿رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ﴾ يا أرْحَمَ الرّاحمِين رَحْمَتَكَ ارْجو! ﴿وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي﴾ بە هەوايي نَفسْ، خود سەرانە، بێ وَجْە وحِكْمَت و فائدە. ﴿ذَلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا﴾ بزانم چ (إعتراض)ت ما؟ ئەو كارەى كرد؛ آيابە (وحى) بوو، بە (إلهام) بوو، ياخود شارەزا بوو، (أحوالات)ى ئەو وولاتە ى ئەزاني؟ (خصوص) ئەگەر بڵێين: (ولد)ى (صلب)ى (آدەم) بوە، تا ئەو ڕۆژە، (دنيا)ى پشكني يە، لە نێك و بەدى (عالَم) ئاگادار و شارەزا بووە؛ ئەگەر بێ (علم)ى (غَيْب) بێ، بەس (إشكال) لە (قتل)ى كوڕەكەدا هەيە. (مع أنَّهُ) (لازم) نيە كە فەرمووى ﴿وَعَلَّمْنَاهُ مِنْ لَدُنَّا عِلْمًا﴾ئەو (ماجرى)يە ى لەسەر (علم)ى (مَدنى) كردبێ. وە لە (سِيَرْ) (نقل) ئەكەن (بعض)ێ (أوليا)ى ئێمە (حسب الشرع) شتێ حراپيان كرديە؛ دواێ دەركەوتووە (خدمەت)ى (دين) و (شرع)ى تيابوە؛ ئەمە باشە (مُبارك) بێ. (إمّا) ئەوەى (أوّل) و (آخر)، (ظاهر) و (باطن) (قبيح)ە (بهائم) پێ ى (راضى) نيە، ئەو چيە؟! (ولايەت) ئەمەش (هضم) ئەكا؟ ئەوا بۆ ئەو (ذات)ە مان (سەلماند) كە خوا (نقل)ى لێ ئەكا، وە چ خراپەى لێ ناگرێ ديويەتي ئەو كوڕە بە (قلم)ى (قُدرەت) لێ ى نووسراوە (هذا كافِرٌ) وە كوشتي بۆ (سائر)ى (أوليا)ى (تصوّف) هەيە؟ (مع أنَّهُ) (أوليا)ى ئێمە گوناهكاران، بەڵكو كافران، (مغدور)آن ئەبينن، (نظر) بە (كشفيّات)ى خۆيان. وەئەڵێن: "(أوليا ) (محفوظ) ن" (يعني) گوناە (تأثير)يان تێ ناكا، لە (مقام)ى

خۆ (تنزّل) ناکەن؛ زێرا (سِرّ)ی (قدر)یان بۆ (کشف) بوه، گوناهیان (إطاعه)یـە ئەدی (وَلي) وا دەبـێ. ئـەوی ئـەو (ذات)ە کـردی ئەگـەر نـەی کردیـا(مسؤول) ئەبوو. ئەگەر لە (شرع)ی (تصوّف)ی لەسەری با، ئەبا (إلى يـوم القيامـە) ئـەو (نوع)ە (عمليات)ە ی کردبا؛ (عَلاوه) (قتـل) بـەو نـاوە (مُوجـب)ی (إحـتلال)ی (نظام)ە.

لەسەر (حکایەت)ی ئەو دوو (ذات)ە، (رۆسا)ی (دین) چ (نِزاع)ێکی ئەکـەن؟ دووایێ دێنە (نزاع) لە (أفضليّەت)ی (نُبوّەت) و (ولايەت).

(تأويل)ێکی ئەکەن بە (ولايەت)ي (وَلِيّ) و (نبوّەت)ی (نَبی). بەڵێ(ولایەت) (أفـضل)ە؛ چـونکی (وَلی) ڕوو بـە (حَـقّ)، (رسـول) ڕوو بـە (خَلـق)ە، (حقّـا) قسەیە، بێ مەعنا ! (حتّی) (إبنُ حجر)یش کـە (وَلی) پەرستـە، پـێ ی (راضـی) نیـە؛(رسـول) ڕوو بـە (خَلـق) نیـە ڕووی (خلـق) ئەکاتـە لای (خـالِق)؛ جـا (کرامەت)هەیە، نیە؟ (مُعتزلي) ئەلێ:"نیە" وە (إلاّ) لەگەڵ (مُعجزه) (إمتیـان)ی نابێ– (الجواب) ئەبێ. (رسـول) (إدّعـا)ی (تَحـدّي) ئـەکا (وَلـي) (إدّعـا)ی نیـە؛ ئەمـەش خۆیـان پێـی (راضـی) ئەکـەن (مُعتزلـی) ئـەڵێ: "(مُعجـزه) ئەوەیـە؛ (رسول) (مُدّعی)یە، کە لە (طرف) خواناردراوە؛ (طلب)ي (قوەت)ی لێ ئەکەن، (خوای ئاسمان و زەمین بە چ لەشکر و سوپاە، تۆی ناردووە؟) (بە (مُعجزه)). چیە؟ (ئەمەتـە). وە ئەفـەرمووێ: (مُعجـزه) (دلالـەت) لـە (صـدق)ی (رسـول) ئـەکا؛ ئەگـەر لـە (غـیر)ی (رسـول) ویـوم بـێ (دَەعـوا) بێتـە جـێ، (دلالـەت)ی (خارِق) لە (صِدق)ی (رسول) کوو ئەمینی؟

هەرچی ببێتە (مُعجزه) بۆ (رسول)، (جائِز)ە ببێتە (کرامەت) بۆ (وَلی)؛ زێرا (فـارق) (إدّعـا)یـە (حقيقـةً) ئەمەیـە (مُغالَطـة) ئەچـی؛ بـەڵێ مـن بەئەوەنـدە (راضی)م؛ (لکن) ئەوەی لە (قُدرەت)ی (إلهی) بەدەرە بۆ ئەبێتە (کرامـەت) بـۆ (وَلی). (مُحال) چۆن ئەبێ؟ ئەگەر (مُحال) ببێ، ئیشی تێك ئەچێ! (أولیاء) لـە ناو ئێمە، وەکـی(أحِبّـا) و (أبنـا)ی (بـنی إسـرائیلی)یە ئـەوان بـە مـەرامی خـۆ

گەیشتن؛ بونە (سیِّد) و سەروەر ڕەهبەری (أُمَّەت)، (صاحِب)ي (قُبَّە) و (طلاء) و (دوڵەت) و (ثروەت) (مـلا)ی ڕووت و قـووت، بـۆ (خـاطر)ی وان لەگـەڵ یـەك شەڕ ئەکەن! قوڕ بەسەر (ملا)، (حـال)ت خۆشـە! مـردی زینـدی کردنـەوە بـۆ (وَلی) لە ئاو خواردنەوە (سَهل) ترە. (أمَّا) (مـع الأسـف) چ زینـدی ئەکەنـەوە؟ مریشك، بـارگیر، کـەر، پیـاوی زینـدی ناکەنـەوە، کـەڵکی (أمَّـەت) بگـری؛ لـەو (ذِلَّەت)ە مان(نجات)دا؛ ئیتر بەس بیّ؛ دڵم سەغلەت بوو (یا وایە)یا ئەوانەی کە میّ ئەبنە (مُنوِّر)، بەجاریّ لە (دین) دەرئەچن؛ بە (سفاهەت) (مـشغول) ئـەبن. سەدخۆزی خوندەوار نەبان؛ بۆ خوشیان و بو (أمَّەت)یش قانزاج تر بوو. مەلای چاکیش کەمن، یان نەمان؛ ئەوی هەیـە لەبـەر (فقـیر)ی چـی پـیّ نـاکریّ؛ خـوا خوایەتی (لُقمە) نانەکی دەست کەوی؛ بیکا بە (قوت)ی (لایموت).

لە(دور)ی (تعالی) (ملا)ی چاك و خانەدانی (عـالی) نـەژاد زۆر بـوون. ئـەیان توانی (مُقابلە)ی (ملوك) ڕاوەستن. ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ ذِي الْقَرْنَيْنِ﴾ (عبارەت)ی بە (صیغە)ی (مضارع) دادەنی؛ دیارە(قبـل الـسؤال) (جنـاب)ی (حـق) (سـؤال) و (جواب)ی بۆ (ترتیب) دایە وەناردیتی. (سُبحان الله، مـعَ هـذا) ئـەوی ئـەی لـێن ئەی لێن! ئەوا (قرەیش) بـە (تلقـین)ی (یهـود)یـا (یهـود) (سـؤال)یـان لـە (ذي القرنین) کرد، (جواب)یان درایەوە ﴿قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُمْ مِنْهُ ذِكْرًا﴾ ئێمـە لـە کـێ سؤال کەین ئـەو زاتـە کـێ بـووە؟ لـە چ شَـعْبي بـووە؟ جـوابي ڕاسـتي لـە کـێ وەرگرین؟ بچوو تەماشای (روحُ المَعاني) کـە! (سَـیِّدي آلوسـي) زۆر بـە سَـلیقە بووە توانی ئەو هەموو قسانە بنوسێتەوە! خۆي لاي وایـە (ئەسـکەندەري بـني فەیلەقووس) ڕۆمی یۆنانی یە، ئەوی حَربي لەگەڵ (دارا)ي ئێرانی کرد بە سەریا غالِـبْ بـوو! !. بزانـە کـەس دونیـای هـەموو نەگرتیـە وەنـاگیریّ، قابِـل نیـە! ناشُکْري نەبیّ مُلکي (سُلَیمان) ئەوەندە واسِعْ نەبوو بەقـەدەر نیمـچە دەوڵـەتیّ ئێستا بي! (نەمروود) و (بەخت و نصر= نبُو خُذ نَصر)هیچ! دەوڵـەتی (آشـور) و (کلـدان) بـوون کـەمیّ سِـعَتیان سـتاند، دەوڵـەتی ئێـران مـەحـوي کـردن!

(ئەسكەندەر) فتوحاتي زۆري بووە، مَعلوم نيە فتوحاتي بەقەدەر (جەنگيز) و (تەيموور) بوويێ، إسْتِشارەي سياسي لەگەڵ (أرسطو) بووە، (أرسطو) و (أفلاطون) لەوانە نين إنساني عالم ناويان بە سووكي بێنێ. حَقًا چەندە حُكَماي يۆناني بووين، مُحَيِّر العُقولن! لە ناو ئەو قَومە مُشْرِكانە، چۆن هەڵكەوتينە؟! چۆن خوايان دۆزيتەوە، بە چ تَجَرُّدي، بە چ تَقَدُّسيێ؟! نِسبەتي كُفر بۆ ئەوانە عَيني جَهالَتە. ئەمڕۆش عالەم لە عِلْميان إسْتِفادە ئەكا، جێي فَخرن بۆ بَشريَّت، قياسيان لە (سەندەقۆق) و (مەندەقۆق)ي ناكرێ! دونيايي بە جَمْهوريەتي (ئەفلاطون) خەني بووين!!. كە (ئەسكەندەر) ئێراني گرت تَعَجُّبي لە عَقْلياني كرد، ترسا لێ يان، تەماي بوو گەورە گەورەكانيان إعْدام كا، بۆ حَكيمي نووسي، جوابي دا مەيانكوژە أمّا لەگەڵ يەكيان بكە بە دوژمن دەوڵەتي گچكە گچكەيان لێ تَشكيل كە هەر (خانێ) بكە (مَلَكي) فِرقەيێ لە بەر عَداوەتي مابەيني خۆيان هەموو لەگەڵ توو صادِق ئەمێنن! حالاً إنكليز تَعقيبي ئەم سياسەتە ئەكا، عالەمي إسْلامەتي لە باريەك هێنادەر، لە هِندستان گەورە گچكە مُتَوَسِط گەلێ حكومەتي تَشكيل كرديە، لەو سايەيەوە إمپراطوريەتي خۆي لەسەر هِند ئەكا. من وا ئەزانم ئەگەر عِلمي ئەوانە نەهاتبايە ناو ئێمە، عُلماياني إسْلام لە عُلماي جوولەكەو ديانان زێتر نە دەبوون! وە هەموويان ئەبوونە تِلميذي (كَعْبُ الأحبار) و (وَهبْ بنِ مُنَبِّه)! وە زۆر مُتَأسِّفم بۆ (يۆنان) ئەو نەوعە عُلَمانيانە لەوان هەڵكەوتينە، خۆيان بوون بە (عيسَوي)! ئەو عُلومانەيان لە قيس خۆدا! لە سايەی (مأمون) عِلميان ما، ئەمڕۆ بە واسِطەی موسڵمانان حُكَماي غَرب لێيان إستِفادە ئەكەن!. بەڵێ وانيە هەرچي ئەوانە فەرموويێتيان، حەق بێ! من لە گەلێ جێ قسەيانم رَدْ كرديە بە وَجْهي مَعْقول! أمّا حَقُّ الإنصاف مَنْبَع و مَعْدەني عُلومي مُفيدەن!.

بۆچي پێي ئەڵێن (ذو القَرنَين)؟ (طَنْطاوي) وَجهەكي دۆزيوەتەوە لە هەموان خۆشترە. لە (عَلي) نَقل ئەكەن ئەو زاتە دەعوەتي خەلقي بۆ خودا

كرديه، ضَربەكيان لە لای ڕاستي دا، مرد، خوا زيندی كردەوە، ئەوجارە لە لای چەپيان دا، يَعْني لە ڕاست و چەپ سەريازي، تَكرار خوا زيندی كردەوە، ئەوجا ناويان نا (ذو القَرنَين) وە دونياي گرت. بە ناوی (إمامي عَلي) ڕوايەت بكرێ چۆن ئەبێ بڕوا نەكرێ؟! خصوص (شيعه) طَلاقي لە سەر ئەخوا. (وَهب بنِ مُنَبِه مُبارك) ئەفەرموێ: دوو لا سەري لە نُحاس بووە!!!. وە مُمكِنە (قَرن) بە مَعنا قووەت بێ، ئەو زاتە صاحيبي دوو قووەت بووە، قووەتی مُلك و قووەتی عِلم، دێ ذُوالجَناحَين بووە! حَقّا إنسان لە أقوالي مُخْتَلفەی نَقّالات سەري سوڕ ئەمێنێ!! قُرآن كتێبی هدايەتە، ئەوی بيڵێ، فائدەی ڕوحيّە يە بۆ إنسان! چيە ئەوەی ئەيفەرموێ؟ ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الأَرْضِ﴾ قووەت و قەدري گەورەيمان دا بەوي لە أرْضي، مُمْكنە ئيشارەبێ بۆ مكانَتي إرْثي كە لە باوكی بۆي بەجێ مابوو. ﴿وَآتَيْنَاهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ﴾ لە لَوازِمي مُلْك و إدارەي. ئەو نَوْعە عومومە لە قُرآن و مُحاوَراتي عومومي دا، زۆرە! وە تخصيصيي لە مَقام، فَهم ئەكرێ! مَثَلا ئەڵێن: ئەو تُجارە هەمووشتی هەيە، ئەو باغە هەموو شتی تيا هەيە، و هكذا! ﴿سَبَبًا﴾ هەر شتە سببَي خۆی. عِلم تەنها مَدارە، أمّا بەتەنێ،سَبَبُ الكُلْ نيە! وە ئەگەر عِلْميش إرادە بكرێ، ئەبێ عِلمي إدارە و سياسەت مُراد بێ! ﴿فَأَتْبَعَ سَبَبًا﴾ بۆ لای مَغْرب ئەوي لازم بوو بۆ ئەو سَفَرە، مُهَيّای كردو ڕۆيی ﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ الشَّمْسِ﴾ (نهايەت)ی (عِمارەت) لە (جِهەت)ی (غرب)؛ (ذاتاً) (مكدونيا) لە (غرب) نيزيكە (أولاً) بۆ ئەو (طرف) چووە.

(علما)ی (هيئەت)ی (قديم) ئەيان فەرموو: "لە (جزائر)ی (خالدان) بەولاوە (مَعموره) نيه" (بعض)ە (أحاديث)آن (نقل) ئەكەن، (دائر) بە (شمس) (بعد الغروب) لەگەرم و ساردی كانياوان بەزستان و هاوين؛ ئەمڕۆ ئەو (أخبارات) (محو)ی (لازم)ە. (رضوان)ي خوای لە (حضرەت)ی (أبادردا) بێ، لێ ی (نقل) ئەكەن؛ (وكذا) لە (إبن عباس) (ڕۆژ كە ئاوابوو ئەچێتە بن (عرش) وە (سجده)

ئـەبا، (رخـصەت) ئـەخوازێ لـە كـام (طـرف) (طلـوع) بكـا) ئـەوە قـسەيە بۆ(أساس)ە؛ (ألآن) لێرە رۆژئاوا ئەبی لەگەلّ (بلاد)ی (أمريكا) (مُخـابره) بكـە تازە رۆژ هەلّدێ؛ لە (بعض)ە جێش شەوە.

لە (أصول) ئەلّێ: "(خبر)ی كە (كذب)ي (معلوم) بـوو؛ (حـديث)ي (رسـول الله) نيە" (تمام).

(سبب)ی نەزانینی ساردی و گەرمی ئاو (نقـص)ی گەورەيـە، بـۆ (رسـالەت) پەناە، ئەو (جواب)ی (نسيەت)ی بۆ ئەدەن؛ (غَير) (معقـول)ە؛ ئـەبا شـەرم لـە پێغەمبەر بكەن، ئەو شتانە (نسبەت) بەو ئەدەن.

(سابقاً) (عرض)م كردينە،(دائر) بە (أحوال)ی (أكوان) (إعتبار) بە (نُقّال)آن مەكەن. لام وايە (حكايەت)ی گـاو سـندی هنـديم نوسـيە؛ لـە (بغـدا) وێكـرا لـە خـانوو دابـووين ئێـوارەو سـبەينان رووی ئـەكردە لای رۆژ ئـاواو رۆژهـەلات، شتێكی ئەخوێنـد؛ (سـؤال)م لـێ كـرد، بـۆ روو ئەكەيـە لای (شمـس)؟ ووتـی: "ئێمـە رۆژ ناپەرستين، خـوا ئەپەرستين، روو ئەكەينـە رۆژ؛ تـا كـە ئـاوا بـوو (شاهد)يمان بۆ بدا، لای خودا "ووتم:"بەچـی ئـەزانن، رۆژ شـتێكی بـە (علـم) و (خبر)ە؟ وە بە چ ئەزانن لـە خـوای (كَتم) ناكـا؟ وە ئەگـەر رۆژ (خـبر) نەداتـە خوا، خوا نازانی ئێوە ئەی پەرستن؟ " تەماشای كردم و ئاوی لە چـاوی گـەرا، ووتـی" "چ بلّـێم؟ بـە منـدالّی وامـان پـێ ئـەلّێن" ئـەوجا بزانـە، لـەو (نـوع)ە (أحاديث)ە (مُداخل)ەی (خارجي)ەيە ! وەك (حُبُّ الهِرَّةِ مِنَ الإيمـان) كە ديم (مصر)ی (تقديس)ی كتكيان ئەكرد، ئەوا زانيم لەو (نقل)ە ئـاينی وا هەيـە؛ لام وايە بە زانينی (إعتقاد) و ئايينی (أجانب) گەلێ شت بۆ ئێمە (كشف) ئەبێ؛ لـە (كشف)ی (أوليا)يان چاترە ﴿وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ﴾ وای ديت كـە رۆژ ئاوا ئەبوو، لە كانيەكی لێلّ بـە قـوڕە رەش، وەكـو و ئێمـە لـە (كۆيـە) ئـەلّێن: "وام ديت كە لە لووتكەی (باواجی) رۆژ ئاوا ئەبوو" وا دەرئەكەوێ لە (سِيَر)ی (عالَم) (أوائل) وايـان ئـەزانی رۆژ چـەندە ديـارە، هـەر ئەوەنـدە، دووايـی وردە

وردە (تَنبّـە)یـان بـوو بـۆ گـەورەیی (شمـس).(أمّـا) لـە (زمـان)ی (اسـكندر) (معلوم)یان بوو بوو، كە گەلێ لە (أرض) گەورەترە، وە لە (أرض) زۆر دوورە. بە ناو كانی لە (أرض) دا ناچیتە خوار، وە لە بیری نایەتە دەر وە لایان وابوو (شمس) (سەدو شێست و شەش) ئەوەندەی (أرض) گەورەیە، وە شـتی زیـاد؛ (لكن) ئێستا لەگەڵ ئەمە كە (كشف)ی (أمریكـا) كـراوە، (نـسبەت) زۆر كەمـە؛ (حتّی) (أرض) خـۆی نـانوینێ؛ (شمـس) (ملیـون)ێك و (٢٥٠)هـەزار ئەوەنـدی عەردی گەورەیە﴿وَوَجَدَ عِنْدَهَا﴾ نێزیك (عَین)ەكە ﴿قَوْمًا﴾ (وَهَبْ) ئەڵێ: پێیان ئەگوترا (ناسِك). (آلوسي) لە (أبو زَیْدي سُهَیلي) نَقل ئـەكا: قَـوْمـێ بـووین لـە نَسْیلي (ثَمُود) لە شاری (جابَرصا) ساكِن بوون، شارێ عَظیمە دوازدە دەركـەی هەیە، یَعني ئي شوورە، بـە سـریاني پێـی ئـەڵێ (جَرْجیسا). أمّـا (إبنُ جَریح) ئەڵێ: دوازدە هەزار بابْ. نـازانم ئـەو قـسانەیان لـە كـوێ هێنایـە؟ وە چ پـەكی تَفسیر لەسەر ئەو درۆیانە نەكەوتیە!! ﴿قُلْنَا یَاذَا الْقَرْنَیْنِ﴾ بەهەر نَوْعێ، إلْقاي قَلْبی كردەوە! ﴿إِمَّا أَنْ تُعَذِّبَ﴾ نازانم بـۆ ئـەڵێن لـە أوَّلـەوە بـە قَتـل بـووە؟! ﴿وَإِمَّـا أَنْ تَتَّخِـذَ فِـیهِمْ حُـسْنًا﴾ رێـی جـوان بدۆزیـەوە، بـۆ هـدایـەتیان و، بـە أصولێ حَكیمانە. ئەگەر ئەزاني بە تَعذیب دێنە راي، وەك كوردان عَذابیان دە! ئەگەر أمَلت هەیە شتێ تێ بگەن بـە گـوێرەي خۆیـان، رێـێ بـاش واضِـحْ بكـە، تێیان بگەێنە! كامیان ئەكـەی لـە أوَّلـەوە عائـدی نَظَر و رأْي صـائِبی خۆتـە! ﴿قَالَ﴾ بە قَوْمەكە! ﴿أَمَّـا مَـنْ ظَلَـمَ﴾ بَعْدَ الـدَّعْوةَ والأرْشـاد، خـۆی لـە خـەڵك ﴿فَسَوْفَ نُعَذِّبُـهُ﴾ بـەگوێری گونـاه و ظُلْمـي ﴿ثُـمَّ یُـرَدُّ إِلَـی رَبِّـهِ﴾ لـە آخـرەت. ﴿فَیُعَذِّبُهُ عَذَابًا نُكْرًا﴾ گران و ناخۆش و هَوْلناك. ﴿وَأَمَّا مَنْ آمَنَ﴾ بالله الْواحِدْ. ﴿وَعَمِلَ صَالِحًا﴾ حَقیقَةً عَملي صالح لە ثَمرەي إیمانە، چ رَسول چ مَلَكي صالِحْ، دەعوەتیان بكا بۆ إیمان، وە إیمان بێنن، وە كردەوەیان چـاكەبێ ﴿فَلَـهُ جَـزَاءً الْحُسْنَی﴾ لە دونیاو لـە آخـرەت. ﴿وَسَـنَقُولُ لَـهُ﴾ بـۆ ئـەوي مـؤْمنْ بـي. ﴿مِـنْ أَمْرِنَا﴾ لە طَرَف خۆمانەوە، بۆ إعانە و مُعاضَـدە، لـە شـكر مُحـارَبـە. ﴿یُـسْرًا﴾

شتی سەهلیان پیێ ئەڵێین، ئەوەی لە طاقەتیان دابیێ بە خۆشیێ پێیان بکریێ. ﴿ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا﴾ ڕێی شرقي مَملکەتی خۆی گرت ﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ الشَّمْسِ﴾ مُنْتَهاي مَعموره له طَرَف شرقیان.ئەگەر ع قَومي مُحاريي لە پێش نەبوویێ، زوو گەیشتیتێ، وەإلاّ زەمانێکی ئەویێ! ! ئەگەر أقصی ي شرقي أرضي مُغَیَّابیێ، بەڕێش دا بڕوا، زۆری پیێ ئەچیێ، وَلَوْ أسبابي هەبوو بیێ، أمّا وەکی أسْبابي ئێستای نەبووە! ! بە قِطار و سَیّارة طَیّارە سَفَر نەکرایە! ! ئەگەر سَبَبْ وەکی (إبنُ جَرير) ئەڵیێ: هەر یەکە تەختە لَوْحەکي هەلگرتیە، کە تووشی بَحر بووین، لێکیان دابن، پێی پەڕیونەتەوە، دوایێ لە باڵێ یەکیان دەهێناین، بیێ زەحمەت و مَشَقَّة، هەڵیان گرتینە! ! ئەگەر وا بوو بیێ، سَبَبي پیێ ناگوتریێ، ئەمە سَبَبي عادیش نیە! ! آخر بەو قسە سووکەلانەبوو مُسُلمان هەڵخەڵەتان تەمایان بوو لەسەر تەختە داران، بَحْري مُحیط بگرن! ﴿وَجَدَهَا﴾ حَسْبَ الْحسْ.﴿تَطْلُعُ عَلَى قَوْمٍ﴾ بنا لە قَولي (وَهَبی) پیێ یان ئەڵێن (مَنْسَكْ).﴿لَمْ نَجْعَلْ لَهُمْ﴾ بۆ وان. ﴿مِنْ دُونِهَا﴾ ڕۆژ. ﴿سِتْرًا﴾ بن لِباس چیاو دارو بار، وەك دەشتي هەولێري لە عاردي هەڵدیێ ڕۆژ لە عاردي ئاوا ئەبیێ، ئەو جیێ یە بەلای (أرمنستان) ناچیێ، بە چۆل و بیابانی (أفريقا)ی پتر ئەچیێ! ﴿كَذَلِكَ﴾ وایە بیێ شك. ﴿وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ﴾ لە لەشکرو أسْباب. دیارە زۆر بووە کە جَنابي عَلاّمُ الغيُوب بلێ إحاطەمان پیێ داوە. ﴿خُبْرًا﴾ بە عِلْم چەندو چووني لاي ئێمە بزر نەبوو. ﴿ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا﴾ ڕیێ تر، بۆ کام طَرَفْ؟ خوا ئەیزانیێ! ڕۆیی ﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ﴾ لە کام طَرَفیە؟ کهیە چیایە؟ مَعلوممان نیە! مَوقِعي وەك دەربەند بووە! ﴿وَجَدَ مِنْ دُونِهِمَا﴾ کەمیێ وادەی سَدَّەي.﴿قَوْمًا﴾ هاويل بووین، یا ناویل؟ لە (وَهَب)ی بپرسە! ﴿لَا يَكَادُونَ﴾ نێزیك نەبوون ﴿يَفْقَهُونَ قَوْلًا﴾ لەبەر زوبان نەزانی، نەك لەبەر بیێ فَهْمي! تەماشای حکایاتان کە لەو سەري دونیا دەچن بۆ ئەم سەري دونیا، لەگەڵ ئەو هەموو أقوامە گفتوگۆ ئەکەن، أنَهُ لە هەموو زوبانێك ئەزانن. ﴿قَالُوا يَا ذَا

﴿الْقَرْنَيْنِ﴾ بەهەر(نَوع)ێ بوو تێ یان گەیاند؛ ووتیان: "﴿إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ﴾ (قوم)ێ بێ (حشر) و (نشر)، هەرچی و پەرچی و بێ (مدنیەت) و (آداب) و (إنتظام)؛(غیر) (معلوم الأصیل) ئەوەندەن، (بنی آدەم)ن و بەس؛ (كلمە) (عجمی) ، یا (عربی)یە؟ (عَلي كَيْفِهِم)! ﴿مُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ﴾ ئەوە (جوان)؟ وەكی (فقی خەڵیان) مەڕو بزن دەدزن، وەكی كوردان، خەرمان قرپ ئەكەن؟! ﴿فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا﴾ (ماڵ)ێ (خرج) كرێ ﴿عَلَى أَنْ تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا﴾ بەكوردیش ئەڵێن: (سَدْ) ، وەرگیرایە، (مُتداول)ە؛ بۆخانی و (أراضی) ئەڵێن: (ناوان) ﴿قَالَ﴾ (ذو القرنين) ﴿مَا﴾ ئەوی ﴿مَكَّنِّي فِيهِ﴾ لەوی ﴿رَبِّي﴾ خوای من و (قوم) ﴿خَيْرٌ﴾ لەوی ئەیدەن ﴿فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ﴾ (معاونەت)ی (ماڵ)م: پێ ناوێ؛ بە (قوّە)ی (مادّی) و (بدنی) (إعانە)م بدەن ﴿أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا﴾ (سدّ)ێ (متین) دوو ڕیزە ﴿آتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ﴾ تەختە تەختە، پارچە پارچەی آسن، هێنایان، هاویشتیانە سەریەك، بە (نظم) و (ترتیب) ﴿حَتَّى إِذَا سَاوَى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ﴾ (مُساوی) كرد، (بَین)ی هەردوو لا چیای پڕ كرد، ڕێكی خست (لازم) نیە بەپانی، بەڵكو بڵندی (مُراد)ە؛ بە (قدر) چیایەكانی بڵند كردو (محكم) دای مەزراند ﴿قَالَ﴾ بە (عُمّال) آنی (أمر)دا ﴿انفُخُوا﴾ ئەبێ (آلەت) و (أدوات)ی گەلێ پێ بوو بێ؛ كە فوویاندەن ﴿حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ نَارًا﴾ ئاسنەكەی فوو تێ كراوی، وەك ئاگر سوور كردەوە، (أنّهُ) بووە پشكۆ ئاگر ﴿قَالَ آتُونِي﴾ (نُحاس) م بۆ بێنن، بیتاوێننەوە یا (من) ﴿أُفْرِغْ عَلَيْهِ﴾ هەڵی ڕژێنمە سەر ﴿قِطْرًا﴾ (مز)یا پاقڵی تاواوە، ئەوە زۆری ئەوێ؛ ئەوجا بووە یەك پارچەی (معدەن) ﴿فَمَا اسْتَطَاعُوا﴾ نەیانتوانی ﴿أَنْ يَظْهَرُوهُ﴾ بەسەری كەون﴿وما اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا﴾ كونی كەن؛ (مُمكن)یان نەبوو، لەو دیومانەوە؛ دیارە (قوم)ی زۆر گورج و گۆل نەبووین، ڕێ بكەنەوە، بە چیادا ئاوابن؛ من وام (خیاڵ) كرد. دوایێ (ڕوایەت)ێكم دیت؛ پینەی ئەكات. ئەگەر حەزت لە (حكایەت)ە، تەماشای (تفسیر)ی (إبن جریر)ی كە (ڕوایەت)

لە (وَهبی بن مُنبِّه یمانی)؛ من ناتوانم ئەو (خرافات)ە (نقل)کەم، (وَلَوْ) بۆ (رَدْ) کردنی بی ﴿قَالَ هَذَا﴾ ئەو (سدّ) و بەندی ئەو دەریەندە، بۆ (حِفظ)ی (إنسان) آن، ئەوانی (مَدنی) ﴿رَحْمَةٌ مِنْ رَبِّي﴾ یا (أثر)ی (ڕەحمەت)ی خوایە، لە (حقّ)ي من، کە ئەو (خدمەت)ەی بەو بەندەیە کرد﴿فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي﴾ بە (هَدم)ی هەرچەند لە ئاسن و پاقڵ داڕژرایە، (قوەت)ی ئەچی (آخر)ی ئەڕمێ یا ئەو (وَعد)ە (وعد)ی (إنتشار)ی (مدنیّەت)ە، (إحتیاج)ی بەو (نوع)ە (سدّ)ە نامینێ ﴿جَعَلَهُ دَكَّاءَ﴾ پارچە پارچە (موقع)ەکەی ئەبێتە (أرض) (مُستوی). ئەو (سدّ)ە لە مێژە نەمایە، (کائنات)یان پشکنی لە ژێر (قطب)ی (شمالی) و (جنوبی) (بشر) (مخابرە)یان لەگەڵ یەك کرد؛ نە ئەو (سدّ) مایە، نە ئەو (یأجوج) و (مأجوج)ی (نُقّال) آن ئەڵێن"هەن" یا نەماون یا (إصلاح) بووین، لە (وحشەت)هاتینە (مدنیّەت) (ذاتاً) (تواریخ)ی (مظبوط) (دائِر) بە (أحوال)ی (أُمَم)ی (سالِفە) نیە؛ (قرآن) (کتب)ی (ذکر)ە؛ (حکایەت) و چیرۆکە نیە؛ گەرچی (نَقّال)آن لە (معنی) دا ئەی کەنە (شانامە)ی (ئەسکەندەری) (أمّا) وانیە (أسکندر)هات و چوو، (دنیا)یە زۆری (إستیلا) کرد (أمّا) بۆی (تنظیم) نەکرا، پارچە پارچە بوو، بێ (ثمرە) ڕۆیی؛ (یۆنان)ی (ڕۆم) (دیناً) و (دُنیاً)کەوتنە (ذلِّەت). ئەوەی لە (نظر)قورآن پەسند بی، ئەوەندە خزمەتەیە، کە بۆ (إصلاح) و (حفظ)ی (بشر) کردی. ئەی (قریش) و (أمثال)ي (قرەیش) گوێتان لێ بێ﴿وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي﴾ هەر چی بی ﴿حَقًّا﴾ دێتە جێ. (جلال نوری) (کتێب)ێکی هەیە، ناوی نایە (بە خاتم الأنبیاء) (رجال)ی (مشهور)و زۆر گەورەی (صاحب)ی (دین)یا (صاحب)ی (مُلك) و (سلطنەت) لەگەڵ (حضرەت)ی (رسالەت پەناه)، لێکی دایتەوە؛ تەماشای (أحوال)ی کردینە بە (برهان) و (دلیل)ی (واضح) کە هەموو کەس تێ ی بگاو (تصدیق)ی بکا، (إثبات)ی کردیە کە (حضرەت)ی(محمد) (ﷺ) (فوق الکل)ە؛ لە (إستیلا) و دامەزراندنی (مُلك)یش نە (ئەسکەندەر) نە (ناپلیون) ناگەنە وی؛ لە (سرامد)

آني (دين) برا گچكەكي بۆ ئەدۆزيتەوە، ئەويش (حضرەت)ى (موسى)يە (حقاً) (كليم الله)ش شايانى (تجبيل)ە، بە (مليون) (إفتخار)ى پێ بكەن. (أمّا) (عيسى) و (بوذى) و (برهان)و (أمثال)يان ئەوانە نايەنە تەرازووى (رسالەت پەناە). (فى الحقيقة) لە (كتێب)كەى وا دەردەكەوت، (عقيدە)يە زۆر (خالِص)ى دەربارەى (حضرەت)ى (محمد)هەيە؛ (أمّا) نازانم ئێستا پاش (حرب) چۆنە؟ (قوميّەت) (تأثير)ي تى كرديە، يان نا؟ (خلاصە) (حضرەت)ى (محمد) (ﷺ) (نادِر)ى (دوران)ە، (رفيق)ى نيە، نەبووە، نابى! (قرآن)ى (عظيم الشأن) (إيجاز)ەكى واى هەيە، گەلێ كەس تياى بە (غلط) ئەچى. ئەز (جملە) لێرە بە (مناسبە)ى (قول)ى (ذوالقرنين) كە ئەلّێ: "(وعد)ى خواى من (حق)ە"، (نقل)ى (كلام) ئەكا، بۆ(قيامەت)كە (وەعد)ەيە (حق)ە، ئەفەرمووێ: ﴿وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ﴾ ئى (بَشر) ﴿يَوْمَئِذٍ﴾ ئەوێ ڕۆژێ، ڕۆژى (قيامەت) ﴿يَمُوجُ فِي بَعْضٍ﴾ (بعض)ي لەناو (بعض)ي شەپۆلێ ئەدا، (عالَم) بەسەريەكدا دێ، وەك (بحر) ئەكەونە (حركە) و (إظطراب)، ئەوان لەبەر ئەو (إيجاز)ە، ئەو ڕۆژە لەگەلێ (هَدم)ى (سَدّ) كە لێك نيزيك ئەكەن.

(روايات)ى (عجايب، عجايب) دەربارەى (يأجوج) و (مأجوج)آن (نقل) ئەكەن؛ ئەبايە (سيِّد)ى (آلوسي) (تنبيهە)كى كردبا، (أمّا) لە (يأجوج) آن ترسايە، (وەقت)ە كەشى وابووە؛ وە (إلاّ) ئەويش ئاگادارى (احوال)ى (أرض)ي بووە. (واقعاً) ئەوەندەى ئێستا (معلومات)ى نەبووە، (قاعدە)يە (أصولى)هەيە ئەوەى درۆى (تبيِّن)ى كرد، ديارە (حديث)ى (رسول الله)ي نيە. ئەگەر بتوانين (تأويل)ى بۆ (نُقّال)ەكان بكەن (إلاّ) (إتّهام)ى (رسول) ناكرێ؛ (رحمەت) لە (فخرى رازى) بى لە جێ يە ئەلّێ: "(إتهام)ى (عُدول) ئەكرێ، (أمّا) (إتّهام)ى (معصوم) ناكرێ" (ماشاءالله) لە (حضرەت)ي (عيسى) لە (كَرّ)ى (ثانيە) چ (ذى قدرەت)يكى لێ پەيا ئەبێ؛ نە (دجّال) ديَلّێ نە (يأجوج) و (مأجوج)هەمووى ئەفەوتێنێ. ئەو (قوم)ى وا زۆرو (عظيم) بە (لفظ)

ئەفەوتیٚ؟ یا بە گەرمی یە کە لە لووتی حوشترو (غنم) پەیا ئەبی! دیارە شەڕیان بە تیرو کەوانە، (مسلمان) آن (٧) سالاٚن بە تیرو کەوان و مەتالیٚ وان ئاگر ئەکەنەوە؛ هەیهوو تیری چی؟ کەوانی چی؟ مەتالیٚ چی؟ قوڕ بەسەر (مسلمان) آن تا (عیسی) لە ئاسمان دێتە خوارو (مهدی) لەبیر دێتەوە دەر، پیستمان دەچێتە دەباخانان! (حاصل)ی بە قسەی پڕو پووچ (عقل)و (علم) و (سعی) و (صنایع) و (متانەت) و (عزم) و (إرادە) و (قدرەت) و (قوەت)یان لیٚ (سلب) کردن بیٚ دەسەلاٚت مانەوە. (حکما)ی (غرب) کە دیتیان (إعتقادات)یان (مانع)ی (ترقّی)یە، بوونە (خصم)ی (دین)؛ هەر چەند لە (أوّل)وە (رؤسا)ی (دین) گەلێکیان فەوتاندن؛ (أمّا) (صبر) و (ثبات)یان کرد، (آخر) (غالب) بوون، بە (إختراعات) سەرکەوتن، وە وایان (نشر) کرد کە (دین) (مانع)ی (ترقّی) (علم)ە؛ (جُهلا)یەکانی ئێمەش لەو (إعتقاد)ە دان، (مُخاصمە) لەگەلیٚ (ملا)یان ئەکەن؛ (مع أنّە)ملای ئێمە (مانع)یان نەبووین لە (علوم) و (معارف)؛ (غایەت)ی (تشیّع) و (تصوّف) تێکیان دا. (ملا)ی (بسیط)یش زۆر بوون، بیٚ (تفکّر) بە قسان هەلٚخەلٚەتان وە (ضعفا)یان هەلٚخەلٚەتاند! ئێمەش تووشی (زِلّەت)ی ئەمڕۆ بووین. (مع الأسف) (سواد)ی (أعظم)، (نصیحەت)و قسەی چاکو ڕاستی ناچێتە گویٚ؛ دەماغیان بو درۆو دەلەسە وەرگرتن، بوویتە قەوانی (غەرامەفۆن) ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ﴾ وەك (حَجم بۆ ڕیەسی عسکر) ﴿فَجَمَعْنَاهُمْ﴾ (إنسان) ﴿جَمْعًا﴾ گردبوونەوەیە (عجیب) ﴿وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ﴾ ئەویٚ ڕۆژی ﴿لِّلْكَافِرِينَ﴾ بەویٚ ڕۆژی، بۆمان نواندن (إظهار) مان کرد ﴿عَرْضًا﴾ (عرض)یٚ (هائل) ﴿الَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ﴾ چاویان ﴿فِي غِطَاءٍ﴾ (حجاب)یٚ (کثیف)، (غلیظ) ﴿عَنْ ذِكْرِي﴾ لە (آیات)ی (مُذکّرة) ﴿وَكَانُوا لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا﴾ نەیان ئەتوانی بیبەن ئەوەندەیان پیٚ ناخوش بوو، گویٚ یان لە (آیات)ی قورآني بیٚ (وکذا) (أمم)ی تر، بۆ (کتیب)ی خۆیان؛ گوێدێریان لیٚ ببووە، گرانباری، (تحمل)یان نەدەکرد ﴿أَفَحَسِبَ الَّذِينَ كَفَرُوا؟﴾ وایان

(ظن) بردیه، ئەوانەی (إنكار)ی (وحدانیەت)ی خوایان کردیه ﴿أَنْ يَتَّخِذُوا﴾ نازانم له (إتّخاذ) کوو (تعبیر) دەمەوه؟ ﴿عِبَادِي﴾ بەندەکانی و ژێر دەستانی من ﴿مِنْ دُونِي﴾ (مُتجاوِز) له خوا، ئەوانه بگرن﴿أَوْلِيَاءَ﴾ به (معبود) و (أنصار) ئاگاداریان بن، له دەست خوا (نجات)یان دەن؛ ئەوه زۆر (عجایب)ه (عبادەت)ی خوا ناکەن،(عبادەت)ی (عبید)ی خوا ئەکەن! (في الحقیقه) (میل)ی (خالص) بۆ خوا پەرستنی، زۆر (نادِر)ه؛ خوایه خۆت ئەزانی له (نظر)ی گەلێ (مُسلّمان)ان، (أولیا)یەکانیان له (آله)ی (مشرکان) (فەرق) ناکرێن، بەس (تعبیر) جوایەزه. بەڵکوو (بعض)ی (نوع)ه (إعتقاد)ێکیان له (حق) (أولیا)یان هەیه؛ دەربارەی خوا نیه! ئەوانی ئێمه به ناوی (أولیاء الله) (سبقیەت)یان کرد له (أحبّاء الله) و (أبناء الله). وه هەر چەند (حق) (توضیح)ی ئەکا، ئەو (أولیا)یانه چیان نەکردیه، بۆ (إسلامیەت) بەکار بێ (أکثر)ی (أوهام)و (خیالات) و مەتەڵه. (سواد)ی (أعظم) لەو (میل) (فاسده) ڕۆئەچن، دەست لەو (عقائد)ه (زائغ)ه هەڵناگرن. وه ئەوه به (عَین)ی (إعتقاد)ی (حق) ئەزانن، بۆیه چاره ناکرێ؛ (باطل) که به (صورەت)ی (حق) (جَلا)یه درایه، (جلا)یەکه بشچێتەوه، هەر به (حق)ی ئەزانن! ئەو (کافران)ه ئەوانەن که له (آیەت)ی (آتی) دەرئەکەوێ، (أخسر)ن ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ﴾ ئەوانه. ﴿نُزُلاً﴾ نُزُل ئەو شتەیه دەم و دەست حاضرو ئامادەکراوه بۆ میوان دابەزێ، بۆی بێنن. أولیایه کانیان لەو نُزُله مَحْرومیان ناکەن. ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ﴾ اِذنه خَبَرْتان دەمێ ﴿بِالأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً﴾ له جهەت کردارو کردەوەی هیچ و پووچ و بێ ثَمَره و عائدو فائدْ. ﴿الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ باطِل و بێ فائده بووه، عیانه لایان ئاشکرایه، ئەو کارەي لەسەرن، ئەو إعْتِقادەي هەیانه، بێ کەڵکه! چەند شەڕو شۆڕمان کرد به ئومێدي فلان و فلاني به هیمەت، پێ یان ئەگوتین: غەمتان نەبێ شێخ نایەڵێ، مَلائکه تمان بۆ دێن، مُقابلي ئالات و ئەدەواتی حاضِره. مَدَدَ یا (شێخی سنووسي)یا (شێخی

شێخ موسي)، فائـدەی نـەبوو، شـكاين! موسـولْمان خانـە خوشـتوربوون وەك جوولەكان! بێ هوودەیە، خودا لێمان توورەیە! نا، أولیایەكان لێمـان عـاجزن، با مَوْلودیـان بـۆ بكـەين! دفعـەیێ تـر دێـن! بـاز هگـذا! ﴿وَهُـمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُـمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا﴾ بۆمباردومان كـراين، شـێخ و مـەلاو صـەگ وێكـرا هـەر ڕايـان ئەكرد بۆ كونێ خۆی تێپەستن! بە موسولْمانانم ئەگوت: ئـەوجا بـزانن، بۆفـە! لە قیامەت ئاوا پێش ئێوە، ئەگەر ڕێ بێ، هـەر ڕائەكەن! پیـاوی چـاك بـن!! خێرەو مەندەكان كَما كانَ خراپتر بوون. شِرك بووە تَوْحيد، كُفر كرا بـە إيمـان، چارەي چۆن ئەكەي؟ مەلای باشیش أنانین! بَعضيێ هەن، برسين، بـێ أصْـل و فَصْلن، چيان پێ ناكرێ! مَـعَ الأسَـف مليـۆنێ مَـعَ الأسَـف، ديـن بـێ صـاحێب ماوە!! ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ لازم نيە بە صَريحي بلّێ إيمانم پێی نيە. أمّـا بـە گوێرەی عَمَلي، ديارە إيماني ڕاستي پێ نيە! ﴿بِآيَاتِ رَبِّهِمْ﴾ لە بَعْضيێ رَسـائلي خۆم نوسيومە، ئێمە إيمانمان بە قووەي طَبيعي نيە، يـاخود تَـصديقي تَـأْثيري قووەت بە كُفر ئەزانين، بۆیە بە ئـالاتی طَبيعـي كـە لـە حَقيقـەتـدا آثـاري آيـاتی إلاهيە، زەبوون بووين ژێر كەوتين. خوا ئەڵێ: قووەت ئامادەكەن، ئاگـادار بـن، لە ئەسلّەحەتان غافل مـەبن. لايغـني الحـذَرُ مِـنَ القَـدَرِ بـرام مـن قـووەت مُقابِـلْ خوای حاضِر ناكەم، مُقَابِلي دوشمني خوايـە —(تُرْهِبُـونَ عَـدُوَّ الله وَعَـدُوَّكُمْ) —!! بەڵێ قووەت تيرە ئيشی باب و باپيرە! ئەيهوو تيری چی!! بنۆڕە ئـالاتی حاضِرە، دەها أجانِبْ، سَعي لە أكمَلّيەتی ئەكـەن! نـا، چ نيـە، أسْـبابي عاديّـە تَأْثيريان نيە! مەلا ئەوە دونیای بە غاز خنكـا، شـارێ بـە بۆمبـای وێـران كـرا، دێ بە لوغمێ ئاگرين ژێر بەرو ژوور كرا!! نا چ نيـە ئەفەنـدی! چـۆن چ نيـە؟ برۆ ماڵ خراپ خۆت كافر دەكەی، إمامي أَهْـلي سُـنَّه (أَشْـعَري) و (ماتُريـدی) وا ئەڵێن! برام وانيـە خـوا أسبابي دانايـە! نـەخێر أسْـباب نيـە، هـەموي عادِيـە، سَبَبيَّة و مُسَبَّبِيَّة، عِلّية و مَعْلولِيَّة نيە!

نهايە موسولّمان بێ چارە ژێر كەوت. بڕوا مەكە بەو حالّە ڕاست بێتەوە! ئەوانە كافرن بە ئاياتي ﴿وَلِقَائِهِ﴾ ئي خواي! إيمانيان هەيە بە ڕۆژی جَزا، أمَّا مَثَلا حَضرەتي سەرۆك بۆيە إيماني پێ هەيە خۆی شَفاعَە ئەكا بۆ أتباعي، ئەو ڕۆژە پايە بلّندە، ئەو زاتە، عالي قەدرە! معلوم ئەبێ، إيماني بە قيامەت، ئەو هابێ! حَتَّا پێغەمبەری مَنع ئەكا لە تكا، بۆ أتباعي خۆی! يا خود خۆی بێ دەسەلاّت ئەكات لە نَظَر أتباعي خۆی، خۆ ئەوەش ناكات! وە الاّ نـاني ئـەبڕێ فەرشی تەكيە نامێنێ! بەلّێ گەنم و لباد، بۆ تەكيەی عِزّالدين، ئاوا ئەبێ! إيماني هەيە بە أحْوالي ڕۆژی جَزا، أمّا بۆ ئەوەيەتی لە خزمەت شێخ بە كەيف و صَفا مَشْغول بێ! بۆ ئەوەی نيە مُنْكِري سَيِّئات بێ! ديارە ئەو جۆرە إيمانە، بە إيماني ڕاستی حِساب نيە. إيماني حەق بە ڕۆژی جَزا، مَنْعي إنسان ئەكا بە سَيِّئات نايەلّێ بە هيچ خۆی فريتە بكا. ﴿فَحَبِطَتْ أعْمَالُهُمْ﴾ باطل و ضايع بوو، بۆف و پووچ، بێ قيمەت و بێ ثَمَرەیَ نافِعْ بوو. ﴿فَلاَ نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا﴾ أهميەتيان نادەينێ، إعْتِباريان پێ ناكەين، مُحَقَّر و مُهان و ڕەزيلن لای خوا. ئەوەی خوا ئەفەرموێ لە وَصْفي أخْسَرينان، كافيە! بنۆڕە ڕەوشتی أنام، ئەزانی كێن! وە ئەزانی كە خاص نيە بە قەومێ بە شَخْصي! وە (إبنُ جَرير)يش شتی هكذايي إختيار ئەكا - ڕەحمەتی لێ بێ-. ﴿ذَلِكَ جَزَاؤُهُمْ جَهَنَّمُ﴾ مُنافي لەگەلّ (نُزُل) نيە! طَبيعي عذابي جَهَنَّم دەرەجاتە، بە شِدَّەتە تَفاوتي، - مَعَ أنَّهُ (نُزُل) بِهْ (مَنْزِل) تفسير كراوەتەوە- ﴿بِمَا كَفَرُوا﴾ بە سَبَب. ئەوەش عاديە؟ ﴿وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَرُسُلِي هُزُوًا﴾ قەشمەری و گەمە ئەكەن بە آيات و كَلِمات و قَوْلي. ئەمە چيە مُكَرَّرَە ئێمەش دەتوانين شتێ وا بلّێين وە أساطيرە ئەو شَخْصە وەكي مە إنسانە، ئەخوا، ئەخواتەوە، ئەنوێ، چۆن ئەبێ بە رَسولي خوا؟! ﴿إنَّ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ إيماني دروست. ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ بگونجێ بە گوێرەی إيجاب و وەقت و ظروف. ديارە ئەوانە تَعْظيمي ايات و رُسُلي خوا ئەكەن! ﴿كَانَتْ لَهُمْ﴾ قَبْلَ الدّخول لەو ڕووەوە

﴿جَنَّـاتُ الْفِـرْدَوْسِ﴾ (فِـرْدَوس) عەرەبیـە، یـا غَیْـره عەرەبیـە؟ یـەکێ ئـەڵێ (رۆمیـە)، دیگـەر ئـەڵێ (نَبطـي)یـە، أصْـلي (فەردئاسـا)یـە (كَعْـب) ئـەڵێ (سرياني)يە، (عَكْرَمه) میگۆید (حَبَشي)يە بُستانه باغي ميوانه! بِنا لە قـامُوس مأخوذه له (فَرْدَوسَ) به مَعْنا (سعة)، به مَعْنا (وادي) ش باشه!

—وايان لێ كرديه، تا نەيچينێ، نازانين چيه!!!

﴿نُـزُلاً﴾ بەهـەردوو مَعْنـاي سـابقه ﴿خَالِـدِينَ فِيهَـا﴾ لـه جَنّـاتُ الفِـردَوس. ﴿لاَيَبْغُونَ عَنْهَا﴾ له جَنات. ﴿حِوَلاً﴾ تَحَوّلْ، لەوێ بـچن، بـۆ جێـێ تـر. چ جێـێ نيه مُعادِلي بێ، چ جایێ خۆشتر! ﴿قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ﴾ جِنسي، يَعْني عَهد نيـه! ئەوی مَوجوده ﴿مِدَادًا لِكَلِمَاتِ﴾ وه أياتي ﴿رَبِّي﴾ بۆ نووسيني، مەرکـەب بـێ! ﴿لَنَفِدَ الْبَحْرُ﴾ ئي مَوْجود ﴿قَبْلَ أَنْ تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي﴾ فەرمايشاتی هی مُمْكِنه، لا يَنْقَطِعْ بێ! مَعلوماتي هيچ، غَيْرَ مُتَناهيه! ﴿وَلَـوْ جِئْنَـا بِمِثْلِـهِ﴾ بَحْـري دونيـا ﴿مَـدَدًا﴾ چـەندە هەنـدی دیش بـێ، لـه بَحْـري مَوجـودەي مَفـروض، ئـەبڕێ! كَلِماتي خوای نابڕێ! قەشمەری بـه چـی ئەکـەن؟ تَكَـرُّري بَعْـضێ مَعْنـاي وەك خۆی ئەفەرموێ ئەمه تَصْريفاتـه، بـۆ خـاطِري تێگەیانـدنی ئێوەیـە! مَسأَلـەي چەند فَوائدي تيايه، به جُمَلْ إخْطارتـان ئەکاتـەوه، وه إلاّ خـوا يـەکی ناکـەوي لەسەر تَكْرار! بۆ سَبَبي نُزُولي دوو رِوایەت ئەکـەن، کـەيفم پێيـان نـايێ! ﴿قُـلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ﴾ إدّعاي چيم كرديه موجبی سُخْرِيّه و هُزُو بێ؟ خۆم مُعْتَـرِفم بَـشَرێکـم وەکـي ئێـوه، لـه ماهِيّـەتـی بَـشَري فـەرقمان نيـه! فـەرقمان ئەوەندەيه﴿يُوحَى إِلَيَّ﴾ كَلامي خوام بۆ دێ، ئەکەوێته دڵـم. ﴿أَنَّمَـا إِلَهُكُمْ إِلَـهٌ وَاحِدٌ﴾ وِجداني پاكم هەيه، به حبی أصْنام أغْشَته نەبووه! به تَقالیدو عَنْعَناتي قَوْم، غَيره مَأْلوفه! له غَفْلان و لَهو لَعب، خالّيـه! بـه کَمـالي إجْلال ئەتۆڕمـه اياتی كائنات! له طَرَفْ كِبْريائي (وَحي)م بۆ دێ، وه منيش فەرمايـشي و يتـان تَبْليـغ ئەکـەم! ﴿فَمَـنْ كَـانَ يَرْجُـوا لِقَـاءَ رَبِّـهِ﴾ ئومێـدی هەيـه نـائِلي لطْـف و مَرْحَمـەتـی إلاهـي بـێ. ﴿فَلْيَعْمَـلْ عَمَـلاً صَـالِحًا﴾ رووحـی نَجـاة و سَـعادەتـي

دارین،عَمَلي صالِحه.﴿وَلاَ يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ﴾ خوای حَقیقي خۆي ﴿أَحَدًا﴾ نه شِرْكي جَلي، نه شِركي خَفي! أمّا مَعونەي عِبادەت له شِرك نیه، گەر چی تا مُمكِن بێ خۆت بۆ خۆت به جێی بێنی. دڵی پڕ له إیمان و إخْلاص و عَمَلي صالِحْ، مَداري خلاص إخْتِصاصه. جەنابی حەق مُوَفَّقمان بكا له شائبەی شِرك به دوور بین– اللّهُمَّ أرِنا الحَقَّ حَقّاً وَارْزُقْنا إتّباعَه، وَأرِنا الباطِلَ باطِلاً وَارْزُقْنا إجْتِنابَهُ– وەك أمویان نەبین![1]

---

[1]- تەواو بوو تَفسیري سورەي (كَهف) ڕۆژي یەك شەمو بَعْدَ العصر ٢٣ صَفَرُ الخیر مُطابقي ١١ نیساني ڕۆمي سنەي ١٣٥٧ هجري له شاری(كۆیه) وەك (إمام) دەفەرموێ: ڕۆژي سێ شەمو حەڤدەي ماهی صَفَر تَأریخي ٦٠٢ ﻫ له شاری (غَزْنَین).

ئایا نەبێ تَفسیري ئەو سورەتەي له ظَرفی ساڵێكدا كردبێ؟ چ عَرض كەم! ئومێد ئەكەم خوا كَرَمْ كا تفسیري (قرآن) تەواو كەین.

## سورەتی (مريم)

سورەی (مریەم) (مكيّـە). (زُمخشری) ئەفـەرمووی: "(إلاّ) (آیـەت)ی (٥٧)م وە (٧١) (مَـدنی)یـە، (عـدد)ی (ایـات)ی (٩٨)ە لـە پـاش (سـورە)ی (فـاطِر) (نـزول)ی کردیـە" (أمّـا) (سـبب)ی (إیـراد)ی لـەو (مقـام)ە نافـەرمووی؛ باسـی (مناسـبە)ش ناکـا. (أمّـا) (مناسـبە)ی زۆر (ظـاهر)ە، (مقـصد) (تقـدیس)ی (کبریائی)یە لە (ولد)، وە (دفع)ی (مشکلە)ی (تولد)ی (عیسی)یە وە (فرقە)یـە (عظیم) لە (بشر) بەڕاستی ئەی پەرستن، وە (إتخاذ)یان کردیە بە (رُبّ) و (إلە) لەبەر (شبهە)یە (غایەت) دوورو بیّ (مناسبە).

﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾

﴿كهيعص﴾ گوێتان لیّ بیّ، بە (إهتمام)یّ زۆر (تلقی) (مافی السّورة) بکـەن. (إبن عباس) ئەفەرموی: " کاف، (إشارە)یە بۆ (کبیر)، لە (سعید) و (ضحاك)ی (روایەت) کراوە، (وکذا) لە (کلبـی)، (إشـارە)یـە بـۆ (کـاف)ی، وە لـە (سـعید) (نقل) کراوە، (کاف) لە (کریم) (أخذ) کرایە، (ها ) لە (هادی)، بە (روایـات) لـە (إبـن عبـاس). (ی) لـە (یَمـین)یـا (حکیم) (یـا مَـن بِخـیر) وە (ع) لـە (عـالم)یـا (عزیز)یا (عدل)؛ (ص) لە (صادق) وەرگـیراوە (روایـات)ە لـە (إبـن عبـاس) لـە (علی) (روایەت) کراوە. (یا کهیعص: إغفرلـی) کـە وابـی (إسـم)ێکـە لـە (أسمـا الله). (خلاصـە) (اقـوال)ی (عدیـد)ەن بـیّ (دلیـل)ن. (إمـام) ئەفـەرموی: "(تعیین)ی (إسم)ی بە (إشارە) (تحکم) و لە (دلالـەت)ی (لغوی) نیـە.لام وایـە بۆیە (بعض)یّ هەر (حـرف)ە، ئەکەنـە (إشـارە) بـۆ (إسـم)ی (أمّـا) (تعـیین)ی

ناکەن. (أمّا) (شێخی عربی) (مناسبە)یە جوان (ذکر) ئەکا؛ (خلاصە) ئەوەی (نِدا) ئەکاتە خوا (إستحقاق)ی (جواب)ی نیە، (إلاّ) بەزوبانی (حال) ئەپاڕێتەوە وە (ندا) ئەکا، بەناوی (مصدر)ی (مطلوب)ي خۆی، ئەڵێ: "کە نەخۆش ئەڵێ: (یاربّ)ی (یاالله) " (مقصود)ی یا (شافی)یە وە بەڵکو (تصریح)ی پی ئەکات، (فقیر) (یا مُغنی)، (مطلوب)ە. (حضرەت)ی (زکریا) لە (حال)ی پیری و (خوف)ی لە (موالی) (طلب)ی (ولد)ی کرد، کەوابی (کاف) (إشارە)ی بۆ(کافی) (مناسبە) لەگەڵ (حال)ی (شیخوخەت) و (وَهن)ی؛ (ه)ێ بۆ (هادی)، (مُقتضا)ي (غایەت)ي (باری)یە بە (إرادە)ی (مراد)ی (ی) ئەکاتە (إشارە) بۆ (واقی) (ولَوْ) (آخر)ی (کلمە)بێ، ئەمە (مقتضا)ی (خوف)ی یەتی لە (موالی)؛ (ع) بۆ (علم) (نظر) بە علم بە بوونی (سبب)؛ (ص) (صادق الوعد)؛ (ممكن)ە (ك) بۆ (كبیر) (ها ) بۆ (علامەت) و (برائەت)؛ (ی) (یحی).(ع) (عیسی) (ص) (صدیق) (صادق)، (صدیقة) (صراحەت)ی (قول)ی (عیسی) (علی كلّ حال) نەزانین (مراد)ی (حقیقی) (إعجاز)ی تیانیە وەکی (مدّعی)یانی (مزخرف الإیمان) ئەڵێن: "(مُعمّا)یە" ئەگەر (مفتاح) و (إشارە)یە نەبی، بە (یقین)ی نازاندرێ (ولَوْ) لە (طرف) (إنسان)ێ دا بندرێ.

لە (بغدا) بووم (ذات)ێ هاتە لام زۆر بێ (مبالات) آنە دەستی کرد بە قسەکردن؛ وتی: "ملا لە کوردستان نیە؛ کورد بی ملان، نە (شرع) نە (تفسیر) نە (حدیث) نازانین؛ بەس خۆیان خەریك ئەکەن بە (علوم)ی (یونان)ی (علوم)ی (عقلیە)ی هیچ و پووچ"ووتم: "ملا ئەوەی ئارەزوو کا، قورآن بەراستی بزانی، ئەبێ زۆر ئاگاداری ئەو (علوم)انە بێ، (حتی) (علوم)ی (عصریە) گەلێ (لازم)ە بۆ تێ گەیشتنی (قران) "ووتی" وانیە، ئەگەر ڕاست ئەکەی (معنی)ی (کهیعص) چی یە؟ "ووتم: " زور مەڵی من و توو (إیمان) مان هەیە، ئەوە لە (طرف) خوای بۆ (رسول)ی (اکرم) (نازل) بووە، وە مەلایان قسەیان لێ کردیە؛ (أمّا) (حال)ی (حاضر) لە (بغدا) (مندوب)ی (سامی)

(بريتانيا) ئەنووسى: أما (اى رس جى دى ٢) ئەمە بزانە (معنا)ى چيە؟ "مەلا كەمێ جورە جورێ كرد و دوايى هەلات! ﴿ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا﴾ ئەوە يادى رەحمەتي خواي تۆيە، بە عَبْدي خۆى (زَكَرِيَّا -عليه السلام- ابنُ بَرْكيا ابنْ عِدْوا) لە كتابى مُقَدَّسيان ئەڵێ: لە مانگى هەشتەمى ساڵى دووەمي (داريۆش) كَلامي خواي لەسەر نازل بووە. ﴿إِذْ نَادَى رَبَّهُ﴾ دوعاي كرد پاڕايەوە بانگى كرد. ﴿نِدَاءً خَفِيًّا﴾ صبرۆكە، بە سۆزگدازو خُضوع و خشوع و حُضور. دوعا بەو نَوْعە زۆر مؤَثرة، تَأثيري لە صاحيبى، عَلامەتي قبوڵە! ﴿قَالَ رَبِّ﴾ ئەى پەروەردگار! ﴿إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي﴾ ئێسكى من بێ قووەت و و هێز بووە،. كە ئێسك بێ قووەت و ضَعيف بوو، أجزاي تر بە طَريق الأولي يە! وَجْهي إفرادي (عَظيم) كە نافەرمووێ (عِظام)، (زَمَخْشَري) نوعێكى فەرمووە، (سَكاكي) تەرزێكى تر، لە كُتبى بَلاغە طوليان داوەتێ. ﴿وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْبًا﴾ سەرم هەڵ بوە لە جهەتي پيرى، ئاگرى پيرى تێ بەربووە، هەرگيرساوە ﴿وَلَمْ أَكُنْ بِدُعَائِكَ رَبِّ﴾ بە پاڕانەوە لەبەر توو ﴿شَقِيًّا﴾ نا ئومێدو خائِبْ نەبوويم، دوعام كردبێ قبوڵت كرديە. ﴿وَإِنِّي خِفْتُ الْمَوَالِيَ﴾ عَصَبە و خزمى پشتێ ﴿مِنْ وَرَائِي﴾ ئەمڕۆ ئەترسم كە لە دواى من تَركي مَسْلكي ئێمە بكەن. ﴿وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا﴾ نەزۆك بووە تا حال وَلَدي نەبووە. ﴿فَهَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا﴾ وَلَدي، انَهُ تَوَسُّطي وي تيانيە. حَقيقَةً مُقَدمەي دوعاي، زۆر رجالِبي عَواطفة. وفي الحقيقة قِصَّەى(زَكَرِيَّا)ش مُقَدَّمەيە بۆ تَهويني مادّەي وَلادەتي حَضرەتي (عيسي) ﴿يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوبَ﴾ مُتَبادر (إبن اسحاق إبن ابراهيم- عليهُم السلام) وارثي دين و دنيا، وارثي مالى و عُرفي و شرعي. باوڕ مەكە حَتّا اَهلي عِلم طَلَبي وارثي بكا لە خوا، مَقصودي وارثي ماڵ بێ، چ جاێ رَسُول؟! ئەگەر مَقْصَدي (شيعان) ميراتى حَضرەتي (فاطِمە)بێ، حاجەت ناكا بە نِزاعْ لەگەڵ ئێمە، شُكر ئەمڕۆ اَكثَري وولات ئى (آل و بيت)! بۆ فديەى سَيِّدي (يَحْي)، إدّعا لە مَلِكي (حجاز) كەن! ﴿وَاجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا﴾ مَرْضي و

راضي. ئايا دوعاي بە تەواوي قبولْ بووە؟ خلافيە! مَعَ أَنَّهُ زۆر نەچوو (أورشليم) ئاداری لەسەر پاداري نەما، بَني إسْرائيلي پەڕاگەندەی افاق بوون. حَقِيقَةً إنسان تەماشاي قُران و سِيَر بكا، واي دێتە بەر نَظَرکەم وايە دوعا بە تەواوي قُبول بوو بێ! بَعضە خَرافاتيان نِسبەت بە حضرەتي (عَلي) دايە، كە يفم پێ ناێ!. (يَرِثُني) بە فِعْلي مُضارِعٍ (وارِثُ) بە إسمي فاعِلْ، هاتووە! حَملي ئەكەن سەر تَجريدي بَلاغَتي، حَقِيقَةً هيچ لُطفي تيا نيە! ﴿يَازَكَرِيَّا﴾ لە طَرَفْ جەنابی حەق نِداي كرايێ. ﴿إِنَّا نُبَشِّرُكَ﴾ خەبەرێ مَسَرَّةْ أثَرْ، موژدە ﴿بِغُلَامٍ اسْمُهُ يَحْيَى﴾ لە لِساني قَوْمي پێیێ ئەلێن: (يوحَنَّا). ﴿لَمْ نَجْعَلْ لَهُ مِنْ قَبْلُ سَمِيًّا﴾ هەم ناو، ياخود بێ شَبيهە لە بەينی دوو، پيرێ عاقِري! يا لە لەو جِهەتە كە ئێمە ناوي لێ نێن، ناوي نازك و خۆش، كەم مُتَداوَلْ! زۆر لام مَحْبوب!! ناوي أولادي خۆم أكْثَرْ لە نَوادِرانن! ئي زۆر مَبْذول و مُسْتَعْمَلْ، غَيْري عَبدالله و محمد و چەند ناوێ تر، گەلێ بە قيمەت نيە! خۆزيا ئەوانەش كەمتر بوويان، نەبووبانە ناوی هەرچی و پەرچيان!! گەلێ ناو نَظَر بە أَصْلي مُسَماي، زۆر بە وَقْع و هَيْبَتە! ڕۆژێ تێ فكريم گەلێ كەس ناويان (عُمَر)ە، خۆيان بێ خێرو خوێڕێن، ووتم خۆزيا ئەو نَوْعە ناوە لەوانە نەنا ندرابا، بۆ مەرداني نامدار هەلگيرابان! خۆ كە بانگی باغچەوان و زَبّالي حَمام و عملەی قوڕكاري ئەكەن بە (شمس الدين) و (نجم الدين) و (مُحي الدين) حَقًّا ئەو ألْقابە گەورە گەورە خَيْلي چووكەلەيي ئەنوێنێ! (مقصد) مان سووكی و چرووكی ئەو (ذات) انە نيە، (مقصد) مان باب و داكی مندالآنە، بە گوێرەی ناويان، (مهنە)فێری مندالآن كەن، تا ببيتە (تقال) و (تطابق)؛ ئەمە زۆر جوانە. ﴿قَالَ﴾ (زكريّا) ﴿رَبِّ﴾ (باری تعالى) ﴿أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ﴾ كوو ئەبێ؟ لە كوێ ئەبێ؟ ديارە ئەو (ذات)ە هەر وەكی (رسول) بووە؛ (عالِم) و (عارف) بووە بە (قواعد)ی (فطريە). لەو (حال)ە بە دووری زانيوە؛ (حقيقةً) (نظر) بە (عادەت) خەيلی دوور بووە. وامەزانە لێرە ﴿ (القائات)ێ هەبی لە (طرف)

(إبلیس)؛(أمّا) لە (طرف) (نقّال)ی (غیر)ە (نُقّاد) ئەبی ﴿وَكَانَتْ امْرَأَتِي عَاقِرًا﴾ لە (أوّل)ی (شباب)ی تاپیری؛ دیارە (عُقر)یّ (عارض)ی نەبووە؛ (عائد)ی (احوالات)ی (خاص)ی (رحم)ي بووە ﴿وَقَدْ بَلَغْتُ مِنْ الْكِبَرِ﴾ لە پیری ﴿عِتِيًّا﴾ هیشکی،تەڕاییم نەماوە (عُمر)یان چەند بووبی، لە (دورە)یە وا بووین، کەڵکی (توالد)یان نەماوە؛ خۆی (عاقر) نەبووە؛ (قابل)ە پێش ئەو ژنە لە ژنێکی تر (أولاد)ی بووین و مردبن؛ (ممكن)ە بۆیە (دُعا)ی ژینی کرد بی﴿قَالَ﴾ (مُبشِّر) ﴿كَذَلِكَ﴾ وایە، ڕاستە؛ فەرمایشت بە جیّ یە، (مُطابق)ی (حقّ) و (حقیقت)ە ﴿قَالَ رَبُّكَ﴾ی ئی توو ئەی (زەکریّا) (أمّا) (خطاب) لەگەڵ پیغەمبەری ئێمە، لێرە دوورە ﴿هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ﴾ لەسەر من ئاسانە (سهل)ە ﴿وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِنْ قَبْلُ وَلَمْ تَكُنْ شَيْئًا﴾ چی وانە بوویی، ببیە ئەو (إنسان)ە؛ بە (قدرەت)ی (إلهی) لە (مواد)ی (جامد)ە (ترقي)ت کرد– (طوراً بعد طورٍ) – بوویە ئەم (ذات)ە؛ دیارە (معدوم)ی (صرف) نەبووە؛(حتیّ) (أبو البشر) ئەویش لە هیچی نە خُلقایە؛ (مع أنّهُ) لێرە (خیال) بۆ (إبتدا)ی (خَلق)ی (بشر) ناڕوا ﴿قَالَ رَبِّ اجْعَل لِي آيَةً﴾ (علامەت)ی لەسەر (وقت)ی (علوق)؛ (دُعا)ی (زکریا) زوو (قبول) بوو؛ یا (تأخیر) بوو؟ (٤٠) ساڵ یا(٦٠) ساڵ؟ بە خوای دوورن؟

ئەگەر ڕاست بیّ (یَحی) لە (عیسی) بە شەش مانگ یا بە (٣) ساڵ گەورەتر بووە، لە (وقت)ی (دعا) (مریم)ە منداڵ بووە؛ لە (عُمر)ی دە یا سێزدە ساڵی (عیسی)ی بووە؛ (مُدّة) کی (فاصل)ی ئەوی (وَالْعِلْمُ عِنْدَ اللّه).(طلب)ی (آیەت) زۆر (مُوافِق) تا لەو ڕۆژەوە (أمل)ی دەست کا بە پشکوتن، وە (زیاد) (شُکران)ە (إلهی) بکا ﴿قَالَ آيَتُكَ أَلاَّ تُكَلِّمَ النَّاسَ﴾ ناتوانی قسەیان لەگەڵ بکەی ﴿ثَلاَثَ لَيَالٍ﴾ سیّ شەو (عِلی الأكثر) (مُعاشرة) لە شەو دەبی؛ (بَدأ)یش لە شەو (مُوافِق)ە ﴿سَوِيًّا﴾ بیّ (عِلّەت)و دەرد؛ (حقّا) (آیەت)یّ (مُطابق)ی (حضرەت)ی (زکریا)یە؛ (علی خِلافِ العادَة) بوونی منداڵی بە دوور زانی؛ خوا (علامەت)ی (خِلاف)ی (مُعتاد)ی بۆ دانا؛ قسەکردن زۆر (سهل)ە، وەك

(علما)ی (أصول) ئەفەرموون: (كَيفيّەت)ێكە ئەچێتە سەر هەناسەی (طبيعی) بە (أدنی) (إعتماد)ی لەسەر (مخارِج) (مَتم) بوونی لەو (أمر)ە (سهل)ە (مُعتاد)ەی و كردیتە (علامەت) لەسەر ئەو (أمر)ە (غير)ە (مُعتاد)ی (سهل)ی لای خوا؛ (أمّا) (ممنوع)و (مُمتنِع) لە (غَير)ی.

من خوا ئەزانی كە لە خدمەت (شێخ علی افندی)هەڵستام، بۆ جێ ی خۆم ئەچوومەوە، تا (قريب)ی سعاتی نەم دەتوانی لەگەڵ كەس قسە بكەم؛ (حتّی) (خيال)م ئەكرد، ئێستا ملایە بێ، قسەم لەگەڵ بكا، زۆر بە نادانم تێ دەگا؛ چونكی قسەم لەگەڵی پێ ناكرێ ﴿فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنْ الْمِحْرَابِ﴾ دیارە (محراب)ی نوێژ نیە، ئەم (خروج)ی لەبەر (علوق) بووە﴿فَأَوْحَى﴾ بە (إشارە): بە (كتابەت) لەسەر كاغەز، لەسەر خۆڵ ﴿إِلَيْهِمْ﴾ لەلای (قوم) ﴿أَنْ سَبِّحُوا﴾ (ممكن)ە (مراد) (نفس)ی (تسبيح) و (تقديس) بی ﴿بُكْرَةً وَعَشِيًّا﴾ (مُنزّە) لە (نقص)، (قادر)ە لە (بَين)ی دوو بیر، نەونهانێ (إيجاد) كا؛ (ذاتاً) (إنسان) كەشتێ (غريب)ي ديت ئەڵێ: "(سُبحان الله) ". دوايی ديم شتی وا لە (تفسير)ی (سيدی آلوسي) (نقل)ی لە (صاحب)ی (تحرير) ئەكرد. (خُلاصە) (تفسير)ی (تسبيح) بە نوێژم لا خۆش نەبوو؛ (وَلَوْ) لە (إبن عباس) و (قَتادە) و (جماعەت)ی (نقل) كراوە.

ئەوا (علوق) بوو؛ نۆ مانگ و نۆ ڕۆژو نۆ سعات و نۆ دەقیقەی (مُدّە)ی (حَمل) چوو، (حضرەت)ی (يحي) ناودێر بوو، بە (وَلَد) بوو، گەیشتە (مَقام)ی (خِطاب) (ناداهُ رَبُّ الأرباب). ﴿يَايَحْيَى خُذْ الْكِتَابَ﴾ تَوْراە، یاكتێبی بۆ خۆی ناردراوە.( صُحُف ی ابراهيم)؟ بڕوا مەكە ! وە ئەو وە قتیش نەمابوو! هەرچی هەیە، خۆی ئەزانێ! وە ووتی ﴿بِقُوَّةٍ﴾ بە سَعي و نِشاط تەوانایی حِفظي كە، عَملي پێ بكە. مُنادي ئەگەر حَضرەتي ذوُ الجَلال نەبێ، با مَلَكْ بێ! أمّا بلێ ئەوە باوكی أمْري پێ كردیە، نایەتە ذِهن لەو مَقامە ! ﴿وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا﴾ فَهْم و عِبادەت و حِكْمەت و عَقل و معرفەت و أدابُ الْخدمە فَراصەتی نُبُوّەت، بە

حەوت سالّى، بلّێم چ؟! پاشە بەرە زو پێ ئەگەن، قابلە! گەلێ منداڵ زۆر عجايب زوو پێ گەيشتينە، أمّا زووش ڕۆيشتينە.﴿وَحَنَانًا مِنْ لَدُنَّا﴾ مەرحەمەتى خۆمان داوەتێ، يَعْني خوا دەربارەى گەلێ بەمەرحەمەتە! ياخود ئەو دەربارەى داك و باب و خەڵكى بە حُنُوو شَفَقَةْ بووە! با هەر دووك بێ! ئەمەش رەحمەتێكە لە طَرَفْ خوا إنسان بەمەرحەمەت بێ لە حەق خەلقي خوا.﴿وَزَكَاةً﴾ خێرو بەرەكەت. گێڕاويەتى بەزاتێ مُبارەك و نافِع و مُعَلمي خَيْر. أمّا بيكەينە صَدَقە، خۆى نيە! ﴿وَكَانَ تَقِيًّا﴾ بە پارێز بووە، حَتّا خَيالي گوناهي نەكرديە. ﴿وَبَرًّا بِوَالِدَيْهِ﴾ زۆر بە چاكە بووە، زۆر چاك بووە دەرحەق باب و داكى. ﴿وَلَمْ يَكُنْ جَبَّارًا﴾ مُتَكَبِر و مُتَعالي﴿عَصِيًّا﴾ رەق، كە نەيێتە قِوام، نەرم نەبێ بۆ خوا، بۆ داك و بابى. نَفي جبّاري لە (يَحْى) و (عيسي) نَظَر بە حالى بَني إسرائيلي گەر چى دوورە، أمّا إشارەيە بۆ حەق و حقيقەتێ مُستَمِر. قَوْمي كە بوونە ژێر دەست، هەر چەند بۆ خەڵكى نەرم ئەبن، أمّا دەربارەى يەك، زۆر بەرِق و قين و تَجَبُّرو أنانيَّة ئەبن! قَوْمێ كە بكەوێتە زەمانى مَنكوبي، وايان لێ دێ وەكى (حاجي قادري كۆيي) دەرحەق كوردان ئەڵێ:

(گزيرى بۆ أجْنَبي قبولْ ئەكەن
نەك كەسێ لە خۆيان ببێتە أمير).

﴿وَسَلَامٌ عَلَيْهِ﴾ سەلامێ بێ حەددو پايان لە طَرَفْ حَنّاني مَنّان، لەسەرى بێ! ﴿يَوْمَ وُلِدَ﴾ لە شَياطني وجِنْ.﴿وَيَوْمَ يَمُوتُ﴾ ئەوێ ڕۆژێ ئەمرێ. مَوْت، مَوْتە، بەكوژران بێ يا بە نەخۆشى! ﴿وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا﴾ رۆژى قيامەت. حَقيقَةً سەلامەتي رۆژي مردني هونەر بوو، ئەگەر چى ئەو نَوعە صَلابَە و جبّاريە لە رَسولان دوور نيە! سەر دانەيەنێ، خلافي دين قسە نەدەي! ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ﴾ قُرآن. ﴿مَرْيَمَ﴾ داكي (يَسوع) و دەزگيرانى (يوسُفي نَجّار). زاتا مَقْصَدْ لەو سورەتە، دَفعي عَويصەى ولادەتي (عيسى)يە كە بوويتە هەنجەتى بَعْضێ

تَفَوّهات.﴿إِذْ انتَبَذَتْ﴾ باسی لێرە، لەو وەقتەوە مَقصودە! نەك أوائلی نَشْأتی و رابردي! إِنْتِباذْ، إِنْفِرادو إعْتِزالە. تەنیا بوو ﴿مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا﴾ چووە جێیێ شَرقي، لاي رۆژهەلاتی خۆي. مُوافَقَتي تَرکیبي کوردي وعەرەبي وە مُقابَلەی مُفْرَداتي، زۆر مُشْکلە، ئەگەر مُحال نەبێ! ﴿فَاتَّخَذَتْ﴾ نازانم بە کوردی تَعبیر لە (اِتّخاذ) بدەمەوە، لە چەند جێ مُعَطّلم.﴿مِنْ دُونِهِمْ﴾ أهل.﴿حِجَابًا﴾ پەردەو پەنا. إحْتِجابْ بە دیوار ئەبێ، أمّا بە جَبَلْ نازانم چۆن ئەبێ؟! أمّا پەردەی ئۆب زۆر مُناسِبە لەگەڵ إتّخاذ. چوونی بۆ جهەتی شَرق، إتّفاقي بووە. مُمْکنە ئەو جهەتە چۆڵ بوو بێ، وە یاخود بۆ غُسْلي ئافرەتان داندرابێ. حَضْرەتي (مَریم) بەر زێدە حِجاب، حِجابي گرتبێتەوە. ﴿فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا﴾ اکثر ئەفەرموون (جبریل)! (أبو مُسْلِمْ) ئەڵێ: (عیسی) چونکی خوا لە حەقي ئەفەرمووێ (وَروحٌ مِنْهُ). مُدَّعی و دَلیلی، خۆی نیە! خۆزیا ئەو قسەي نەکردبایە. وا دیارە (أبو مسلم) بە خۆی مَغرورە! واقِعاً لەگەڵێ جێ قسەي صوابي هەیە! أمّا لێرە رووحي حەق بۆی تَمثّلي نەکردیە.﴿فَتَمَثَّلَ لَهَا﴾ بۆ (مَریَم). ﴿بَشَرًا سَوِيًّا﴾ رێك و پێك و قەشەنگ؛ ئەبا (تَمثّل)ي بۆ بکا، بۆ بە (بَشر)، وە (إلاّ) (تحمّل)ی (خِطاب)ي نەدەکرد. وە قسەیەکی ئەکەن، گۆی یا بۆ (خاطِر)ی (هَجّیان) بووە، (أمّا مَعَ الحصمة) (شێخ)ی (عربی) ئەوەی (إختیار) کردیە؛ لەو (جهەت)ە (تکون)ی (جسد)ی (عیسی) نیزیك ئەکاتەوە، لە (طریق)ی (طبیعي) (مُعتاد)؛ (أمّا) قسەکەی زۆر (مُوافِق)ی (قول)ی (حکما)ی (عصر)ی نیە؛ (معَ أنّهُ) (شێخ) شایانی (تقدیر) و (تشکّر)، لەسەر (قوّە)ی (ولایەت)ی خۆی و (کشف) و (کرامات)ی (سعی) کردیە؛ بۆ (تطبیق)ی (قاعدە)ی (فطری) ﴿قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَانِ مِنْكَ إِنْ كُنتَ تَقِيًّا﴾ لە خوا ترسی، خۆ لە (عقاب)ی ئەپارێزی؟ (إستعاض)ە بە (رحمن) لەبەر (ضعف)ی خۆی بووە، لەبەر (حمیّەت)و زگ پێ سووتان (اعراض)ی لێ نێ، ئەگەر (تَقي) نەبا، هاواری ئەکردە (قَوم). ئەوجا. بێ ینە سەر (تمثّل)ي (مَلَكْ)

کوو ئەبی؟ (حکما)ی (إلهیوّن) لەگەلْ ئێمە (مُتّفق)ي، کە (ارواح)ی (سماویّـە) بۆ (صاحب)ی (قوّە)ی (خیـالْ) (تمثّـل) ئـەکا، وە (علـوم) و (معـارف)یش لـیْ وەرئەگریْ؛ (أمّا) لای ئێمە (مَلَك) (جسم)ن وەکی ئێمـە؛ (غایـەت)ی (لطیـف)ن (أمّا) زۆر گەورەن؛ وەك (سعدی) ئەلْیْ: (تو بزرگی در آیینه یه کـچك نـەنمایی) لـە (بَـدن)ی گـچکە، چـۆن (ظـاهِر) ئـەبن؟ (وَعَلـي تقـدیرِه) (وُثـوق) نـامێنیْ (إحتمال)ی هەیە، ئەوەی ئەی بینی (زیـد) نـەبی (مَلَـك)بـی، (تمثـل)ی کردیـە. (قیل) و (قال)یان زۆرە؛ (أُمَم)ی (سالفه) گـویْ یـان نـەدەدا، شـتی وا، (حـتی) خۆیـان خوایـان ئـەدیت بـە (صـورەت)ی (إنـسان) و نـان و گۆشـتی گـۆلکیش ئـەخوارد. ئـەم (أنظـار)ە وەردە لـە (حکمـا)ی (ألهیّـون)و (علمـا)ی (إسـلام) (ظهـور)ی کـرد؛ گـەلیْ لـە ئێمـە (إقـرار) ئـەکاو ئـەڕوا؛ (حقیقـەت)ی(حـال) (مجهول)ە.

(تمثیل) و (تمثل)ی (خیالْی) (إنکار) ناکریْ؛ با نەزانین چۆنە؛ ئەمە وابی.

(ملا)یانی ئەفەرموون: "(إنـسان) (قـدرەت) و (إختیـار)ی لەسـەر (افعـال)ی (إختیار)ی (مَکَلّفُ بِها)ی خۆی نیە. ئەگەر بێتە (ظهور) بە (قدرەت) و (خلق)ی خوایە. (أمّا) ئەلْێن: جنۆکە (قادِر)ن کە خۆیان (متـشکل) کـەن بـە (أشـکال)ی (مُختلفه) بنۆڕە چەند (معکوس)، (مَلَك) قەیدی نیە، (أمّا) جنۆکە بۆ؟ خـۆڕایی نەبوو (سلب)ی (قدرەت)یان لە (بشر) کرد، ئەمڕۆ (سیئات)ی دەرکـەوت ﴿قَـالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ﴾ خوای تــوو منی هەناردیە ﴿لأَهَبَ لَكِ غُلاَمًـا﴾ (ولـد)ی نێـر، ﴿زَكِيًّا﴾ (تأویل)ي ئەکەن بە (سبب)، چونکی ئـەو (هِبـە)یـە (عائـد)ی خوایـە؛ (بعض)یْ (تأویل)ی (عبارەت) یان کردیە، بەلْیْ (قرائـەت)ی (لِیَهَـبْ) (ظـاهِر)ە، ئەبیْ (قرائتین) (توافق) بکا (زَکی) پاك و خاوین؛ ئـەو (إرسـال)ە (دلالـەت) لـە (نبوّەت)ی (مریمه) ناکا ﴿قَالَتْ أَنَّى يَكُونُ لِي غُـلاَمٌ﴾؟! چـۆن ئـەبی؟ (حـسب العادة) (مُحال)ە ﴿وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ﴾ بە (وَجە)ی (مشروع) ﴿وَلَمْ أَكُنْ بَغِيًّـا﴾ (بوجهٍ مِن الوجوه) (لِقاح) نـەبووە؛ (وَلَـد) کـوو ئـەبی؟ قـسەکانی لـە (حـالْ)ی

مندالّی ناکا؛ وە بە (قول)ی (ذي الهیاج) ئەچی ﴿قَالَ﴾ (رسول) ﴿كَذَلِكِ﴾ وایە، دۆغری ﴿قَالَ رَبُّكِ﴾ ئی (مریم) ﴿هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ﴾ بیّ (قاعد)ەی (زواج) (خلق)ی (ولد) لەسەر من ئاسانە ﴿وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً﴾ بەلّیّ (واقعاً) (آیەت)ە؛ (نظر) بە (قاعدە) (حتّی) لای (طبیعیّون)ی (مسیحي) (مُحال)ە، (أمّا) من ئەلّیّم "خۆزی سەد خۆزی (عیسی)ش وەك (سائر)ی (رُسل) بە (طریق)ی (مُعتاد) بە (ولد) بووبایە"، (بشر)ی لاسار، ئەو (ولادەت)یان کردە، مایەی (کفر) و (ضلال)و جەنگ و (جِدال)ی (حرب)ی (قلمی)و (سلاح)ی (آیەت) و (بُرهان) ﴿لِلنَّاسِ﴾ (عمومی) ﴿وَرَحْمَةً﴾ گەورە ﴿مِنَّا﴾ لەسەر (عِباء) ﴿وَكَانَ أَمْرًا مَقْضِيًّا﴾ (محكم) و (لازِم الوُقوع) ﴿فَحَمَلَتْهُ﴾ (مُوجز)ە، بۆیە (خلاف)یانە، (مُدّە)ی (حَمل)ی چەند بووە؟ بە (عبارەت)ی (قورآن)ی لێك نێزیکن، (جبریل) فووی کردیّ؛ لە نیزیك یا لە دوور (نَفخ)ی (جبریل) چووە ناو دەروونی، (حمل)ی بوو؛ گۆی یا (عیسی) لە فووی (جبریل) (مخلوق)ە ! بلّیّم: "چی؟" (کلام)ی (شێخ)ی (عربی) لە هەموان نیزیکترە؛ (عُمر)ی (مریم)ە چ (قَدر) بووە؟ بەڕاستی نەی (معلوم). قسەیە (مشهور)ەیە ئەلّیّن: " (مولود)ی هەشت مانگی ناژیە؛ (حضرەت)ی (عیسی) بە هەشت مانگی بە (ولد) بووەو ژیایە" وە (سبب)ی نازانم چیە؟ گەر چی (إمام) و (نەیسابووری) (توجیە)یان فەرموە؛ (أمّا) نایەتە (مَغز)م. (وکذا) (إشکال)ەکی ترم هەیە، بۆم (حَلْ) نەبوە: ڕۆژ کە بە تەواوی نەگیریّ؛ سێبەری (أوراق) و شتیدیش ئەبێتە (هلالی)؛ بۆ مانگ گیران وانیە؟ ﴿فَانتَبَذَتْ﴾ (مریم) ﴿بِهِ﴾ بە (عیسی) ﴿مَكَانًا قَصِيًّا﴾ جیّ یە دوور؛ بۆ کێندەری چوو؟ نازانم. (بعض)یّ ئەلّیّن: "ڕۆیی لەگەلّ (یوسف) بۆ (أرض)ی (مصر)؛ لە (أهناس)ی ژانی هاتیّ" ئەو قسانە تیّ ناگەم لە کویّ یان هینایە؟ ﴿فَأَجَاءَهَا﴾ تەنگاوی کرد، بە سەغلەتی هەلّی گرت ﴿الْمَخَاضُ﴾ (طلق)ی مندالّ بوون، ژان ﴿إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ﴾ دارخورمایەك لەویّ بوو، بەتاو بۆی چوو، خۆی پێوە بگریّ، چ مامانی نەبوو پالّی داتە سەریّ

دەرعُهدەی تَوْلیدي بیّ. لەبەر اَلف ولام، بَعضي ئەڵێن دارەکە مُعَیَّن بووە لاي جەنابي رِسالەت، جەنابي حەق شەوي مِعْراجْ نیشانی داوە. مُمْکِنـە ئـەو نَوْعـە کەسە بلّێن: یەك لە مَقاصِدِي سَیْدي رِسالەت پەناه بۆ لاي (قُدس)، دیتي ئـەو دارە بووە، تا وەقتی نزلی ايَةْ، بۆ تَصْحیحي اَلف و لامي عَهد، بەکاریێ! ئـەبێ تا ئەو وەقتە، مابێ! اَمّا یەکێ تر ئەڵێ: لەو وەقتی کە (مَریَم) ژانـي هـاتێ،خوا ئەو نَخله ي بۆ خَلق کرد، پێشدان نەبوو. بەڵێ با ئـەوەش (عیسی)یـا (ادەم)ي دارخورمایان بێ! نازانم لەگەڵ ئەوانـە چ بکـەم؟!! ﴿قَالَتْ يَالَيْتَنِي﴾ خۆزیـا ﴿مِتُّ قَبْلَ هذَا﴾ پێش ئێستا. ئەڵبەتە تـێ گەیشتیە چ قیـل و قـال-ی بەسـەر دێ. ﴿وَكُنتُ نَسْيًا مَنْسِيًّا﴾ لـە فکر چوو بـام، بـە جارێ نەهاتبامـەوە یـادي کەس. ﴿فَنَادَاهَا﴾ مُنادي کێ بوو؟ مَلَکي؟ یـا جبریـل؟ ئـەبێ وابـێ! لـە نَفخي خۆیەتی! ! بَعْضێ ئەڵێن: خەریکی مامـاني بـووە، (أوده أولی)! اَمّـا (سَیِّدي آلوسي) پێی ناخۆشە! خۆزی ئەو نَوْعە نُقّالانە صەد ساڵ پێش ئـەو قسانەیان مردبـان ناویـان نـەهاتبا نـاو (تَفسیري قُـرآن)! یـاخود نَفسي(عیسی) بـانگی کردیە.﴿مِنْ تَحْتِهَا﴾ لای خوارێ، ژێر دامێنی. نازانم ئەبێ تا سابێ، ئاگایان لـێ نەبوو بێ کەبەر بوویێتەوە؟! یا نەیتوانیوە خەریکی بێ! ﴿أَلاَّ تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا﴾ جۆگای لە (أردن)وە خواي بۆي جاري کرد، وە قتاکي تینـو بوو. یاخود (جبریل) پێی لە عاردی دا کانێ خۆشبوار بەدەرکەوت، جاري بـوو، بووە جَدْوَل. یاخود (عیسی) لینگـی لـە عـاردی دا، ئاوەکـە هـەرقولـي- قُـرآن إسْعاري بەوانەنیە. بَعْضێ ئەڵێن: سابِقاً، بـووە، بـەلاّم (مَـريَمْ) نـەیزانیوە، خـوا پێ گوتوە! ﴿وَهُزِّي إِلَيْكِ﴾ رایوەشێنە، دایوەشێنە ﴿بِجِذْعِ النَّخْلَةِ﴾ بەدارەکـە، دایتەکێنـە! دایتـەکێنی﴿تُسَاقِطْ﴾ نَخلـەکـە. ﴿عَلَيْكِ رُطَبًا﴾ بەسـەرتا ئـەخا، رُطَبێ! ﴿جَنِيًّا﴾ گەیی، مُهَیّاي لێ کردنەوەو چینن. وادەر ئەکەوێ (مَـریم) بـەو ژان و ژوارو منداڵ بوونە، بێ هێز نەبوو بوو، ئەیتوانـي داري خورمـا راوەشـێنێ بـي تـەکێنێ. ئەمـەش بـۆ أمثـالي ئـەو بـە خـارِقْ حِیسابـە، اَمّـا بـۆ ئـافرەتـي

عشیرەتی و رحّاله دوور نیە! لە دەوري فەقێیەتیم رۆژی لەبەر دەرکی مالّی خۆمان راوەستا بووم ئیشەکم هەبوو، ژنی بە تالووکە لە بازار ئەهات، خانیّ چۆل لەبەرانبەرم بوو، ووتی: دەبەرت مرم ئەو خانیە چۆلە؟ ووتم: نا! وامزانی قَضاي حاجەتي هەیە، هەندە نەچوو ژنەکە هاتە دەریّ منداڵەکي هاویشتبوە ناو توورەي بە پشتی خۆی دادابوو، بیّ انین و حنینی و ئوف و مۆف، چۆوە مالّی خۆي لە دەشتیّ، بیّ عَذاب وألم و واي و ئۆي. ﴿فَكُلِي وَاشْرَبِي﴾ رُطَبْ عافێت کە، ئاوي کاني و جۆگە نۆش کە. ئەوی بلّیّ مراد بە (سَرِيًّا) نَفسي (عیسی)یە بە مَعنا رفیعُ الشّأن وساميُ القَدْره، ئاوي لە کویّ بۆ دێنیّ؟ لە پەیا کردني ئاوو رُطَبْ، خارقەیە! مُناسبي ولادەتی خارقەیە! تا ئەوەي ببینیّ، نەتوانیّ خەیالّی باطلْ، بێنێتە خاطري! ﴿وَقَرِّي عَيْنًا﴾ چاوت روون کە، روون بیّ بەو وَلَدە مُمتازە. ﴿فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا﴾ هەر کەسیّ ببیّ، ئەگەر إسْتِفساري کرد﴿فَقُولِي﴾ بە إشارە تێی گەێنە ﴿إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَانِ صَوْمًا﴾ رۆژی سکوت. ﴿فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا﴾ گفتوگۆ لەگەلّ کەس ناکەم، لە إنسان– طَبیعي دوعا و تَحْمید و تَسْبیح و تَقدیس داخِل نیە. ﴿فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ﴾ بیّ هەراس و ترس، رۆلّەیی شیرینی لە باوەش گرتبوو، هاتەوە لای (قوم). ئەگەر هاتنە وەی لە رۆژی (ولادەت) و پاك بوونەوەی لە (نفاث)بی، قسە لە (نَذر) و (صوم) نیە، (مُوافِق)ە. وە (إلاّ) (مسئلە) (حوالە)ی (شرع)ی وان ئەکریّ ﴿قَالُوا﴾ (لدی الوصول) ﴿يَامَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا﴾ (شيئ)یّ گەورە و (عجایب)ت هینایە. ﴿يَاأُخْتَ هَارُونَ﴾ (ممكن)ە (مقصد) (حضرەت) و (هارون)ي برای (موسی)بیْ؛ خوشکەکی هەبوو (مریم) ناو، (سوء)ی (معاملە) کی بوو لە (خدمت) (حضرەت)ی (موسی)بە (دُعا)ی گرفتار بوو. لەبەر ئەوە بۆ (تعییب) بە (أخت)ی (هارون)یان (نِدا) کردیْ؛ نازانم تازە ئاگادارەکان، بۆ قسەیان نەکردیە؟ (أمّا) (إطلاق)ی لەسەر (مریم) وەکی (أخا همدان) نیە، (قیاس) لێك ناکرین، (ولَوْ) (ذات)ی وەك (زمخشري) فەرموویتی (ممكن)ە

(مراد)يان براى خۆى بێ؛ برايە بابى بووە؛ (ذات)ى (صالح) بووە؛ وە لەگەڵ ئەوە ﴿مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ﴾ پياوێ خراپ نەبووە ﴿وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا﴾ ئەمەت لە كێ وەرگرت؟

باب و براو داك گشت باش و خاوين، تۆ بۆ وا؟ ﴿فَأَشَارَتْ﴾ خۆى ﴿إِلَيْهِ﴾ ئەلاى منداڵەكە ﴿قَالُوا﴾ لە ڕووى (أنكار)ەوە ﴿كَيْفَ نُكَلِّمُ مَنْ كَانَ؟﴾ كوو قسە بكەين لەگەڵ كەسى، كە بووە؟ ﴿فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا﴾ منداڵى ناو لانكى (مُستَقِرّ) (كَأَنَّهُ) (كينونەت)ى (وجود)ي لەگەڵ (كينونەت)ى (في المهد) لەبەر نيزيكى، يەكن. قسەيان لەو (كانَ)ە كرديە؛ وە (لازم) نيە لەو وەقتى لە لانك دا بووبێ؛، بۆيە (تفسير)ى (قَتادە) بە (حجر الأم)م لاخۆشە وە (ممكن)ە (رَدْ) بێ لە (إنجيل)ى (لوقا)لە (باب)ى دووەم دەڵێ: "لەبەر (أمر)ى (قيصر)ى (أغسطوس)ى (يوسف) و (مريم) چوونە (بيت اللحم) تا ناوى خۆيان لە (دفتر)ى (حكومەت) (قيد) كەن لەو (وەقت)ى (مريم) ئەڵێ: " (عيسى)ى لە قۆنداغەى دەپێچين، لە (آخر)ىَ ئەى نوێنێن، چونكو لەوى ج جێ يان نابى" (مراجع)ەى ئەو (باب)ە كەن شتى سەيرى تيايە؛ (حتّى) دەرئەكەوێ (ملائكە) خۆيان، شەوانان (ظاهر) كرديە، موژدەيان دايە بە(عيسى)... ئيتر (عجايَب)اتە!

(حقيقةً) (إنسان) تەماشاى (كتب)ى (مقدس)ى وان بكات، (قيمەت)ى (قرآن) قات قات لاى زياد ئەبى. ﴿قَالَ﴾ (صَبيٌّ في المهدِ) ﴿إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ﴾ بەندەي خودام، لە (أوّل)وە (دفع)ى (تهە)ى (نبوّەت)ى كرد، وە قسەكردنى (أساساً) (دليل)ە، لەسەر (برائەت)ى (ساحە)يى (والدە)ى (مُطهّرە)ى خوى. كەسێ (إنكار)ى گفت و گۆى (عيسى) بكا، لە (يَسوعى)يان، ناتوانى (برائەت)ى (مريم) (إثبات) كات؛ خۆ (يوسف) شتى بوو، ئەگەر (قبول)ى كەن، دڵى خۆى پى (إقناع) كەن. (ممكن)ە لە (شيطان)ەوە بووبێ. (توجيهات)ى (نفس)ى (مريم)ە (قياسات)ى (دوورن)، (لازِم) نيە كە (آدم) (مثلا)-بێ داك و

باب بوو، يەكێ تريش وابى؛ يا بێ (أحد الطرفين) بێ تـا ئێستا (إنسان)ى بـێ داك نەبووە، لام وايە نازانن چۆنی پەياكەن (وإلا) ئەيان ووت ﴿آتَـانِيَ الْكِتَـابَ﴾ (ظاهر)ە لە (إنجيل) ﴿وَجَعَلَنِي نَبِيًّا﴾ (عالى قدر) ﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا﴾ بـە(نفـع) (مُعَلِّمُ الخير) (أمر)ى (بالمعروف) (ناهى) (عن المنكر) (حوائج)ى (خەڵكى) پێـك — هێنەر؛ (لكن) (نفـع)ى (شـامل)ە ئەمانـە (طبيعـي) (بـالقوه) (مُـراد) بـوون، لەبەر (تحقق)ى (أنَّهُ) (واقع) بووين، گێڕاومی بە (مبـارك) ﴿أَيْـنَ مَـا كُنـتُ﴾ لـە هـەر كـوێ بم. لام وايـە(إشـارە)يـە، بـۆ (إنتقـالات)ى بـۆ ئـەم لاو ئـەولا، وەك (هجـرەت)ى (نبـوى) ﴿وَأَوْصَـانِي بِالـصَّلاَةِ﴾ نوێـژ ﴿وَالزَّكَـاةِ﴾ ديـارە لەوانـە نەبووە، گەڕێدە (اَلْعُمْرُ عَلَي الله، وَالْعَيشُ عَلي العباد) وە (ممكن)ە (تَعـريض)ى تيابێ بو (قَوم)ى (سامعين) ﴿مَا دُمْتُ حَيًّا﴾ (عيسى) كەواى (أمر) پـێ كرابـێ، بەو (يقين) و (طهـارەت)ەوە خـەڵكى چـى؟ ﴿وَبَـرًّا بِوَالِـدَتِي﴾ دايكـم، (تـصور) ئەكرێ لەو(والدە)ى (محترمە) شتى (سوء)؟(اَلْعياذُ بالله) ﴿وَلَـمْ يَجْعَلْنِـي جَبَّـارًا شَقِيًّا﴾ (مع أنهُ) ئـەيتوانى بكاتـە (نـوع)ێ تـر(خِلقـاً) و(خُلقـاً) لـە ژێـر (أمـر) و (إرادە)ى (إلهى)م، (عبد)م؛ (بُنوەّت) (اَلْعياذُ بالله). (إستدلال)ي (يـسوعي)يانـە لێرە ئەڵێن: "ئەدى كێ بابيەتى؟" (أنَّهُ) (مجبور)ين چارە نيـە، بـەو (طـرز)ە نەبێ (ممكـن) نيـە؛ ئـەى هـوو، دوورە، (إحتمـالات) زۆرن ﴿وَالـسَّلاَمُ عَلَـيَّ يَـوْمَ وُلِدْتُ وَيَوْمَ أَمُـوتُ وَيَـوْمَ أُبْعَـثُ حَيًّـا﴾ ئەگـەر حـضرەتـي (يَحْـيِ)ش بـە منـداڵى قسەى كردبا، واى ئەفەرموو، يا (عيسى) لەو حالەدا قسەى نەكردبا، سەلام لـە طَرَفِي خوا ئەبوو! . نازانم چـۆن خلافيـان كرديـە لـە أرْجَحِيـة و أفْـضَلِيتي ئـەم و ئەو؟!

سابِقاً لە سورەي (يوسف) دائِرْ بەقسەكردني منداڵي ناو لانك، نـەختێكمان گفتوگۆ كرد، حَقِيقَةً قسە كردنى حضرەتي (عيسي) زۆر بەجێيە، بُرهانە لەسەر بَرائەتي صدِّيقە، قُدسيەّتى رسالەت، نزاهەتي إرادةُ الله و إختيـاري، بـۆ إرسـالى رَسـول! جـا نـازانم چ لـزومـي هەيـە بڵێن فـلان و فلانـيش لـە مَهْـددا قـسەيان

کردیە؟!! گۆییا ئەگەر بَعْضيَ زەواتی کِرام لەناو لانك گفتوگۆیان نەبوویێ، نَقْصه! حاشا! (عیسی) الان ماوە نەماوە، جارو مجرورە لە بەینی (قادیانی) و (موسولمانان) و (مَسیحیان)– وابزانم نزاعیان نابڕێتەوە!–.

هەرچی هەیە ئەمرۆ لەسەر موسڵمانان لازمە غەمی خۆیان بە خۆیان بخۆن، چارەێ بدۆزنەوە، إنْتِظاري (مَسیح) و (مَهدي) نەکەن، پەك لەسەر ئەوانە، نەکەوتیە! لازمە بۆ نَجاة ، إتِحاد، صَنایع و إخْتِراع، سَعي و عومرو مالَ بەفیڕۆ نەدان! ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوە. ﴿عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ﴾ ئەوەیە، باقي تر خۆي نیە! قسەیان إفك و هَذَیانە! نە وَلَدُ الزّنایە، نەخوایە، نەکوڕی خوایە! فِدیە و مدیە، إفْسادو إغرایە و إسْتِلایە! ئەو قَوْلي لە قُرانْ دا خودا بَیاني فەرمووە ﴿قَوْلَ الْحَقِّ﴾ یا خوا قَولي حَقْ ئەفەرمووێ. أمّا بلّێن (عیسی) قَوْلي حَقّە، یَعْني کَلِمەي خوایە أَلْقاها اِلى مَریَمْ، یاخود لە قَوْلي (کُنْ) إیجاد کرایە، لام زۆر خۆش نیە!!

گەر چی سەرامەدەکان إختیاریان کردیە! ﴿الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ﴾ قَوْلي بێ شك و شُبهە، ئەوەیە! ﴿مَا كَانَ لِلَّهِ﴾ جائز نیە، مَمنوعە بِالذّات، غَیرە قابلە. ﴿أَنْ يَتَّخِذَ مِنْ وَلَدٍ﴾ چ نێر چ مێ. ﴿سُبْحَانَهُ﴾ مُنَزَّهە. ئەگەر وَلَدي ببێ، ئەبێ مَحکومي فنا بێ! کە وَلَدْ بۆ خوا مُحال نەبێ، قابلە خۆی لەناو رەحمي ئافرەتي تَطَوُّر بکا، وەکي فەرخەی حەیوان– نَعُوذُ بِاللهِ–. وا دەرئەکەوێ أُمَمي سالفە لە تَجَرُّدي کبریائي بێ خَبَرْ بووین. وَهْم و خَیال، یاخود مَیْل و إفساد و تَسْخیر، غَلَبەی لەسەر کردینە!! عُلَماي إسْلام أوّلاً شُکرانەی خواو رسولی، دووەم شکرانەی حُکَماي إلاهیّون، بەجێ بێنن، کە لە أدْواري وَهْم و خەیالْ تەرەقیان پێ دان، بۆ ساحەی عَقل، توسیعی علم بە مُمْکن و مُستَحیل، وە بَیاني قُدسّیەت و تَجَرُّدي جەنابی حەق، وە بوونی زاتي واحدي حَقیقي لە هەموو جِهەت، فَوْقَ الطّبیعە، مؤسسي نَوامسي طَبیعَیەت، داخلي قَواعدي نیە!!! ﴿إِذَا قَضَىٰ أَمْرًا﴾ هەر چی هەبێ، بە صەد هەزار مەرتەبە فوقی

إيجادى (آدم) و (عيسى) بىّ ﴿فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ﴾ صُنْعي حەق لەگەڵ سائري خَلق، مُمتازە، حاجَتي بە وَضْع وإتّصال نيە، بە أمري تَكويني خَلق ئەكا. كە أمري كردە شتێ، بِلا تَخَلُّفْ ﴿فَيَكُونُ﴾ بە قەدەر (فيّى) (تَفريعي) زياتر نيە، ئەوەش تَقَدُّيمي زاتيە. وە بزانن لەو شأْنە، كەس شريكي خواي نيە و نابێ!

لاى من غَيْري جەنابي حەق هيچى تر تجردى نيە، نابێتە فَوْقَ الطّبيعَةْ!! هەر چى هەيە غَيْري ئەو، داخِلي نَوامسي طبيعەتە! ﴿وَإِنَّ اللَّهَ﴾ بە (كسر) بە (فَتح) (قرائەت) (وارِد) بووە؛ (تَتَمّة)ى (كلام) (عيسى)يە؛ دوو (ايەت)ى پێشى هاويشترايتە (بَين)، بۆ(إعتناء)؛ يا (رأساً) (كلام)ى خوايە، (إخبار) لە (عيسى)يە. لام (مُقَدّر)، (مُتعلِّق) بە (آخر)ى (جملە)ى ﴿رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ﴾ (غير)ى خواى كەسى تر نيە، شايانى (عبادەت) بى؛ لەگەڵ (ذوات الأنفس) (مثل)ن، لە (فَوق)ى (جَمادات)ن، يا (جَمادات)ن.

(جناب)ى (كبريائى) نەبى، هەرچى هەيە، (مغلوب)ى دەستى (طبيعەت)ە ﴿هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ﴾(إيمان) بە (وَحدانيەت)ى (إلهى) (مَبدأ)ى (سعادەت)ە (منشأ)ى (إستقامە)يە؛ (أصل)ى (حرّية) و (إستقلاليەت)ە، (مُنْجي) (إنسان)ە، لە (إضطراب) و (أسارەت)ى (وِجداني)؛ (باعث)ي دلّ ڕاوەستانە، (أمّا) (مردە)ى (أنس) بەترس، ئەو (ضمير). خۆشە ئەو (وجدان)ە پاكە، تێك ئەدەن؛ (دليل) و (بُرهان) بۆ هەموو كەس تەواو نابى؛ تەواويش بىّ (عقل) (مُقابل)ى (مَيل) و ترس(شديد) چى پىّ ناكرىّ. بۆيە (قرآن) دلّى (أنام) بە (رغبەت) و بە (رەهبەت) بۆ (طرف)ي خواى (صرف) ئەكا؛ لە (عَمر) و (زيد)ى وەرئەگيرێ ﴿فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ مِنْ بَيْنِهِمْ﴾ جوو وديان، (فِرقە)ى ديانان خۆبە خۆيى؛ (أمّا) (مسلّمان) (إيمان)ى بەخواو (كلام) و (رسول)ى خواى هەيە. وەك (بعض)ي لە (فِرق)ى (نصارى) (إيمان)يان دەر (حق) (عيسى) (وَسط) لە (بَين)ى (إفراط) و (تفريط)ە.

(إنجيل)ى (بەڕنابا) وەكى (إعتقاد)ى ئێمە (تفصيل)ى (مادە)ى (عيسى) ئەدا، لە بوونى تا (رفع)ى. چەندى (سَعى)م كرد، بۆ (مصر) نووسرا. (نسخە) كمان دەست نەكەوت (ئوروپايى) خەريكى (فەوتان)دنين ﴿فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ كَفَرُوا﴾ لە (يهود) و (نصارى) لام وايە (وَيْل) (تفسير)ى بە بيرى (جهنَّم) نايە؛ لەبەر ﴿مِنْ مَشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ ديارە (مُراد) ڕۆژى (جزا)يە ڕۆژى (حشر) و (نشر)ە ﴿أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا﴾ ئەوى ڕۆژى (عجايب) (سمع) و (بصر)ێكيان هەيە، هەموو شت ئەبيەن، (دقائق)ى (أمور) ئەبينن؛ لە وردى (فكر)يان مەپرسە، (فكر)ىٚ موشكافيان هەيە (أمّا) لە (دار)ى (دنيا) كەڕ بوون، كوێربوون، بێ هۆش بوون؛ گوێ و چاويان نەدەدا (آيات)ى (قَولي) و (كَوْني) ﴿لَكِنِ الظَّالِمُونَ الْيَوْمَ﴾ ئەمڕۆ ﴿فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ نەهۆش و نەگوێش و نەتێ فكرين؛ دواى (هَوا) و هەوەس خۆيان كەوتينە، نازانن بۆ كوێ ئەڕۆن؟!

﴿وَأَنْذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ﴾ (ضمير) ئەگەر (عام) بى (إنذار)ى (مؤمن) بۆ تووش نەبوونە، وەيا خود (حسرەت)يان لەسەر (فوات)ى (زێد)ى يە ﴿إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ﴾ (حساب) تەواوكرا، كەس بە فريادى كەس نەهات؛ دەركەوت (إيمان) و (عمل)ى (صالح) بەكارە. (أمّا) (ضمير)ى ﴿ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ بە (عِناد)، (حتماً) ئەبى بۆ (ظالم) آن بى؛ (بناءً عليه) با (هُم) لە (أنذرهُم)ەم بۆ وان بى.

(أمّا) (ذَبح)ى (مَوت) لە (قرآن) دا نيە؛ وە (تفسير)ى (يَوم الحسرة) (متوقف) نيە لەسەر (ذبح)ي (موت) بەڵى مردن ناميني؛ (ممكن)ە (إشارە) و (تمثيل) كرێ وە (إلا) مردن كوو دێتە سەر (صورەت)ى بەران؟ لەبەر (وإذا المنيّةُ أنشبَتْ أظفارَها) ئەبا بە شێر (تمثيل) كرى؛ (أمّا) لەبەر بێ (صَولە ت)ى ئەو وەقتى، بە (كبش)ى (أملح) (تمثيل) ئەكرێ بوونى وان لە (غفلەت) دا وە (إيمان) نەهينانيان، (مانع) نيە لە (أمر) بە (إنذار)؛ زێرا (مقصد) (إلزام)ى (حجّەت)ە (ظهور) و (تبيّن)ى (عِناد)يانە ﴿إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ الْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا﴾

(إرث)ی (من عليها) به (إفتی)یانانه، یاخود به (إرث)ی مالّیانه؛ (أمّا) (أرض) (مَوروث)ه. ئەگەر به (مُلك) و مالّ (مغرور) ن له دەستیان ئەچیّ؛ ﴿وإلَيْنَا يُرْجَعُونَ﴾ کەسی تر (مرجع) نیه؛ ئەگەر به (شريك) و (شفيع) خۆیان ئەفرەوێنن، ئەوی رۆژی (أقانيم) و (مقانيم) (فائده) نادا.

(ورْع)ی (لاهوت) به (ناسوت) بۆیان (کشف) ئەبێ ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ﴾ قُران، با لەو صوره تە دابیّ. ﴿إِبْرَاهِيمَ﴾ أبو الفَريقَين إمام المُوحّدين (عليه السلام) ﴿إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَبِيًّا﴾ زۆر راست گۆ بوه درۆی نەکردیه. شتێکی فەرموو بێ، یا له مَقامي مُناظَرة بووە، یا به تَوْریه فەرموویەتی. گەرچی سُفَهاي إسرائيلي ئەلّێن: (سارا)ی حەرەمی، خوشکی بووە له بابی! ﴿إِذْ قَالَ﴾ زێرا ئەو گفتوگۆیه، مراده! أحوالاتی تری تأریخی، مَقصود نیه لێره! ﴿لأَبِيهِ﴾ تأويل هەلّناگرێ! ﴿يَاأَبَتِ﴾ ئەی بابه. ﴿لِمَ تَعْبُدُ مَا لاَ يَسْمَعُ وَلاَ يُبْصِرُ﴾ نابینێ وه نابینێ. ﴿وَلاَ يُغْنِي﴾ بۆ كار كردنێ ﴿عَنْكَ شَيْئًا﴾ چی پێ ناكرێ، إدراكي نيه، هێزی نيه. ئەگەر بلّێن مُنْفَعَتیان ئەبێ، ئەبێ خَبَرداربين! ﴿يَاأَبَتِ إِنِّي قَدْ جَاءَنِي مِنَ الْعِلْمِ﴾ دَركي حَقايق. ﴿مَا لَمْ يَأْتِكَ﴾ كأنَّهُ علْمي بَديهيه، خۆی دێ! ئەگەر مَيل تَقاليد نەبێ، ئەوه له إنسان بزر نابێ، حاجَةْ به نَظَر و فِكر نيه! جِمادْ چيه؟ حَتّا له خَواصي نافعه نَبات له زێر بالآتره! حَياةْ، به پاروه نانێکی مَربوطه!

﴿فَاتَّبِعْنِي أَهْدِكَ صِرَاطًا سَوِيًّا﴾ دوام کەوه رێی راستت نیشان ئەدەم. ﴿يَاأَبَتِ لاَ تَعْبُدْ الشَّيْطَانَ﴾ بەدواي وَسْوَسەی مەکەوه، گوزەرانم لەسەر بوت تراشي يه، نَفعي تيايه! ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَانِ﴾ نازانم رَحم، رَحمەت، له كوردي چی پێ ئەلّێن؟! ﴿عَصِيًّا﴾ ئەوەندە بەسیه بۆ تَعَيُّب و نا مَعْقولي، كەسي عصْيانی رَحمن بكا! ئەگەر چی أكثَري ناس وان، كەسێ جگەر سۆزيان بێ زگی پێیان بسوتێ، لايان بێ قدره به قسەي ناكەن گوێی نادەنێ.

﴿يَاأَبَتِ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَمَسَّكَ﴾ بتگریٚ پیٚتەوە نووسیٚ، ﴿عَذَابٌ مِنْ الرَّحْمَانِ﴾ رَحْمن درەنگ صاحبي گوناه ئەگریٚ، أمّا ئەگەر گرتي بەسەختي عَذابي ئەدا. ﴿فَتَكُونَ لِلشَّيْطَانِ وَلِيًّا﴾ ئەوجا ئەبیە دۆستی شَیْطان هاو قرانی. جا مَقصَدي أبْلیس ئەوەیە كە إنساني تووشي غَضَبی إلاهي كات ﴿قَالَ﴾ باوكي. ﴿أَرَاغِبٌ أَنْتَ﴾ یا ئەتوو ﴿عَنْ آلِهَتِي﴾ إلاهەكانی من. ﴿يَاإِبْرَاهِيمُ﴾ مەیلي خۆتیان لیٚ صَرف ئەكەي، وەرئەگێڕي، ئەوە كوو ئەبیٚ؟

﴿لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ﴾ له رەغبەتی (عَنْ آلِهَتِي). ﴿لأَرْجُمَنَّكَ﴾ بەردە بارانت ئەكەم ﴿وَاهْجُرْنِي﴾ برِۆ، لام نەمێنیٚ! ﴿مَلِيًّا﴾ زەمانیٚ دوور و درێژ. ﴿قَالَ﴾ إبراهیم ﴿سَلاَمٌ عَلَيْكَ﴾ بابە بە دوعا ئەوا رۆیشتم! ﴿سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّي﴾ی ظاهرە لە وَعد، جەنابي حەق نە رَسولي إعْتراضیان نەگرتیە لە إبْراهیم، بەسَلام و وەعَدي إسْتغفار، مَعَ أنَّهُ وەك خۆی ئەفەرمویٚ ئەوانە پێش زانیني إبْراهیمە، كە باوكی بە صورەتی قَطْعي إیمان نایني. ئەو وەقتە لێیٚ بێزار بوو وازی لیٚ هێنا خۆي لیٚ بەري كرد، ئیتر حاجەت بە مُنازَعاتي مُفَسَّرینان نیە!! ﴿إِنَّهُ كَانَ بِي حَفِيًّا﴾ زۆر دەرحەق من بە إكْرام و إحْسانە، إعْتنام پیٚ ئەكا، بەڵكو إهْتمام بە بەندەي خۆي ئەكا دوعام قبولٚ ئەفەرمویٚ لێت خۆش ئەبیٚ! ﴿وَأَعْتَزِلُكُمْ﴾ لێتان گۆشە گیر ئەبم. ﴿وَمَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ لە ئێوەو ئەوەی بانگی ئەكەنیٚ، دوور ئەكەوم، لێرە ئەڕۆم. ئەڵێن هِجرەتي كرد بۆ لای (حران). (سَیِّدي آلوسي) ئەفەرمویٚ: لەو هِجرەتە (سارا خاتون)ي مارەكرد، دیارە خوشكی نەبووە!! ﴿وَأَدْعُو رَبِّي﴾ ظاهِري عامّە، با شامِلي عِبادەتیش بیٚ! ﴿عَسَى أَلاَّ أَكُونَ بِدُعَاءِ رَبِّي شَقِيًّا﴾ خائِب و سَعیم بە فیڕۆ چیٚ، أمل و ئەمێدم دێتە جیٚ! چاك وابوو ئەواني مەش، حُسْني أدَبْ، لەوانە فێر بن! ﴿فَلَمَّا اعْتَزَلَهُمْ﴾ ئي خۆیان ﴿وَمَا يَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ ئاینیان. كە هِجرەتی كرد ﴿وَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ﴾ تَفْصیلي بووني إسْحاق و نافلەی لە قُرآن ذكر كراوە. ﴿وَكُلاًّ﴾ لە إسْحاق و يَعْقوب. ﴿جَعَلْنَا نَبِيًّا﴾ ورَسُولاً! ﴿وَوَهَبْنَا لَهُمْ﴾

هەر سێکیان.﴿مِنْ رَحْمَتِنَا﴾ چی لێیان بوە شێتەوە شایانیان بێ. ﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا﴾ (صدق) بەهەردوو لا ئەبێ؛ لە هەموو (أمّەت) آن ناویان بە چاکە دێ؛ (حقیقةً) (بنی إسماعیل)(نجابەت)یان نواند، هەرچەند (بنی إسرائیلی) (لسان)ی (كذب)یان دەربارەی (إسماعیل) و (بنی إسماعیل) درێژ کرد؛ (حتّی) (إسماعیل) لە (إرث)ی (معنوی) باوکی (محروم) بکەن. (بنی إسماعیل) زێدە (ثنا) خوانی (بنی إسحاق) و (إسحاق) بوون؛ (کاف)یە (صلَوات) لە (إبراهیم) و (آل إبراهیم) لە (طرف)ی (جناب)ی (رسالەت) پەناه، (داخل)ی نوێژ کرا. زۆر خۆشە (إنسان) ناوی چاکەی بەڕاستی بکەوێتە ناو (تأریخ)؛ (أمّا) وەکی تێ ئەفکرین (أكثر)ی (مؤرخ) (طبیعەت)ێ (شاعیرانە)یان هەیە، (لسان)ی (صدق)ی یان کەمە؛ (خاصّةً) (رؤسا)ی (أدیان) و (مذاهب)ی (خسیسە)؛ زوبانی (صدق) ئەوەتە بێ (مَیل) و (طمع) بێ؛ (ألآن)یش (رؤسا)ی (ئاوروپایی) (لسان)ی (كذب)یان دەبارەی (خاتم الرسل) وەك ماری رەش (جَولان) ئەکا. ئەوەی (عالَم)ی (تأریخ) بەڵکو (عالَم)ی (کَون) نەی دیتیە بە (إفتراء) دەرحقی ئەڵێن. (دەخیل) گوێ مەدەنە قسەی مەلایان دەرحەق یەك؛ (ذَمّ) و (قَدح)یان؛ وە سوپاس و ستایشیان مە (حُبّ)ێنن، تا خۆتان لە (کُتُب) و (آثار)یان ئەی بینن، ئەو (وەقت)یش، زوبانی بەد ببەستن (إستغفار)یان بۆ بکەن؛ (مثلاً) (شێخ)ی (إبن سینا) وە (شێخ)ی (إبن عربی)وە (شێخ)ی (إبن تمیمە) وە (هکذا) قسەی بەدیان دەرحەق کراوە؛ (ذوات)ي زۆر گەورەن، (غایەت) (ملا) بووین، تەماشای (کتیب)یان کەن، ئەوەی باشە وەری گرن، ئەوەی باش نیە، (إقتدار)تان هەیە، باری (رَدّ)ی کەن؛ (إقتدار) تان نیە (سکوت) کەن؛ بە (طعن) و (لَعن)ي ادی ئەو (نوع)ە بزرگەوارانە بانەکرێ. (وَهکذا) دەرحەق (خصوم)یان، وە بلێین (تلكَ أمّةٌ قَدْخَلت لها ما كَسبتْ ولكم ما كسبتم) (في الحقيقة) ئەو (شقاق) و (عداوەت)ە شتێ خراپ بوو لای خۆیان بە خێریان ئەکرد، (أمّا) بۆ خۆیان و بۆ (أمّەت) زۆر شەڕ بوو ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ

مُوسَى﴾ (عليه السلام) (كليم اللّه) ﴿إِنَّهُ كَانَ مُخْلَصًا﴾ بە (فتح)ی (لام)و (كسر)ی (لام)؛ پاك و خاوێن و بی (غلّ) و (غش)هەڵبژاردراوی(نادر الوجود) بوە ﴿وَكَانَ رَسُولاً﴾ لە سەرامەدانی (رُسل) بوە ﴿نَبِيًّا﴾ (رفيع القدر) و (عظيم الشأن) بوە، لێرە قسەیە (شێخ)ی (عربی)هەیە؛ لام خۆی نیە ئەڵێ: "(رسول)ە بۆ (تشريع)ی (احكام)ی (أفعالی)یە، وەکی (نوێژ) و(ڕۆژی)؛ (نبی)یە بۆ (تشريع)ی (أحكام)ی (إعتقاديە) وەك (معرفة الله) و (صفات)ی؛ (مُخلص) (إشارە)یە بۆ (ولايەت)؛ (ولايەت) لە هەردووكی گەورەتر؛ (فنا)یە روو لە خوایە؛ (رسالەت) و (نبوەت) بیّ ی وی نابن، (ولايەت) (مُقدّم) و (مُؤخّر)ە." هەرچەند ئەڵێن: (مقصد)ی (ولايەت)ی (نبی)یە، (أمّا) خۆی نیە؛ (فرق)ی (نبی) و (رسول) بەو (نوع)ە لە کەسمان نەبیستیە، وە (رسول) روو بە (خلق) نیە، رووی (خلق) ئەكاتە خوا ﴿وَنَادَيْنَاهُ﴾ (بالذّات) (إلقا)ی (سمع)ی (موسی)ی کردیە، لەناو گوێچکی (هوا)ی (مكيّف) کردیە، بە (كيفيّەت)ی (صوت)ی (حرفی).(أمّا) ئەوەی (غزالی) و (أمثالي) ئەڵێن: "(بلا حَرف) (صَوت)ی (كلام)ی خوای بە هەموو (أعضا) لە هەموو (جهەت) بیستوە، بۆی هاتوە" (سيّدي آلوسي) دەفەرموێ: " ئەمە (طور)یکە (ورا)ی (طور)ی (عقول)ە " ﴿ مِنْ جَانِبِ الطُّورِ﴾ کێوی (طور)ی (مشهور)ە ﴿الأَيْمَنِ﴾ لە (طرف)ی راستی بە (إعتبار)ی (طرف)ی (موسی). (ممكن)ە لە (يُمن) بیّ بە (معنی) (بركەت) بی (ئەوانەی) (جناب)ی (حق) قسەیان لەگەڵ ئەكا، ئەگەر لە (خياليون) نەبن، بۆ (جهل)یان ئەبا؛ (ضرورةً) ئەزانن ئەمە فەرمایشی خوایە ﴿وَقَرَّبْنَاهُ﴾ دیارە نیزیکی لە خوا بە (إعتبار)ی (مسافە) نیە، بە (قطع)ی (علائق)ە ﴿نَجِيًّا﴾ (خلوەت) (أنهُ) قسەی بە (خلوەت)ی لەگەڵی کرد؛ (إحتمال)ی هەیە (مَلَك)یش ئاگادار نەبوو بی جا (فرق)ی هەم (خلووت)ی (الهی) لەگەڵ (عَبداً مِن عبادنا) زۆرە؛ (أنّهُ) لەو (سورەت)ە، (وَخاصّةً) لە (سورەت)ی (آتي) (دفع)ی (توّهم)ی (عمرو) و (زيد) لە (حقّ)ی (موسی)ئەكا،

گویّ یا ئەو (ذات)ە لەو گەورەتر بو بی ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ مِنْ رَحْمَتِنَا﴾ لە رووی (مَرحمه) (دُعا)ی (قبول) کرد، دەرحەق ﴿أَخَاهُ﴾ برای ﴿هَارُونَ﴾ برای پیّ (کَرَم) کرد ﴿نَبِيًّا﴾ (مُراد) (هِبە)ی (نبوّەت) (هِبە) کرا (هاڕون)، (هاڕون)ی (نبی) (عطا) کرا (موسی)ی (برای).

﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ﴾ جگەر گۆشەی إبراهیم. ﷺ إسماعیلي دي نەبووە حەقی هەبیّ لە قرآن ذکر کریّ، (إسماعیلي بن حَسقیل) لە توورەکەی بَني إسرائیلي دا ناوی مُقَیَّد نیە! ﴿إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ﴾ ئەڵیّن: وەعدي دا کەسیّ، تا دیّتەوە، لەو جیّیە نەڕوا. کابرا ساڵیّ بزر بوو، کە هاتەوە ووتی: لیّرە نەبزوو توویی؟ فەرموي: نا، خُلْفي وَعد ناکەم! أما نازانم کوو تَصویرو تَصَوّر ئەکریّ؟! بَعْضيّ نُقال بیّ مُحاکمەنە، أمَّا بَعضەکیان زرنگن جیّی پینە ئەزانن، پینەی عَجایب لیّ ئەدەن، کەسیّ یە دقّە نەبیّ دَرکی ناکا، وەك رُفوي لِباس کە لە بَغدا ئەیکەن! من ئەو درۆز نانەم خۆش ئەوێن، جیّی تَقدیرن! صِدْقي وَعَد مَنْقبەیّ جَلیلە، خاصَّةً ئەمڕۆ، زەمانی إسْتیلاي درۆ و سیاسەتە، صادِقُ الوَعد وەك أکیرە دەست ناکەویّ!

﴿وكَانَ رَسُولاً نَبِيًّا﴾. یەك لەسەر داکي نەکەوتیە! بابی إبراهیمە، خۆی صاحِبي مَزایایە! ﴿وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُ بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ﴾ عیبادەتي بَدَني و مالي، أهَمّي مُهِمّي تَربیەی عائلیە، تربیەی دینی عالیە! ﴿وَكَانَ عِنْدَ رَبِّهِ﴾ جَلْ جلالُه! ﴿مَرْضِيًّا﴾ لە رەزامەندي خوا بۆ عَبد، خۆشتر، چشتیّ تر نیە!

﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ﴾ حکیم، صادِق، بیّ خَرافات. ﴿إِدْرِيسَ﴾ کیّ یە؟ کوڕي کیّیە؟ مَعلوم نیە! قیلە قیلِ زۆرن، وەك لە (طَنطاوي) وەرئەگیریّ ((زاتیّ بووە (هُرمُس)ناو، زاتیّ گەورە رَسولیّ بە حەق بووە، ئەڵیّن أوَّل کەس بووە کە تەماشاي نُجوم و حسابي کردیە، نوسیني بە قَلَمْ لەوێوەیە، وکَذا لباسْ دروست کردن و خَیّاطي، بەڵام ئەو أوَّلِیاتە نَظَرْ بە آدواري سابِقە بە دروستي نازاندریّ! نِهایەت (مِصري) إلْحاقیان کردیە بە إلِه!!!)).

لە تَفاسيري ئێمە ئەفەرموون: مَلائكەتي بلْندي كرد بۆ ئاسمان (وَرَفَعْناهُ مَكاناً عَلِياً) لە ئاسماني چوارەم، شەشەم، حەفتەم، تووشي (عِزرائيل ئەبێ ئەڵێ ئوغربي؟ ئەڵێ مَأْمورم رووحي إدْريسي لێرە بكێشم،! –وە إدْريسيش لەئەرزە– ئەڵێ إدْريس ئەوەتە! لەوێندەرێ رووحي ئەكێشێ وەفات ئەكا. لاى مِصْريان لەوێ ماوەتەوە!! ئەوي أهلي سَعادەت بێ، رووحي ئەچێتە لاي ئەو!! ئەمّا حكايەتێ مَشْهورە كە عِزرائيل رووحي كێشاوە، وە زيندي بويتەوە، چويتە ناو جَهَنَّمْ، ئەويشي ديوە، چوويتە ناو بەهەشت بە نِهاني، لەوێ ماوەتەوە، لە مُحاكَمە غَلَبەى كردوە بەسەر مَلَكُ الْمَوت، مردن بوو چێشتم! جَهَنَّمْ بوو چوومێ! بەهەشت ئەمەتە، هاتوومە ناوي، ئەوي بچێتە ناو بەهەشت، بَعْدَ الَموت، مُخلَّدە، ناچێتە دەر، حالاً لەوێيە، خەريكى لِباس دروونە بۆ بەهەشتيان، كە بَعْدَ الحَشر ئەچنە بەهەشت!!! حَقاً بَعْضە قِصَّاصيش پێى راضي نين! لاشَكَّ خرافاتە بێ أصله!!! مَكاني بلْند لە نَظَر سَلَفە عَلامەتي گەورەييە،أمَّا لە نَظَر أهلي خۆي، بلْندي بلْندى مَكانة و مَنْزِلَتە! مِصْري (إدريس)يان لەسەر تەختي مُجَوهَرْ دادەنا، عِبادەتيان دەكرد،! فەرقى ئەم زاتەي لەگەڵ گا جووتي گاراني چ بوو؟ پاش بيست و پێنج ساڵ مَعْبودي، راهِبەكان ئەيانكوشت پارچە پارچەيان ئەكرد ئەيانشاردەوە؟! بلْندي بە نَظَر ئەو نَوْعە قَوْمە، ئەبێ چ بێ؟ أساساً (إدريس) أوَّل مَعبودي مِصْريان بووە، مَعبودي رۆژى! بەرانبەرى (طَيْغون)، مَعبودي شەوێ بووە، وەك ظُلمەت و نوورى وَ ثَنيات! خلاصە خەرافاتيان زۆرە! ئارەزوو ئەكەى تەماشاى تَأْريخي عمومي كە، ئەوەي لە آثار وەرگيرايە.

جا إشْتِقاقي (إدريسْ) لە (دَرْس)ە، گۆييا عەرەبيە، أمّا عەرەبي نيە! مُمْكِنە لەو معنايە يەدا، ناوەكانيان لێ نابێ!

ئەوەندەى قُرآن ئەفەرموێ، بۆ إيمان بە (إدريس)، كافيە! ﴿إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَبِيًّا﴾ وەك مَنقَبەى إبراهيم. ﴿وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا﴾ رَفْعة و بلْندى

مَعْنَوي رووحي وَصْفي خِلقي. بلّندی مَكان ئەگەر شخص خۆی بلّند نەبیّ، چ نیە! ﴿أُولَئِكَ﴾ ئەو (نوات)ي (كِرام)ی (ذكر) كران لەم (سورەت)ە ﴿الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ﴾ بە (انواع)ی (نِعَم)؛ (دینی) و (دنیوی)؛ (ذاتاً) تەواوی (نعمەت)ی (دین) (نعمەت)ی (دنیا)یە ﴿مِنَ النَّبِيِّينَ﴾ لە پێغەمبەران و (رسول) انی كە ﴿مِنْ ذُرِّيَّةِ آدَمَ﴾ باوكی گشت ﴿وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ﴾ (ادریس) لەوانە؟ لەوانی پێشوو؟ خوا ئەیزانیّ؟﴿وَمِنْ ذُرِّيَّةِ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْرَائِيلَ وَ﴾ (بقیّە) ﴿مِمَّنْ هَدَيْنَا وَاجْتَبَيْنَا﴾ خوا بە (هدایەت) و (إختیار)هەڵی بژاردینە، (إنعام)ی لەگەڵ كردنیە. دیارە ایتریش هەن، (ترجمە)ی (حال)یان (مفقود)ە (أمّەت) و (شرع)یان نەماوە، كەسیّ نەبوە لە خۆیان و (أُمم)یان (مُقابلە) و (سؤال) بكا، بە (إجمال) (إشارە) بۆ وانە (كانی)یە ئەوانەی خوا (هدایەت)یان بدا، وە (إختیار) و پەسەندیان كا (تصوّر) ئەكریّ (دَعوا)ی خوایەتی بكەن؟ ئەوەی حەزكا، خوا لیّ ی (راضی)بی وە (إنعام)ی لە (حق)بكا، (تبعیەت)ی (هدایەت) و (إرشاد)یان بكات. ئەوانە ﴿إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَانِ﴾ (حتّى) (آیات)ی (عذاب)یش لە (رحمەت)ە تا (خلق) تووشی (مُوجب)ی (عذاب)ی نەبی ﴿خَرُّوا﴾ ئەكەونە سەر روو، لەپ اوروو بەردەبنەوە سەر عارد، (أنّهُ) خۆیان ناگرن ﴿سُجَّدًا وَبُكِيًّا﴾ سەر لەسەر خاكی (مَذلّەت) دادەنێن، ئەگریەن، لە (خوف) و (خشیەت) و (جلال) و (هیبەت)ی خواو (مسؤلیەت)ی لەسەریان، ئایا ئەوانە (تصوّر) ئەكریّ (خیاڵ)ی خاویان بێتە دڵ؟ (حاشا).

ئەو بوزرگەوارانە، وان، (أمّا) (أولاد) و (أعقاب)یان ﴿فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ﴾ نا (خَلَف) دوور لە (سِیَر) و رەوشتی (آبا)یان، بە (واسطە)ی (إنتساب) لە هەموو (حسنات)یّ گەڕان ﴿أَضَاعُوا الصَّلَاةَ﴾ (ترك)ی نوێژیان كردیە، ﴿وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ﴾ (شهوات)ی (حیوان)ی بیّ (عقل)ی؛ (شراب) و (قمار) و كار خانە– (سبحان الله) ئەمڕۆ (إنقلاب) بكە، كە (عین)ی (حال) (تمثیل) ئەكات. كوڕە (شێخ) و (ملا)یەكانی چاك روویان كردیتە (سفاهەت)هەر

مەپرسە ! (حتّی) ئەڵێن: "(بعض)ی لە (وقت)ی (عُشرەت) (تأسف) بۆ باوکی ئەکا کە (لذّەت)ی لە (دنیا)یْ نەدیت، (سبب) بە (دین)داری، لە (شراب) و (موادّ)ی (روحیە) (محروم) بوو." ئەمەش (حق الإنصاف) (قباحەت)ی (أمّەت)و (حکومەت)ە؛ (أهل)ی خوایان ناویْ کە بەڕاستی بۆ خوا ب(صلح)یْ (أمین)بی لەگەڵ (دین) و (ملەت) و (دەوڵەت) .

﴿ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا﴾ تووشی (كفر) و (ضلال) و گومڕاهی ئەبن؛ (بالمرة) لە (سلك)ی (آبا)یان دەرئەچن، ئەوجا (یوم البعث) ئەخرێنە (نهر)ی لە (أسفل)ی (جهنّم) کە پیْ ی ئەڵێن: (غَيّ آثام) " ئەمەش لام وایە (لقط) پەرستینە لەبەر (يلقونَ)، (أمّا) بە بیر (مناسب) ترە، (ذاتاً) (روایەت)ی (هکذا)یی هەیە، خوا (نُقّال) آن (حفظ) کا لە (غنْی) ﴿إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ﴾ بیْ (شوب) و (شك) ﴿وَعَمِلَ صَالِحًا﴾ (حقاً) (إیمان) بیْ (عمل)ی (صالح) بە (إیمان) (صالح) نیە﴿فَأُوْلَئِكَ﴾ ئەوانە ﴿يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ﴾ خوا (توب)ەیان لیْ (قبول) دەکا، دەچنە بەهەشت ﴿وَلاَ يُظْلَمُونَ شَيْئًا﴾ ئەوی رابردی (قلم)ی بەسەر دائەکێشیْ ﴿جَنَّاتِ عَدْنٍ﴾ ئەوانیش ئەچنە (جنة العدن) ﴿الَّتِي وَعَدَ الرَّحْمَانُ عِبَادَهُ﴾ (عباد)ي خۆی (مؤمن)ی (صالح) ﴿بِالْغَيْبِ﴾ (ذاتاً) (إیمان) ئەبی بەشتی (غیر) (مرئی) بیْ، پێش چاونەبیْ، ئەگەر دیترا لە (إیمان) دەرئەچیْ ﴿إِنَّهُ﴾ خوا ﴿كَانَ وَعْدُهُ﴾ (وعد)ی (إلهي) ﴿مَأْتِيًّا﴾ (تخلّف)ی نیە، دێت ﴿لاَ يَسْمَعُونَ فِيهَا﴾ لە (جنّەت)یْ دا ﴿لَغْوًا﴾ قسەی بیْ (فائد)، هەرزو گۆیی. چەنەبازی لەوێدا نیە﴿إِلاَّ سَلاَمًا﴾ (سلام) لەوی (ولَوْ) لە (ملائكەت)آنەوە، بە (لَغو) (حساب)ە، زێڕا بەهەشت جیْ ی (آفەت) نیە، گۆی یا وەك (بعض)ە (کلمە)یە ئەکەنە (مدار)ی (کلام) وەکو (هین)، (هەرامە)، (عەیب نەبی)، (ئیشتە)...

﴿وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ﴾ شایانی وان ﴿فِيهَا﴾ لە (جنات) ﴿بُكْرَةً وَعَشِيًّا﴾ سبەینیْ و ئێوارە. (طبیعي) ئەوانە بە (دائم)ی ناخۆن لە (مقدار)ی (محدود) (مثلا) لە

(قدر) (٢٤) سعات دوو (دفعه) ئەخۆن. ئەوی (أوّل)ی خواردنی هێشتان، ئەوی دوایی وەك شیوی ئێواران؛ با ئەو شەوو ڕۆژی (دونیا)یە لەوێ نەبێ؟ وە (بعض) ێ ئەڵێن: "(مُراد) (دوام)ی (رزق)ە" (أُكُلُها دائم) بەڵێ وایە (أمّا) لام لێرە ئەمە خۆی نیە. ﴿تِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي نُورِثُ﴾ (أنَّهُ) (مُلك)ێ (لازِم) ئەبێ هەر ببێ، وەك میرات (قابل)ی (ردّ) و (رجوع)ی نیە، (تمليك)ی (قَهرى)یە، ئەو (جنّەت)ە ﴿مِنْ عِبَادِنَا﴾ لە (بَين)ی (عباد) و (عَبيد)ی ئێمە (إرثا) ئەیدەینە ﴿مَنْ﴾ کەسێ ﴿كَانَ تَقِيًّا﴾ بۆ (أهل)ی (تقوى) (إرث)ە (مال)ی خۆیانە، بۆ (تائب)ی (بعد إتباع)ی (شَهوات) (دخول)ە؛ دیارە (فرق)ی زۆرە؛ (ناگَرد، چوگردە؛ گردەچون، ناگردە) نابی ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلاَّ بِأَمْرِ رَبِّكَ﴾ ئەو فەرمایشە ئی کێ یە؟ (جَمهور) ئەفەرموون: " ئی (جبريل)ە " لە چ (مقام)آ ئەیلێ؟ (زمخشرى)، (فخرالدينى رازى)، (بيضاوى) تا (سيّدي آلوسي) ئەڵێن: "کە (سؤال) لە (رسول) کرا، لە (روح) و (ذو القرنين) و (أصحاب الكهف)، فەرمووێ: "(جواب) تان ئەمەدەوە" با (وجود)ی (زمخشري) ئەفەرمووی: "بە ئومێدی (وَحى) وای فەرموو" (جواب) (تأخير) بوو، (قوم) دەستیان کرد بە قەشمەری و گەمە بە پێغەمبەر، دڵی سەخڵەت بوو؛ (بعد كل ذلكَ) (جبريل) (نازِل) بوو، (جناب)ی (رسالەت) فەرموی: بۆ نەهاتن؟ (ظن) م (خراپ) بوو " فەرمووی:" ئێمە (مأمور)ین، چۆن (أمر) کرا، وا ئەکەین" جا ئەو (آیەت)ە (نازل) بوو— (سبحان الله)— دەستیان لەو قسە هەڵ نەگرت. لە (عبارەت)ی (قرآنى) (سؤال) لە (أصحاب الكهف) نیە؛ (عبارەت)ی (قرآنی) (صَريح)ە، پێش (سؤال) خوا پێی فەرموە: " (سؤال)ت لێ ئەکەن بە (مُضارع) (جواب)یان وابدەوە» (حقّا) شایانی (حال) و (موقع)ی (رسالەت) ئەمەیە؛ خوا ڕێ نەدا لە (جواب)ی ئەو (نوع)ە (سؤال)ە بەگوێرەی ئەو (حال)و (مقام)ە (رسول)ی (مُجتبا) دامێنێ، (إنتظار)ی (وحى) بکا!

(ماجَری) (دائِر) بە (خصوصیّات) خۆی نیە؛ (عائِد)ی (رسالەت)ە ئەگەر (مُرسَل) نەیزانی ئەبێ (مُرسِل) بە گورجی (جواب) بدا بەڵکوو پێش (إعلان)ی کات (وَلا تقولَنَّ لشيءٍ) ئەو (الآية) لە (سورە)ی (کهف) بۆ ئەوە؛ ئەو (آیەت) (سورە)ی (والضُّحی) ئەمە چ بوو؟ پێغەمبەر چی لێ (صادِر) بوو؛ (مُوجِب)ی ئەو (تأخیر)ە نایە (خێر) بێ؟ (معَ أنَّـهُ) تەماشای (مُناسبە)ی (مَقام) کە، چ (ملایَمە)ی لەگەڵ ئێرە هەیە؟ (صاحب)ی (کشف) بە (کشف)ی پڕ و پووچ، (توجیە)ێ نا (وَجیە)ی کردیە؛ مەرەکەبی لێ (خسار) ناکەین.

بۆ (مناسبە) (ابومسلم بنِ حرب) ئەیکاتە فەرموودەی (أهل)ی (جنّەت)، (یَعنی) بچینە هەر کوێ یە لە بەهەشت، بی کەینە (منزل)هەر بە (أمر)ی خوایە، وە لە (لطف) و (مرحمەت)ی (مالك)ی ((أمور)ی ئێمەیە، هەرچی هەیە ﴿لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَلِكَ﴾ لێرە قسەی وان تەواو ئەبێ. لە (طرف) (باری) قسەیان (تصدیق) ئەکرێ، ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ﴾ (خِطاب) لەگەڵ پێغەمبەر ﴿نَسِيًّا﴾ آگادارە، هیچ شتی لەبیر ناچێ؛ (لکن) ئەو قسەش (مَردود) لە (طرف) قاضي (عبدالجبار) (معتزل)ی و (سائر)ي (مُحّقِق)ینان (تزییف) کراوە. (أمّا) لەسەر ئەو (سفسەطە)یەش لام لە (قول)ی (جَمهور) چاکترە؛ (أمّا) (إتصال)ی بە (آیەت)ی (صدر)ی (سورەت) (إنّما أنا رسُولُ ربّك) بە (خطاب) لەگەڵ (مریم)ە، (حقیقة) (قول)ێ نا (مُتّصِل)ە ئەوی (فَهم)ی (خِطاب)بکا، ئەو قسە ناکا. (مادام) هەر گولێ ئاوازێکی لێ دێ، با منیش شتی (عرض) بکەم؛ ئەڵێم: " بەڵێ فەرموودە، فەرموودەی (حامل)ی (وَحی)یە؛ (أمّا) (جواب)ە بۆ (سؤال)ی (خاتم الرسل)، ئەفەموێ" " ئەی (جبریل) ئەو نوێژنەکەری، بی تارەتی (تابع الشهوات) ئەڵێن: "(آیەت)ی (إلهی) بۆ ئەو (رُسل)ی (کرام)هاتوە، بۆ ئەوانە (شفاعەت) ئەکەن، (اولاد)یان (مُعذّب) نابن، حتّی ئەڵێن: "(بأسم الأب و الأبن وروح القدس) (آیەت)ی خوایە، سەر (لَوح)ەی (إنجیل)ی (عیسی)یە" (سیّد)ی (أملاك) (جبریل)ی (أمین)

ئەفەرموێ: " (حاشا ثم حاشا)، ئێمە دێ ینە خوار، بە (أمر)ی خوای توو، کە خۆی ئەزانی چت پێ ئەفەرموێ؟ کووت (إرشاد) ئەکا؟ خۆمان هیچمان پێ ناکری. کەسێ خوا(إختبار)ی کرد بو (رسالەت) ئەوەی فەرمووی، بۆی ئەبەین، بەهیچ (وَجە) ئێمە دەسەلاتمان نیە وە (جناب)ی (حق)یش (علم)ی (محیط)ە، (مُنزهە) لە (نسیان) ئەزانێ چی ئەنێرێ بۆ کێ ی ئەنێری. بۆچی ئەنێری؟ (مُرسِل الرسُل) (هادي السُّبل) کوو (آیەت)ی (شِرك) و (ضلال) و (إفساد)ی (أخلاق) و (اعمال) بو (رسول) آن ئەنێری؟! ئەو (سیئّات) (إرسال)ي (رُسل)ی پێ ناوێ. (مَیل)ی (بشر) (کافی)یە؛ (إرسال) بۆ هەڵکەندنی و (مُقله) بی(کفر) و (شرك) و (سیئات)ە، نەبۆ (معاونە) و (تقویە)ی. ئەو (ربّ)ی توو ﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ (ربّ)ی (جمیع)ی (موجودات) و (کائنات)ە؛ دیارە (مَلك) (منزّە) نین لە (مکان) و(جهات)؛ (ذاتاً) (جسم)ن (مُشکّل)ن (محدود)ن؛ (تجرد) بەس بۆ خودایە؛ خوایە بێ (شریك)ە ﴿فَاعْبُدْهُ﴾ (وَحْدَهُ لاشریك لە) ﴿وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ﴾ خۆ بگرە، (قَلباً و قالباً) ﴿هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيًّا﴾؟ تا بیکەی بە (شریك) و (عبادەت)ی کەی؟ کەسێ بێ باب بێتە (وجود)، (بعض)ێ. (أعجوبە)یە بکا، ئەبێتە (مِثل)ی خوا؟ (ألعیاذُ بالله)!

﴿وَيَقُولُ الإِنسَانُ﴾ خاصّة ئەوانەي تابعي شَهَوات ئەبن، تاکو لە لەزەتي گوناهیان بێ کَدَر بن. ئەڵێ: ﴿أَئِذَا مَا مِتُّ﴾ مردم و رزیم. ﴿لَسَوْفَ أُخْرَجُ حَيًّا﴾ کەوابێ إنکاري قیامەت کە! باوڕەکە لە تَحقیقاتي علمیەوە بێ، لە هەوای نَفْسە! چی ئەکەي، بیکە، لە سبەي مەترسە! ﴿أَوَلاَ يَذْكُرُ الإِنسَانُ﴾ ئەو نَوْعە! ﴿أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ﴾ پێش حاڵی حاضري، پێش مَوْت بَعْثي. ﴿وَلَمْ يَكُنْ شَيْئًا﴾ چی وا نەبوو بە شت حساب بێ. لە مَوداو عَناصر خلق کرا، لە أجزا هەیکەلی دروست کرا، بَعْدَ التَّرکیب، تَحلیل ئەبێ، بَعْدَ التَّحلیل، تَرکیبْ ئەکرێتەوە! چی تیاهەیە موجبی إنکار بێ؟ رجا ئەکەم ئەی برا دەرینە إیمانتان بە بَعْث هەبێ! إیماني بە قووەت بە رۆژی جَزا، مایەي سەلامەتیە،

لەگەلیٚ سَيِّئات و جَهالات إنسان ئەگێرێتەوە. حەق وایە بۆ حیاتیٚ مَسعودانە، سَعي كەين! ﴿فَوَرَبِّكَ﴾ قَسَمْ بەخواي تـوو ﴿لَنَحْشُرَنَّهُمْ﴾ ئەوانـەي إنكـاري حَسْمي حياتی نَشْأتي ثانِيَّە ئەكەن. جَمْعيـان ئەكەينـەوە لـە مەيدانی مَحْشَرْ. ﴿وَالشَّيَاطِينَ﴾ ئەوانـەی دەرسـی گومڕاهيـان پـیٚ ئـەڵێن دائـرْ بـە حَشْر و نَشْر حساب و عقـاب، شُهاب ئەهاوێنـە دڵیـان، ئـەيان گـۆڕن !﴿ثُـمَّ﴾ پـاش حَشْرْ ﴿لَنُحْضِرَنَّهُمْ﴾ هەموويان ﴿حَوْلَ جَهَنَّمَ﴾ لەدەوري.﴿جِثِيًّا﴾ حاضريان ئەكـەين لەسەر ئەژنۆ چۆك دا ئـەدەن ﴿ثُـمَّ﴾ بَعْدَ الأحـضار ﴿لَنَنـزِعَنَّ﴾ ئەهێنينـە دەر ﴿مِنْ كُلِّ شيعَةٍ﴾ جماعتی دوای يـەك كـەوتوو، بـە تَقْليـدی ضَـلالي! ﴿أَيُّهُـمْ﴾ كاميان ﴿أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَانِ عتيًّـا﴾ دوور، وە لـە طاعـەت بـە عـصيان تـر، روو ئەسايەكانی ضالّ و مُضِلّ ﴿ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ﴾ لە هەموو كەس. ﴿بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَـى بِهَا﴾ بە جَهَنَّمْ.﴿صِلِيًّا﴾ برژان، چێشتنی گـەرمـي ئـاگري. تەماشـای نَـسَبْيان ناكریٚ! حەزئەكەي إخْتِلافِي (نَحْوي)يـان بزانـی؟ لـە إعرابـي بنـاي (أيُّ) (ويـيُّ)، تەماشـاي (روحُ المعـاني)بكـە! ﴿وَإِنْ مِـنْكُمْ﴾ نيـە. ﴿إِلاَّ وَارِدُهَـا﴾ ئەچـنە نـاو جَهَنَّمْ. نابیٚ عام بیٚ لە هەموو بَشَرْ، حَتَّا رُسُلُ أنبيا و صَدّيقين! ﴿كَانَ عَلَى رَبِّـكَ حَتْمًا﴾ أمْري لازمە، ئەبیٚ ببیٚ!﴿مَقْضِيًّا﴾ إنْفاذ كرايە، چارەي نيە. ﴿ثُمَّ نُنَجِّـي الَّذِينَ اتَّقَوْا﴾ مُقـابلي ظالمـە. ئەوانـەي بُعْدَ مُتابَعَـةِ الـشَّهَوَاتِ تـوْبـەيان كرديـە، لەگەلیٚ عاصِياني ظالِمي مُتَجاوِز لە حَدّي نەكەڕايەوە، با بچنە جَهَنَّم، دَرْكي أَلَمي بكەن، پاشان نَجاتيان ئەدریٚ، داخلي بەهەشت ئەبن!! موُجِبي زێدە شُكرە بۆ تائِبان، وەزيدە حَسْرەتە بـۆ عَتـيّ و عاصـيان! ﴿وَنَـذَرُ الظَّـالِمِينَ فِيهَـا جِثِيًّـا﴾ لێيان ئەگەڕێين تركيان ئەكەين لەناو نارِ جَهَـنَمْ، عَلـى الرُّكْبِ، جێـی ڕاكشان و راحەت و دانيشتنيان نيە. ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَـيْهِمْ آيَاتُنَـا﴾ زێـدە ئـەو آيـاتي وَ عْدي مؤمن وَ عيدي كافري تيايە! ﴿بَيِّنَاتٍ﴾ ئاشكرا و مَفْهوم و مَعْقول. ﴿قَـالَ الَّـذِينَ كَفَرُوا﴾ أعْمدە واصْنمە وَ أساطِينْ و مَرَدَيْ كُفْرو ضَلال و إضْلال.﴿لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ دەربارەی وان خاصَّةً فُقَرايـەكان. ﴿أَيُّ الْفَـرِيقَيْنِ﴾ كهيـەيان لـە ئێمـەو ئێـوە.

﴿خَيْرٌ مَقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا﴾ مَكان و مَنْزِل و مَنْزِلەت و مَجْلِس و نادي، جوانترە! چاكترە! بلّندترە! خۆشترە! تەماشاى حالّى حاضرکەن لە چ ناخۆشى دان؟! رۆژى وا پەسين، قَصرو قَصوريان ئەبێ، باغ و باغات و غِلمان و حووري بە هەشتێ، پڕ أساس، خارج لە حَدّ و قِياس، بۆ ئێمەيە! ئەوێ ڕۆژێش لە چ حالّدان، رووت و رەجالْ و بێ حورمەت، ناتوانن لە جێگايەك بەأُلف و مُحَبَّة گرد ببنەوە، حَقاً قسەێ جاهِلانە مَغروانە! مَعَ أَنَّهُ ئەوانە نَظَر بە حالي خۆش و مَقامي بلّندو مَجْلِس ئا راستي أقْوامي تر، قەسپ فرۆشن! بەقەدەر فرّاشىێ وان، لەزەت و عَيْش و نۆشيان نيە! وە هەموو کەس ئەزانێ دونيا فانيە، أحوالاتي مُتَبَدِّ لە! کەسێ ئەمرۆ دەولّەمەندە، سبەی لەبرسان ئەمرێ! ئەمرۆ فَقيرە مسکينە، پاش چەندێ ئەبێ بە (أبو المليون) و (وَزير) بەڵکو شاه و مَلِك! تەماشاى سَيْري أنام بکە ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُمْ مِنْ قَرْنٍ﴾ خوا ئەزانی (عَدد) و (عُدد)يان ﴿هُمْ أَحْسَنُ أَثَاثًا﴾ (تجَملات)ی (بيتيّە)؛ (فرش) و (سرير) و قاپ و قاچاغ و زێڕو زيوو فەخفوری و (أحجار)ی (کريمە) ﴿وَرِئْيًا﴾ (حُسن)ی (مَنظر)ی (نظارەت) لە خۆشى ولّات و (مناظر)ی (حسنە) لە کێو و کەژوو باغ و داغ و خيابان و بيابان، شيوو دۆلّی بە ئاوو داروبار؛ (حُسن)ي (مَنظر) ئەدا. هەر (مَوقع)ێکی ئەڵێ و (قِطعە)يەکە لە (جَنّەت). لە (أيّام)ی (طرب)و شادمانی (خيمە) و بارەگاهی تيا بەرپا ئەکەن، بە (أنواع)ی (لذائذ) چەندی بەسەر ئەبەن. بە (طِران)ێ کە (وليدی بن مغيرە) و (أمثال)ی بە خەونيش نای بينن﴿قُلْ مَنْ كَانَ فِي الضَّلَالَةِ﴾ تيای رۆ چوويی ﴿فَلْيَمْدُدْ لَهُ الرَّحْمَـٰنُ مَدًّا﴾ بەدوای (مَد)؛ ئەوی ئارەزووی بوو، بۆی بەجێ بێنێ، (عُمر)ی درێژو (ثروەت) و سامانی زۆر، (أولاد)ی (أقويـاء)، ئەويش (كيفما يشاء) (تـصرف) و (تلـذذ) (تمتع)يان پێ بکا تاکو ﴿حَتَّىٰ إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ﴾ ئەبينن ئەوەی (وَعد)يان پێ دراوە؛ (مُوعود)﴿إِمَّا الْعَذَابَ﴾ لە (دار)ی (دنيـا) بـە (أنـواع)ی دەردو بەلاو (نقـص)ی (أمـوال) و (أولاد) و (إستيلا)ی (مـؤمن) ﴿وَإِمَّا السَّاعَةَ﴾ (مُتبـادر)

(قیامەت)ە (ممكن)ە (شامل)بی بۆ (مَوت)، چونكی (مَنْ ماتَ فَقَدْ قامَتْ قیامتُه) (أمّا) نالێ (ساعتُه) ﴿ فَسَيَعْلَمُونَ﴾ (لدي المعاينه) ﴿مَنْ هُوَ شَرٌّ مَكَانًا﴾ (من الفريقين) (معلوم)یان ئەبێ (مقام)ی (أحسن)یان بە (شرّ المكان)بۆ (تبدیل) كراوە ﴿وَأَضْعَفُ جُندًا﴾ لەشكرو سوپاهو (خدم) و (حشم) و (نَدی) لە كێ؟ چ جایە (ضعف)، هیچیان نامینێ.

(كُفر) كە بوو بە (مَلكە)یە (راسخە)ی (غایەت) (قَوی) (جنابی حق) بەو گوێرەیە بۆ خاوەنی؛ (فروع) و (مقتضیات) و (لوازم) و (مناسب)ی بۆ ڕێك ئەخا،(خلق) ئەكا. دڵیان مۆر ئەكرێ، (غیر)یعنی نكر (إیمان) چیتری تیا (نفوذ) ناكا،بۆیە (علی الدوام) (سعی)یە (بلیغ) ئەكەن لە دوژمنایەتی دین و (صاحب)ی (دین) و (دیندار) ﴿وَيَزِيدُ اللَّهُ الَّذِينَ اهْتَدَوْا هُدًى﴾ (فەقیر) و دەوڵەمەند و (ضعیف) و (قوی) و (فەرق)ی نییە كە (هیدایەت)ییان بوو(قبولێ)یان كرد خوا بۆ یان (زیاد) ئەكا تا ئەگەنە (مقام)ی (رسوخ) كە (إیمان) بە (قوەت) بوو ببێ بە (ملكە) كە بە هیچ شت (تزلزُل) ناكات .

هەرچەند قسە لە دوو (فرقە)یە، (مؤمن) و (كافر)، (أما) (حسب المقام) لە (كافر)ی (عریق) (ڤی كفر و الضلال) كرایە لە (مؤمن) (نظر) بە (أصل)ي (هدایت) بۆیە (إستئناف)ی ئەم (كلام)ە بە (إتباع)ی (أبو سعود) لای (حقیر)(مختار)ە وا دەردەكەوێت (سیدي آلوسي) (إختیار)ی فەرمووبێ نە (عطف)ي( زمخشری) نە (بیضاوی) لام خۆش نییە.

﴿وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ﴾ (أمور)ي (نافعه)ی (دائم الاثر) (ذكر)ي زوبانی لێرە جێی نییە ﴿خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا﴾ پاداشتی چاكترە چاكە ماڵ بێهودە (صرف) كردن بێ خێر و بێرە كۆكردنەوەی هیچە﴿وَخَيْرٌ مَّرَدًّا﴾ (مرجع)و دوایە ئەگەر چی ئەو (سفها)یانە بە (خراپ)ی ئەزانن ماڵ لە ڕێی خوا (صەرف) كردنیان لە (ضایع) و فیڕۆیە، ئەمڕۆ گەلێ كەس لە (أمم)ی (راقی)ە (سعی) ئەكا بۆ هەزار ساڵ پاش ئەمڕۆ كە (أنجال)ی (آتیية) (خێر)ی لێ ببینێ وا (حساب) ئەكەن

هەزار ساڵ بۆ (عمر)ی (ئومەت) وەکی ڕۆژێکە بۆ عمری (شخص)ێك لازمە سعی بۆ بکرێت (أمّا) ئەو (فكر)ە لای ئێمە (کوفر)ە ئەمڕۆ سبەی (قیامەت)ە ئەو تێکۆشینە (جنەت)ە ئەوەش بۆ (ئومەت) بیّ (رغبت)یدا لە ﴿وَالْبَاقِيَاتُ﴾ی ﴿الصَّالِحَاتُ﴾ کە (نوات)ی گەورە گەورە بە (بعض)یّ (کلیمات)ی (ذکر)ی (تفسیر)ی ئەکەنەوە وەکی (سبحان الله) و (الحمدلله) (لا إله إلاّ الله) بڵێین چی (سبحان الله).

﴿أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا﴾ (أنه) (آیاتی) (بعث)و (حشر)و(نشر) و (ثواب)ي (أخروي) وەك (ولید) و (أمثال)ی ﴿وَقَالَ﴾ لە ڕووی قەشمەری ﴿لَأُوتَيَنَّ﴾ (لاشك) ﴿مَالًا وَوَلَدًا﴾ زۆر لە وێش (ثروت) سامان بۆ من ئەبیّ ، ئەدرێتە من. ﴿أَطَّلَعَ الْغَيْبَ﴾ ئایا ئاگاداری بووە لەسەر (غیب) (أمر)ی بزر گەیشتیتە ئەو (مقام)ە کە (علم)ی (غیب)ی ببی ﴿أَمِ اتَّخَذَ عِندَ الرَّحْمَٰنِ﴾ (سبحان الله) ﴿عَهْدًا﴾ خوا (تَقَبُّلي) لەگەڵ دایە لە قیامەت ماڵ و( وَلَدي) بداتیّ، بیکا بە (صاحِبي حَشْمەت) وجاه، وەکی داری دُنیا، مَعَ أَنَّهُ ئی دونیایشی لە خوا نازانیّ. (سُبْحانَالله) مَسْلَكي قُرانی چەند پڕ حکمەتە! بۆ کەسیّ (عاقِل)، لە (مَواقِعي) مُناسبە، سُلوکی تیا بکا! ئەوانە بە (إِسْتِهْزاء) ئەڵێن: جەنابی حەق جەوابیّ مناسبی جدّیان ئەداتەوە خُطَبای زۆر بلیغ، مُقابلی مُستَهزِئی، خۆ ناگرن! جوابی مُسْتَهْزِئانەیان ئەدەنەوە. قسە لە خوانیە، هونەر لە سعەتی صَدْری رسالەت پەناهە! ﴿كَلَّا﴾ رَدْع و زَجْرە، بەسیە بەس‌کە! (کلا) لەنصفی پێشوو نەبوو. ئەڵێن (حَجّاجْ) سووار ئەبوو، پێی لەڕکێفێکی نابوو پیرەژنیّ دوعای لیّ کرد ووتی: «نەبوویی هەروەکو (کلا) لە قُرانی سەرەوەدا نیە»، (حَجّاجْ) تاپێی دی خستە ناو ڕکێف، هەموو قُرانی ژووروی بە سەر دڵدا هێنا، ووتی: «پیرێژن ڕاست ئەکا (کلا)ی تیا نیە»!. ئەمە هەر نەئیسە، ئەگەرچی نایەتەدڵ، أمّا شەو ڕۆژێ (٣٠٠,٠٠٠) سێسەد هەزار خَتمي قُرآن کوو بە وەم و

خيالْ دادىٚ؟! وەهەم ئەرێن پيرەژن بزانىٚ (كلاَّ) لەنصفي أوّلي دانيە، كوو (حَجَّاجْ) نايزانىٚ؟! نەخێر نابىٚ، حجّاج زۆر بە قُرآن خەريك بووە!.

لە نصفي آخير لە (٣٣) مَوقِعْ (كلاَّ) ذكر كرايە_ تفصيل لە (روُح المعاني) طَلَب بكە_. ﴿سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ﴾ نَوْعە نووسينىٚ بووە وەك نووسينى ئێستا نيە. ﴿وَنَمُدُّ لَهُ مِنَ الْعَذَابِ﴾ لە بَدَل مال و وَلَدْ. ﴿مَدًّا﴾ مدّىٚ غَيْرە مُتَناهى. ﴿وَنَرِثُهُ مَا يَقُولُ﴾ مالْ و وَلَدى دونياى ئە بىٚ بە ميراث، بەجێى دێڵى، خڕو پاكى لەفيڕۆ ئەچىٚ، چى بۆ نامێنىٚ. ﴿وَيَأْتِينَا﴾ يَومَ القِيامَة. ﴿فَرْدًا﴾ تەنها ڕووت و ڕەجال، نە مالْ نە وَلَدْ. أهلى بەهەشت ولديان ئەبىٚ، نابىٚ، خلافيانە! ئەگەر بە قاعدە قسان بكەين، مادام موت نەبىٚ، توالُديش نابىٚ! مُمكنە وَلَدْ بوون بە خاطرى أهْلى جنّة نەبىٚ، تاكو ئارەزووى بكەن! ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً﴾ زۆر، مُتَعَدّد. ﴿لِّيَكُونُوا﴾ إلهەكان. ﴿لَهُمْ﴾ بۆ وان. ﴿عِزًّا﴾ ڕەنگە وا بزانى كَثْرتى إلاه، وەك كَثْرتى مالْ و وَلَدْ، عزّەتى تيايە! تەماشايى (نحل) كەن بە غريزە ئەزانىٚ، عزّەت لە وَحْدَتى رئيس دايە، حتّا بۆ إتّفاقى كلمەيان، ئەگەر شاهزادە مُتَعَدِّد بوون، يەكىٚ إنْتخاب ئەكەن، ئەوانى تر ئەكوژن. ﴿كَلَّا سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ﴾ نسبەتي إضافە، بۆ عابد و معبودە!

وكذا ﴿وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾ هەر دوو مَعْنا ئەبەخشىٚ، گەرچى كُفرو ضدّايەتى ئەوانە، بۆ إلاهيانم لا خۆشترە! ئەمڕۆ عبادەتيان ئەكەن، سبەى ئەبن بە عدويان! ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ﴾ ئەمە نوعە ارساليكە، غَيْرى إرسالى تَكْليفى. ﴿عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ تَبَعە و بَقِيّە كانى پێشەواى نافذُ الكلمە، شَياطيني الأنس، يا جنّ و كهنەو رُؤساي دينيان ﴿تَؤُزُّهُمْ أَزًّا﴾ هانيان ئەدەن، إغرايان ئەكەن، هَيَجانيان پىٚ ئەدەن، بە تسويلات و وسوسە زۆر سەغڵەتيان ئەكەن، بىٚ فكروهۆش و لێكدانەوە، قسان ئەكەن ﴿فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ﴾ تالووكەيان لەسەر مەكە بۆ ئەوەى بە هيلاك بچن مُهلەت نەدرێن! حياتيان زەرەرە بۆ دين و دونياي عباد. ﴿إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا﴾ أنفاسيان ئەژمێرين،

ژمارەیٚ آخـري، درەنـگ، یـا زوو! إشـارەیـە بـۆ لـەکـۆڵ بوونـەوەیـان! یـاخود أعمالیان حساب ئەکەین، تاکو لە ڕۆژي میعاد، پاداشیان بدەینەوە.

﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ﴾ ئەگەر مَعنای نەگۆڕین، معنای (مُتَّقي) دیارە! مَـعَ أنَّـهُ بڕواناکەم مُجَرَّدي تقوا لە شرك، مُتَّقي بگەێنێتە دەرەجەیٚ، کەجەنابي کِبْریـائي حـشریان بکـا! ﴿إِلَـى الـرَّحْمَنِ وَفْـدًا﴾ کۆمـەڵـە سـووار. بـە سـوواري بـۆ طَـرَفِي ڕەحماني بیٚ إمْتِنَـاني دونیـا و قیامـەت، کـۆ ئـەکرێنـەوەو ئـەچـن. سـوواري چ دەبن؟! سوواري حوشتر، لە حوشترەکانـي بـەهـەشـت! لاشك ئـەوە بـە نَظَـر مُعتاد و مَأْلوفِي حِسّي ئەگوترێ. بَعْضي ئەڵـێن: بـە سـوواري حوشـترو وولاغـي بەرزەو سُفُن. أمّا نازانم بحر نهر لە مەیداني عرصات هـەیـە، بـە سفینە عبـوري لیٚ بکەن؟ ئەمڕۆ با، ئـەیانفـەرمـوو: بـە سیّارە بـە قِطـار بـە طَیّـارە بـە سُـفُني هَوائي! ﴿وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ﴾ ئەیان ئـاژۆێین ﴿إِلَـى جَهَـنَّمَ وِرْدًا﴾ تـێنی. وەکـي خەرگەلەي کاران لێیان ئەخوڕین بۆ مَنْهَلي جَهَنَّمي. ئەونوعە مُتّقیانـە دیـارە لـە دەوري جهنّم لەسەر ئەژنۆ دائەندرێن، ناچنە ناو جهنّم! ﴿لَا يَمْلِكُونَ الشَّفَاعَةَ﴾ برّو فاجِرْ، مُتّقي و مُجرم، چاك و خراپ، نە پێیان ئەکریٚ نـە بۆیـان ئـەکـریٚ. ﴿إِلَّا مَنِ اتَّخَذَ عِندَ الرَّحْمَنِ عَهْدًا﴾ (عهد)ی لە خوا وەرگرتبی، ئەگەر گوناە بکـا، تکاکاریٚ تکای بۆ بکا، وەخوا (قبول)ی بکا، (عهد)ی لە خـوا وەرگـرتبـی، تکـا بۆ گوناە کار بکا، خوا (قبول)ی بکا، آیا ئەو (عهد)ە هەیە؟

قـسە زۆر کـراوە لـە (شـفاعەت)، لای (مُعْتـزلی)یـان نیـە،(إلاّ) بـۆ (نَیْـل)ی (دَرَجات)، بۆ (عطف)ی گوناە نیە. لای (سُنّي)یان زۆر (مَبْذول)ە، لای بـەنـدەی (حقیر) ئەوەی بە (إتّکال)ی (شفاعەت) گوناە بکا، لیٚ ی(محروم)ە؛ (شـفاعەت) بـۆ (أهـل)ی (کَبـائر) وەکـی (صـلاح‌الـدین)، (سـلطان‌محمـودی سـبکتگین) وە (سلطان‌محمدی فاتح) (مُقرّر)ە ئەبیٚ ئەوانە (بَعض)ە گوناهی گەورە بکـەن، وە (إلاّ) گەلیٚ ئیشی گران و گەورەیان (مُعَطل) ئـەبـیٚ، (فُتوحـات)یـان بـۆ نـاکریٚ. (حَقیقةً) شایانە (رسول)ی (أکرم) بۆ ئەو (ذَوات)ی (کرام) ببێتە (شفیع). (أمّـا)

کەسێ سەرسەری، بێخێر و بێر (فاسق) و (فاجر)، دزو ڕێگرو (سَفّاك) و بێباك، (بجميع)ی (معنى الكلمة) (مُضِرّ) بۆ (مسلّمانان)، نازانم چۆن ڕێ ئەدەن، ئەو تكايەيان بۆ بكرێ؟!

(جنابی رسالەت پەناه)، كوو تكا بۆ ئەوانە ئەكا ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا﴾ ئەوانی (مُشرِك)(عَلى الإطلاق) ژن و (ولد) بۆ (إلە)پەیا ئەكەن، وە (حرب) ئەخەنە (بین)ی باب و كوڕ، یەكێ لەوان (إبليس)ە، كوڕێ بەد (سِیَنْ) (خارج) لە (إطاعه)ی باوكی ،(دائماً) لە (حرب) (وَالْحربُ بیَنها سِجال)، (لكن) (ظفر)ی (نهائی) بۆ باوكیەتی، لە (إعتقادیات)ی (ملایین) (إبلیس) كوڕی خوا نیە، (لكن) لە پەنجە بازی. بێ (قصور)ە، وە (قول) و (قُدرەت)ی بێ(حَدّ)ە، (أسرار)ی (أنام)ی لا (مكشوف)ە. ﴿لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا﴾ (شيء)ێ (عجیب)، (مُنكَر)ێ (شدید)، (قول)ێ (وهمی)، (صادر) لە (خیال)ێ، (خالی) لە (معنی).

(ذاتاً) ئەو (نوع)ە قسانە، لە زەمانی (عقل)دا نەكراین، دوایە بوو بە میراتی (معنوی)" (أخلاف) لە (أسلاف)ی وەرگرت، (علم) و (عقل) چارەی پێ نەكرا"

ئەم (قرن)ە پیّی ئەڵێن: "قەڕنی نوور" (لكن) (ظُلُمات)ی (عقائد) زێدە (شدّەت)ی ستاندیە، ئیش لە (فكر) و(محاكمه)دا نەماوە، بوویتە (قومیّەت) و (عَصَبیّەت) ﴿تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ﴾ نێزیكە ئاسمانەكان لەو قسە شەق و پەق بن ﴿وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ﴾ لێك بێتەوە" (رَبّی وا لێك بێتەوە لەباریەك دەرێ" (ذرّات)ی ببی بە(هبا)، جارێ تر خۆی نەگرێتەوە! كە ئەو(نوع)ە (مشركانە)ی تیا پەیا بوو، تیای ئەژیە ﴿وَتَخِرُّ الْجِبَالُ﴾ كێوەكان بڕمێن ﴿هَدًّا﴾ بە ڕمان. (خُلاصه) قسەیە ئەوەندە (عظیم)ە ئەوەندە گرانە، (أرض) و ئاسمان (تحمّل)ی ناكا، (لكن) (بشر) لەبەر بێ (فكری) بە (قُوەت)ی (جهل) و (میل) (تحمّل)ی كرد، وە(حِسّ)ی گرانی ناكا " بەڵێ (خیال) و زوبان و (قلم) شتیان لا ئاسانە. (ذات)ی وەكی (نظام) بێ (مبدأ) و (إنتظام) (حُكم) ئەكا لەسەر ئەو (عالم)ە" (عرش)و (كرسیّ) و (سموات) ــ و ما فیها، و أرضین ــ

بە (فنا)یَ (آنی) (وجود)یَ (جدید)ی (آنی)! (إبنمُنیر) (مُتکَبِّر)آنە ئەفەرموێ: "ئەو (عالم)ە (دلالەت) ئەکا لەسەر (وحدانیەت)ی (إلهی)، ئەو (مُعتقد)ە_ (ألْعِیاذُ) بالله_ (روح)ی (دلالەت)ی نایەلّیَ، (فَطْر) و (شَقّ) و (هَدْ) بۆ ئەو (إبطال)ە (إستعار)ە کراوە!"

من دیم لە (حاشیەی کشّاف) دلّم پێی (راضی) نەبوو، دووایە لە (روح‌المعانی)م دیت_ بعدالتقریر_ (إعتراض)ی لیَ‌ئەگرن. (دلالەت) لەسەر (وُجود)ی (خالق)ی (قادر)ی (علیم)ی (حکیم) ئەکا، (أمّا) (دلالەت) لەسەر (وحدانیەت) نیە، (جواب) ئەدەنەوە بە(بُرهان)ی (تَمانُع)ی وەك لە (تقریر)ی (خَیالی) (مشهور)ە (حقیقةً) (جواب)کێ نا(مُلائم). وە(بعض)ی ئەلّێن: "(دلالەت) (عَظَم)ی (شأن)ی (خالق) ئەکا، کە کەس (مُشابە)ی نیە، بیَ(مُدانی)یە" کە وابیَ واحدە" خۆت ئەیزانی چۆنە؟ مەلایەکانی نویَ ئەفەرموون: "( نِظام) و (إنتظام)ی (عالم) (دلالەت) لە (وەحدانیەت)ی (صانع) ئەکا".

ئەو تێك چوونە بوو ﴿أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَدًا﴾ وەکی (إنسان) و (حیوان)و (أشجار) و (نباتات)، ئەبیَ (قُوَه)یە (مُولِّد)ەی هەبیَ، وە ئەبیَ بە (آلەت)کێ (مادّی) (إنتقال)ی کا بۆ جیَ یەتر، تا (تکوّن) بکا ﴿وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَنِ﴾ لایەق نیە، (غیر)ە (مُمکن)ە ﴿أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا﴾ وە (إلاّ) (محکوم)ی (زوال) و (مُحتاج)ی جیَ نشین ئەبیَ ﴿إِنْ كُلُّ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ (انس) و (مَلَك) و (جِنْ) چی بە (خیال)تا دیَ (وقعە)یەکی هەبیَ ﴿إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْدًا﴾ هەمووی (عبد)ی خوان " عبدی مملوك، عبدی مخلوق، عبدی فعلوك، محکومی طبیعەت، داخلی نوامیس، و قواعدی مُسَخَّر و مُدبَّر، مُمکن و (مُحتاج)، بیَ دەسەلاتی، نا(علاج)، (عُبودیّەت)ی (فطري)یە، بۆیە (آت) ئەفەرموێ: " خۆیان دیَن، بە عبد و بەندەیی" ﴿لَقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا﴾ کەسی لیَ بزر نابیَ، هەمووی (مُحاط)ی (عِلْم) یەتی خۆی (خلق)ی کردینە، ئەزانی چەندن، چ

(حاجەت) بە (شريك) و (شفيع) و (ولد) ﴿وَكُلُّهُمْ﴾ (كُلّ)ی (فرد) لە " ﴿مَن فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ لە (عابد) و (معبود) ﴿آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا﴾ تاك و تەنیا، بێ خَدَم و حَشَمْ، بێ نصیر و شَفیع و معبود و عابد. معبودەکانیان لێیان جوایە ئەبنەوە، حاشایان لێ ئەکەن، با بعضەکیان لە معبودان بە کوکبە و دارا بێنە عرصات. خلاصە أهلی ضلال لە آخرەت لێك ئەبن، ئەبن بە ضدي یەك، رئیس و مرؤس، عابد و معبود، ئەگەرێن بە خصما و دوشمن. ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ باقیات و غیرە باقیات ئەوي بگونجێ لە عمل. ﴿سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ﴾ لە رۆژي جزا. ﴿وُدًّا﴾ مُحبّەت. ئەگەر لە دونیادا غلێکیان بووبێ، نامێنێ. ممکنة مغدور بیێتە تکا کار بۆ ئەوەي غَدْري لێ کردیە. رابطەي إیمان و خووي إسلام، مەیلي تَعْذیب نامێلّێ.

(هەمەوەند) عداوەتي (طالباني)یان ئەکرد، حتّا لە دەورەی تکیەي (شیّخ علي خالصي) کارانیان بە تالان برد. رۆژێ لە خزمەتی بووم ئەو باسە کرا ووتم: خوا بیانگرێ. فەرمووی: توخوا( کاك محمَّد) وامەلێ، یا خودا عفویان کەی، بۆ منیان عذاب نەدەي، (علي) کوێربێ ئەگەر ئارەزوو بکەم بۆمن خوا یەکێ لە أفرادي أُمّتي (محمد) (ﷺ) عذاب بدا.

مُقابله وا ئەخوازێ بیکەینە (وُدّي) قیامەت، گەرچی مُناسبە لەگەلّ حالّ و وەقتي موسولمّانان، کە لەو دەم زۆر ممقوت و مَبْغوض بووین، خودا بشارەتیان ئەداتێ بە نجاة وە ئەبنە محبوب، زاتاً ئەوەي سەرکەوت مَحْبوبە، کەس تێشکاوي ناوێ، وە مُمکنە عامّي کەین لە (وُدّي) هەر دوو سەرا، (وُدّي) خۆ بە خۆیی، (وُدّي) رەحمان بۆ وان، (وُدّي) وان بۆ رەحمان. لێرە حاجەت نیە، وە عامّە لە هەمو مؤمني چاك، هاي و هووي شیعاني پێ ناوێ! بە ندو بادي دیانان بێ لزوومە ! أکثري (وُدّي) موسولمّانان تێك ئەدەن، زاتاً مقصدیان ئەوەیە ! !. ئەمرۆ کە زەمانی نوشوستە، رابطەی إیمان سستە، باوڕ ناکەم بەحەق دووکەس لەبەر إیمان بە ڕاستی یەکتریان خۆش بوێ، هەر فرقە خۆو

شێخ و إمامی خۆی! رُأساي دين علی الدّوام سعی لە تفرقە ئەکەن عقڵی موسوڵمانان ئەشێوێنن، تابینە مسخری وان، أما ئەوە زۆر غلطە، ئەمڕۆ، سبەی، ئەو دارو دەستەیە نامێنێ!!.

چارەی موسوڵمانان تەرکی عداوەتە، محَبتّي إيماني و إجْتماعي کلمەیە، گردبوونەوە لە ژێر رایەتی (لا اله الاّ الله محمد رسول الله)یە! باقی‌تر لە حەقیان بلێین (تِلْكَ أُمَّةٌ قد خلت_ آلایة_) ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَاه بِلِسَانِكَ﴾ قرآن ناردوومانە، وە عبارەتی سهلە لە جهەتی فهم، زۆر مرام واضحْ ئەکا، جَوهَری أشیاء جوان بەدەر ئەخا ﴿لِتُبَشِّرَ بِهِ الْمُتَّقِينَ﴾ بالفعل یا مُهیّا. زاتاً ئەوەی مەیل و قلبێ خاوێنی هەبێ، قران تأثیری تێ ئەکا موسوڵمان ئەبێ، خیاسەت و قساوەتی قَلبی نیە کەبیبێتە مانعْ. ﴿وَتُنذِرَ بِهِ قَوْمًا لُّدًّا﴾ مل ڕەق، نەگەڕایەوە، خصمێ شديدُ الخصام، مُجادِلٌ بِالباطِلْ. توو دوامکە لەسەر تبشیر و إنْذاری ئەو قومە، ئەگەر هاتنەڕێ إیمانیان هێنا، باشە! وە إلاّ وای بە حاڵیان! ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ﴾ زۆر، بێ ژمار. ئەوانیش بەوانە مُلحق ئەکرێن ﴿هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ﴾ کەسیان حِس ئەکەی؟ ﴿أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا﴾ سرتە. یعنی کەسیان نەماوە ببیندرێ، سرتەی لێ ببیسترێ، بێ ناوو نیشان فەوتان بزر بوون.

## سورەتى (طه)

دواى سورەى (مَرْيَمْ) ئـەفـەرمـوون: مُتـصلاً سـورەى (طـه) لـه (مكّـه) نـازِلْ بووه. يەك، دوو، آية اسْتِثناء ئەكەن، له عـددى آياتى چـەنـد قـسـەيـان هـەيـە، (١٤٠) (شامى)، إلاّ (٥) (كوفى)_ يعـنى (١٣٥)، أوْ الاّ (٦)_ (١٣٤) (حيجـازى)! أوْ إلاّ (٨)،(١٣٢) (بصرى)! مع الأسف له هەموشت إختلاف ئەبىّ! ! سـەيـرە، إختلافيان به رەحمەت زانيوه ! إتصالى زۆر ظاهِرە:

﴿بِسم ٱللهِ الرَّحْمنِ ٱلرَّحيم﴾

﴿طه﴾ چاك (إستماع) بكە، گوىّ ڕاگراه، وەبزانە ﴿مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ﴾ ئەووى كە(يَسَّرْنَاهُ لَكَ)، نەك تا ئـەو ئـەسـكورد رەقانـه بترسێنى! ﴿لِتَشْقَى﴾ ماندى بـى، بـەخۆڕاى رەنجـەرۆبـى، پـتر ئێـوە لـەو (ذلّـەت) و (مَبغوضـيّـەت)دا بمێننەوە، (سبب) بە (إفترا)ى وانە (بُغض)ى ئێوە لـه دلّـى عـرەب شـێن بـبى، ڕووتان تىّ نەكەن، (إيمان) نەيەنن، چونكە (مُحقّق) ئەو (حالّ)ە (تبدّل) ئـەكـا، ئەبن بە (محبوبُ القلوب)، ئەوانە (منكوب) و خوار ئەبن، (دين) (إنتشار) ئەكا.

ئەگەر كەسىّ بفەرموىّ: " طَـهْ" بـه (مَعْنـى) (طَئْها)، هـەر دوو لاق لـەسـەر عەردى دانى " من نالّێم(جناب)ى (رسـالـەت) لـەسـەر لينگـىّ نوێـژى كرديـه، يـا خود له (تَهَجُّد) زۆر لەسەر پىّ ڕاوەستايه، تاكو پاى (مبارك)ى ئاوسايه، ئەوجا لاقەكى دادەنا، لاقەكى بلّند ئەكرد، (يعنى) گاه ئەو لاق، گاه ئەم لاق. ئـەوجـا ئەو (آيـەت)ە (نازل) بوو، با ئەو قسە لە (ذات)ىٚ زۆر گەورە (نقل) كرابىّ، (مَعَ أَنَّهُ) (كثرەت)ى نوێژ و (تَهَجُّد) لە (مدينه) پەيا بوو! (اَلْآنْ) جىّ ى نوێژو، پايـه

بەر زەمین پایە دەرهوا نیە !

(وقت)ی (تبلیغ)ە (شدّەت)ی (خصام)ە (خُصَماء) (لدوُد)ن، (عنود)ن، (جبّار)ن، (بالنِسّبة) زۆر بە (قُوەّت)ن، (مُعارِض)ن؛ (بَعض)ی (رسالەت پەناه ) و (أصحاب)ی ئەخەنە (قلوب)ی (عامّة)، خەڵکی (تنفیر) ئەکەن، لە (إیمان) پیّ هینان و(أتّباع)ی.

من ئەڵێم: " مککە و ئەرزی مککە بخەژێر قدمی خۆت، (رِقاب)ی ئەو هۆڵە ملانەت، بۆ نەرم ئەبی پیّیان لیّ نیّ، سەریان ئەکەوێتە بن پیّت.

(بعضي)ی ئەڵێن: " (طه) مەعنا یا فلانُ" (إبن عباس) و (جمع)یّ لە بزرگان ئەفەرموون: "یارَجُلُ" بە چ (لُغەت)کیّ بە (مەعنا) (یارَجُل)ە؟ یەکی ئەلیّ: " (نِبْطِی)" یەکی: "حەبەشی" (قیل)ی: "(عِبْري)" (قال)يَ: " سریاني" (بعض)ی: " (عەکل)" (بعضي)ي: "عكّ" حتّی لە (كلّي) (روایەت) کراوە «عکيّ بانگی بە (یارَجُل) بکەی (جواب) نادا تاکو نەلیّ ی (طه)». (إبن الأنباری) ئەلیّ: " (لُغەت)ی (قریش) (موافق)ی ئەو (لغەت)ەی کردیە" (أنّهُ) (راضی)نیە (غیر)ی (لغەت)ی (قریش) لە (قرآن) دابیّ. ئیتر تەماشاکە، (قال)و (قیل) و (إختلافات)، قسەی پڕ و پووچ لە (تفسیر)ی (کلام)ی خوا (حقیقةً) (مشقّەت) و ماندی بوونی خوارییە ! ﴿إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ﴾ بترسیّ، دلّ نەرم بیّ، لە (فطرەت) دوور نەبووبی، کەسیّ بیّ، (قساوەت)ی (قلب) و مل ڕەقی نەبی. (ذاتاً) (قرآن) (وعظ) و (نُصح) لەوانە (تأثیر) ئەکا. ئەوەی (لدود) و (عنود) بی، هیچ. ﴿تَنزِيلًا﴾ (نصب)ی بە (نُزِّلَ)ەی (مُقدَّر)ە، یا لەسەر (مدح) و (إختصاص)ە ﴿مِّمَّنْ خَلَقَ الْأَرْضَ وَالسَّمَاوَاتِ الْعُلَى﴾ (قرآن) لە (طرف) کەسیکي، (خالق)ی (أرض) و ئاسمانی بلّند ناردرابی، بو سەرتوو، ئەو خوایە چۆن توو لە (مشقّەت) و (ذلّەت)دا دەهێلّی؟ بە سەرت ناخا؟ بلّندت ناکا؟ (قابل)ە؟! (أمین)بە وات بەرز ئەکا، کە سەری ئەو سەر ئەفرازانەت بکەوێتە ژێر (قدم) ﴿الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ﴾ (قرار)ی گرتوە لەسەر (عرش)،

(أريكه)ی (حكم)داري، بیٚ(إضطراب)، کەس‌نیه، ڕیٚ بۆ لای ببا (وَحْدهُ لاشریكَ لَهُ) (إداره)ی (عالم) ئەکا ﴿لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ (کائنات)ی (جوْ). ﴿وَمَا تَحْتَ الثَّرَى﴾ ئی بن عەردی؛ لە (مرکز) تا (مُنتها)ی (موجودات) (مخلوق) و (مملوك)ی ئەوە، بیٚ (شریك) (خلق)ی کردینە؛ بیٚ (شریك) (إداره)ی (أنام) ئەکا، (مُلك)ی ڕیٚکە، لیٚکە، پیٚکە. کەس‌نیە (مُعارض)ە ي بکا، کەندو کۆسپەی باوێتە بەر (أمر) و (إراده) و (إداره)ی. خوایە وا کار ڕیٚك، کاری توو ڕیٚك ئەخا، ئەو کارسازەی تووی ناردیە، بە (رسول) بە (ضایع)ت نادا. (عرش) چیە؟ تەختە بە ندی خوایە؟ گۆیبیا خوا لەسەری دائەنیشی، کورسیش مَوْقعی قَدَمیەتی وەکی گەورە گەورەکان لەسەر تەخت دائەنیشن کورسی لەبەر پێیان دادەنێن لاقیان دەخەنە سەر، نَظَر بە قەدمی فەقیری چ ئەدی ئەوەندە نهایەت عَظَمەتە.

حتّا ئەلێن عەرەبیٚ بەدو چاوی بە (هارون الرّشید) کەوت، لەسەر أُهبی خلافەت و لەسەر سریری مُرَصَّع و مُلَمَّعْ ووتی: السلامُ عَلَيك يا الله! أما إنسانی هەبوو و تیٚگەیشتوو ئەزانیٚ بلّندی شخص، بە بلّندی جیٚ نیە! وە مت و مەرجان و دوڕ و ئەلمّاس بازنیٚ زێڕ و زیو، قاطی فورمەیی و سورمەیی بۆ زاتیٚ کە بە حەق إنسان بیٚ، مایەی زیبا و زینەت نیە، أمّا گەلیٚ ملوك وەکی منداڵان ئەوەی ئەکەن، ئەوەش بۆ جَلبی نَظَری منداڵانە! رِجالی ئەورویی زۆر ستایشی (عبدالحمیدخان)یان ئەکرد، زاتیٚ گەورەیە، سورمە و نیشان بە خۆیەوە ناکا، بەس لە آیّامی رَسْمیّە نیشانەی خانەدانی و سلطنەتی بە سینگی خۆیەوە تعلیق ئەکرد. ئەمڕۆ زاتیَ ملك الملوك صاحِبی ئاوڕەنگی إمپراطوري وسیعُ الملکي کە ڕۆژ لە مُلکي وی ئاوا نابیٚ، لەسەر ئەو تەختی عالی بەختە، صەیێکی لەگەڵ دادەنیشیٚ، با عەرشیٚ هکذایی هەبیٚ!! أمّا خوا مُقدّسە لە دانیشتن و قَدَم لەسەر کورسی دانان! گەر وابیٚ ئەویش جسمێکە جسیم و مُشَکّلْ وەکی ئێمە، ئەو وەقتە مسألە ئەگوڕیٚ، ناتوانی بلّییٚ جسمی واجبُ الوجود، نابیٚ!

علی هذا التّقدیر _ العیاذُ بالله_ حاجەت بە صانعْ نامێنێ. بە کوردیتان عرضکەم تَقَدُّساتی کبْریائی پاش ترجمەی کُتُبی حُکَمای إلاهیّون بۆ ئێمە، توضُّحی کرد! بنۆڕە سیَرِي قُدَماء دەربارەی (الله)، إلاهی أفکاریان چۆنە؟!! ﭺ ئاگایان لە علائم و لَوازِمی إمکان و وجوب نەبووە! مقامی ألوهیّەت چی لێ دەوەشێتەوە، چی لێ ناوەشێتەوە، بە خاطریان دانەهاتیە! تا وردە وردە عَقلی بَشَری علمی بَشَری زیادی کردیە، لَوازمی واجِبُ الوجوُدیان بۆ معلوم بووە! بەلاّم تَقْلید بَعْضەکی لەسەر حالّی بداوەت هێشتەوە!!!

با بێینە سەر باسی تأویل بە مَعْنا صَرفی لَفظ لە ظاهِری مَعْنای. من تَعَجُّب ئەکەم لە أمثالی (سَیِّدی آلوسی) خۆیان ماندی ئەکەن بە طول و تَفْصیلی مَذْهَبی خَلَف و سَلَف. تَأْویل لای سَلَفْ دروست نیە، تَفْویض ئەکەن، ئێوەش لَهُ الحَمْد (سَلفی)ن! بەلاّم لە دروست بێ، دروست نەبێ، تأویلات کرا! بۆ ئێمە تەماشا کردنی تأویلاتەکان لازمە! ئەوی جووان بوو، مبارەکە، قبولّی کەین! ئەوی ناملائم بوو ردی کەین!.

منیش ئەلّێم:" أئمّەی کرام وەکی (أبی حنیفە) و إخْوانی، ڕێیان نەدایە، لکن مَنْعی وان، کەلّکی نەگرت، ڕێی مُؤولانی نەبەست! ئەشلّێم (بِدْعتە)، بەلاّم (فی الحقیقة) مجبوریە أئمّەی إجْتهاد بۆچی تَأْویلی آیَة و حَدیث، بۆ تَصحیحی حُکمی شرعی عَمَلی ئەکەن؟ (أشْعَری) بە هەوای نەفس، تَأویلی نەکردیە! وەك (مَوْلانا خالدی کوردی) نقل ئەکا لە (شیَخ أشعری) خۆی ئەفەرموێ: " ئەگەر لەبەر أهلي بِدَعْ نەبا، من تأویلم نەئەکرد!" کەسێ تووشی خِصام و جدال بێ بلّێ: " مەعنای (ظاهر)ی ئەو (آیەت)ە (مُراد)نیە، ئەدی (مُراد)چیە؟، "خوا ئەیزانی" لێی (قبولّ) ئەکرێ؟ (حمل) ناکرێتە سەر (عِجز)؟ ڕیشە خەندەی پێ ناکەن؟! (تأویل)ێ بۆ (إظهار)ی (حق) بێ، (مَذموم)نیە، بەو (شرط)ە (مُناسب) بێ، لە (کلام)ی خوا بوەشێتەوە، نەك وەك (تقدیرات)ی (نحوی)یان تامی (قورئان) ئەبەن (تأویل)ی بێ (معنا)، (تفسیر) (لفظاً بِاللّفظ) (مذموم)ە.

خوا وایە لەگەڵ (عرش) وەك ڕایەخێ بە سەریا ڕا خرابێ، یا تەختێ بڵندە، لەبەر (علی) (کرسی) لە (تەخت) گچکە ترە، نابێ خوا لەسەر کورسی دانیشی، جێی پێیەتی، ئەمانە (مُضِرّ)ن، خەڵکی بە (فتنه) ئەبەن، ماڵ وێران ئەبن.

تەماشای (إنسان) خۆی لە (مُتشابهات)ە، بۆیە (حُکما)ی (إلاهیّون) و (غزالیّ) و (أمثالی) (تأویل)ی ئەکەن، بە (جوهر)ی (مُجرّد) (فَوق المادّة وَ الطّبیعة) وهەرکەسێ (إنصاف)ی ببێ، ناتوانی (بالکُلّیة) (إنکار)ی (تأویل) بکا لە (وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي) ئەڵێن: چی؟ (وکَذا) (اَلْحَجُر الْأسْوَدُ، يَمِينُ اللهِ) (أمّا) (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، (سیّدي آلوسی) ئەفەرموێ: "إنْ صَحَّ" دیارە لای ئەو (ذات)ە (مُتَبحِرّ)ە ئەو (کلام)ە (حدیث)نیە، زۆر (ممنون) و (مسرور) بووم.

بە هەر (وَجْه)ێ هەبێ، بێ (وَجْهه)، چۆن (رسولی کبریائی) (حجرالاسود) ئەکاتە (یمین الله)؟ ئەو (نوع)ە قسە (مُجَسِّمَ)ە نایکەن. لە (مقام)ێ (نسبەت)ی (نسیان) بۆخوا ئەدرێ، لە (آیەت)ێ (نَفی) ئەکرێ. چارە چیە؟ بۆیە(سیّدي آلوسی) (مجبور) بووە لە (بعض)ە جێیە (تأویل) ئەکا، لام وایە (عرض) کراوە. (وُقوع)ی (مُتشابهات) لە (آیات)ی (کلامی)، لەبەر (تشابه)ی گەلێ لە (کائنات)ە وە (تشابه) (مُوجب)ی (ترقّی) (بشر)ە، تەواوی (مهارەت) و (حذاقەت)ی (دختۆر) لە (تشخیص)ی (أمراض)ی (مُتشابه) ئەبێ. زێدە (قوەّت)ی (ملکە)ی (إجتهاد) لە (فرق)ی (مُتشابه) دەرئەکەوێ. (خلاصە) (جناب)ی (حق) لە (مکان) و (حیّن)دا نیە، وە (إلاّ) (داخل)ی (أحکام)ی (متمکّنات) و (مُتحیّزات) ئەبێ، کار تێك ئەچێ ﴿وَإِن تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ﴾ حاڵی خۆت بە (تضّرع) و زاری (عرض)ی (باری) کەی (حاجەت) نیە ﴿فَإِنَّهُ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى﴾ لە (قَوْل) و (غیر)ی (قول) (هَمْسُ الْخِطاب) (ما خَطَر بِالْبال) (مکنون)ی (فِي الذِّهن)، (عِلم)ی (شامِل)ە، (قُدرەت کامل)ە (مُحَقّق) ئەمرۆ سبەی قوتارت ئەکا، ئەبێتە (مالك)ی (رقاب)یان، لام وایە لێرە قسە لە (ذکر)

و (فکر)نیە. مەلایان خۆیان ماندی کردیە، (ذکر)ی (خَفی) و (جَلی) کامیان باشترە؟ (حق) ئەمەتە، لە (بعض)ە حالێ خفی لە (بعض)ە حالێ (جلی). دینی (إسلام) هەر دوو لای هەیە، (أمّا)ئێمە گفت وگۆ لە (ذکر) ئەکەین، قسە لە های و هووی، نەڕە نەڕە، لرف و هۆڕ، و گرمەگرم و زرمەزرێ ی دەرویش و صوفیان ناکەین. وام ئەبیست (ئەوروپایی) بە (ذکر)ی (مولوی) یا نیان ئەگوت: " تیاترۆی دینی " ئەوە (مُوجب)ی (تأسّف)ە کە لە دینی إسلامی دەزانن، وەك (طقوس)ی (سائر)ی (ملل)ی تر. حەزت لە (تفصیل)ە، تەماشای (تفسیر)ی (آلوسی) کە ﴿اللّٰهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ بێ (شریك)ە لە (خلق) لە (تدبیر)ی (مُلك)، ئەوانە کەسیان نیە، (نجات)یان‌دا (مُعارضە)یان بۆ بکا ﴿لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ﴾ (صفات) (أساساً) (إعتبار) بە ناو نیە، بە ناوکە (حُسنی) بۆ (مؤنّث) وەك (أحسن) بۆ (مُذكّر) (إستعمال) ئەکرێ هەر(صفەت)ێ (لایقی) (مقام)ی (کبریائی) بێ بۆ وی‌یە، پێی (مُتّصِف)ە، یاخود(محصور)نیە ئەوی (شرع) پێی(وارد) بوویی لە (عبارەت)ی (قرآنی) (حصر)نیە، لە (حدیث)یش‌نیە، (عُلما)ی ئێمە ئەڵێن: " أسمای خوای توقیفییە" ، (إنسان) نازانی بڵی: چی؟

گەلێ (إسم)یان بۆ خوای داناوە، لە (أصل)ی (لغەت) (معنا)ی بۆ خوا (مُحال)ە" شتیکی (مناسب)یان لێ‌گرتیە، کردیتیانە ناوی خوا ﴿وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ مُوسَىٰ؟﴾ خَبَر و باس و خواسی ئەو زاتەت بۆ نەهاتیە؟ چەند مشەقەتی خوارد، وە تعب و عَذاب و حُزن و آلمی دیت لە دەست فِرعَون، لە دەست قەومی خۆی، چۆن صبرو ثباتی کرد، مُقابِلی جَبّاری وەکی فِرعَون، چۆن ڕاوەستا؟! حقّاً صَبر و ثُبات و غیرەت و أقدام و مَتانت و عَزم و جَزمی (کلیمُالله) لە خەوارقە!

خۆزیا کِتابی خاتمُ الأنبیاء لابا، ئەوەی (جلال نوري) فەرموویەتی لە مَواقِف و مُناسَباتی أحوالاتی (کلیم) و (خاتم)، نووسیبام، تا بتانزانیبا چ زاتێکە وە

مُناسبەی لەگەڵ (رسالەت پەنا) پەناه چەند زۆرە ! ! ﴿إِذْ رَأَى نَارًا﴾ کێ بووە؟ کوڕی کێ بووە؟ داکی ناوی چ بووە؟ ئەوانە مَنْظوری (قرآن) نین!. بە مُناسبە مەوادی ڕوحیەی بیان ئەفەرموێ، لەو وەقتە ناخۆشە کە لەگەڵ عائلەی ڕێی وون کردیە، وادەرئەکەوێ لەبەر تاریکی ڕێیان دەرنەکردیە! ﴿فَقَالَ لِأَهْلِهِ﴾ عائلەی. ئەڵبەتە تەنها خۆو ژنی بەڕێ نەکەوتینە، کەسێکیان لەگەڵ بووە، بۆیە ئەفەرموێ ﴿امْكُثُوا﴾ لێرە ڕاوەستن دوام مەکەون.

﴿إِنِّي آنَسْتُ نَارًا﴾ ئاگرەکم دیت تَخْصیصی إناس بە دیتنی شتێ کە أُنْسی پێ ببێ، جوانە مُناسبە! لێرە ئەچم بۆ طَرَفی ئاگرەکە ﴿لَعَلِّي آتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ﴾ دەستە چیلەکتان لە ئاگرەکە بۆ دێنم، دیارە إحتیاجیان بە ئاگر بووە. ﴿أَوْ أَجِدُ عَلَى النَّارِ هُدًى﴾ سەرە دەرێ ئەدۆزمەوە! لەسەر ئاگرەکە، ڕێیپێ دەرئەکەم، دیارە ڕووناکییێ قَوی بووە! ظاهِرْ وایە أهلیشی دیبیان -جەنابی (کلیم) أولادی بووبێ-.

﴿فَلَمَّا أَتَاهَا﴾ هاتە لای ئاگرەکە، ظاهِرْ وایە بێ فاصلە بووبێ! ﴿نُودِيَ﴾ بانگکرا. ﴿يَا مُوسَى﴾ لەو مقامە حکایەتی حیرەت ئەنگێز لە (وَهَبْ بن مُنَبِّهْ) نقل ئەکەن، نازانم بۆ (قرآن) مُبالات بەو نوعە شتە ناکا؟ نُقالی أعجوبە پەرست، ئەوەندەی إعْتِناپێ ئەکەن؟! جا تَقْسیمي نار ئەکەن، ئاگرێ ئەخواو ئەخواتەوە، ئاگری جَهَنَّمْ ئاگری ئەخواو ناخواتەوە، ئاگری دونیای خۆمان ئاگرێ ئەخواتەوە وە ناخوا، ئاگری داری سەبزوتەڕ کە لە سورەي (یاسین) ئەفەرموي: (هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَاراً) ئاگرێ ناخوا و ناخواتەوە. ئاگری (موسی) بعضي ئەڵێن (نور) بووە (نار) نەبووە، إسْمیەتە (نار)ي، کە یەکە لە حَجبی خواي! ئەمانەي پێ ناوێ! ! (رَأَى نَاراً) وَالسَّلام! ! ! ﴿إِنِّي أَنَا رَبُّكَ﴾ (موسی) أساساً مۆمِن و مُوَحِّدْ بوو، بەو ندایە نوعاًما تعینەکي بۆ نواندرایە! ئەم ندایە چۆن بوو؟ چۆنی بیست؟ قسەیان مُخْتَلِفە! گەلێکی ڕەنگ نیە گوێی لێکەي! ! خۆزي ئەو مەلایانە گرامەفون و

ڕاديو يان ديبا، ئايا چيان ئەفەرموو چۆنی تێ ئەگەيشتن؟! (موسی) كوو زانی ئەمە نداي خوايە؟ لەوانە شَيطان وَسْوَسَتی دا؟ حاشا ثُمَّ حاشا ڕێی شَيطان نيە!! لەو مقامە ئەوي ئەو قسە ئەكا يا لە شَيْطانيە، يا لە بَساطَتە، يا لە زيدە إيمانە بە قُدرەت و ئاگاداري و جسارەتي إبليس! كَلامي خواي قديمە، يا حادثە؟

نِزاعْ لە علمي كلام دا مَذكورە! أمّا نزاعێ بێ مَعْنا! ألفاظ و حُروف چۆن قديم ئەبێ؟ بنا لە نقلي (سَيّدي آلوسی) لە بعضي عُلَماى سُنّي (ماوَراء النَّهر) قائلي بە قِدَمي كَلامي لَفْظي ئەڵێن: ئەو كلامە حادثە، چونكي مُتَوَقِّف بووە لە سەر هاتني (موسی)، هاتني (موسی) حادث بووە، كەوابێ ئەوي مُتَوَقِّف بێ لەسەر حادثي بِطَريقِ الأولى حادثە !!! قسەێ جووان، بلّێ أمّا بلّێ هەر ئەو آيتە وايە؟ چەند هەزار آيَة موقوف بووە لەسەر شتي حادثْ، ئيتر بلّێين چی؟! ئەوانەي مَوقعي ڕاستيان گرت، مەلايان بوون بە طَوائف، هەر طائِفە قَولي رَأيسێكی قووەت دايێ.

(أشْعَري) ئەڵێ: كَلامي نَفسي گوێ لێ بووە. كَلامي نَفسي ئەگەر صفەتەكي واحد و قَديم و قائم بە جەنابي قدس بێ، چۆن بەگوێ ئەبيسترێ؟ ﴿فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ﴾ ئەڵێن: " لە پێستی كەرێ مردار بوە" ئەمەيان بەچی زانيە؟ ﴿إِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ﴾ (اطلاق)ی (قُدسيّەت) لە سەر (أرض)، لەبەر (قدسيّەت)ی ئەو شتەيە كە تياى (واقع) بووە. ئەو (وادی)يە (آلان) (مُقدّس) بووە، كە (جنابی كبريائی) قسەی لەگەڵ (موسی)ی تيا ئەكا ﴿طُوًى﴾ چيە؟ (جمهور) ئەفەرموون: " ناوی (وادی)يە كەيە" باشە. ئەوەی و توويانە لە (طُوی) بە (طَيْ) كرێ چ (لزوميّەت)ی هەيە؟ ئەوەم لاسەيرە، كەسێ ئەڵێ: " (مەعنا) (رجلُ) ئەبێ (يا) (مُقدّر) كرێ" بەڵێ، ئەمە (عبری)يە (ماشاءالله) گەلەكيان (كنزاللغات)ن لە: (فارسی)، (سريانی)، (حبشی) (عبری)، (نوبە، نوبە) (بربری)، (هندی). (أمّا مع‌الأسف) (كوردی)م لێ نەبيستينە، ئەوە لەبەر بێ

(قیمەت)ی کوردانە؟؟ ﴿وَأَنَا اخْتَرْتُكَ﴾ بۆ (رسالەت) (إلی فرعون) ﴿ فَاسْتَمِعْ﴾ گویّ ڕاگرە، گویّ دێر بە، بە ئاگاداری ببیە. بۆیە ئەفەرموی ﴿لِمَا يُوحَى﴾ من (إیمان)م بە (رسالەت)ی (موسی) هەیە؟ دیارە لە (خیالیّون) نەیوە، (ألآن) لە چ (حال)ێ دایە، بیّ (شُبهە) (نُبوّەت) و (رسالەت)ی بە (خاطر) و (خیال) و (وَهم)ی دا نەهاتوە. چاوە نۆڕی ئاگریّ بوە بۆ (أهل)ی، یا شتی ڕیّ ی بۆ دورخا، لەو (وَرطە)یە (نجات)ی بیّ، (وَکذا) (رسالەت) پەناه، (مع أنّە) ئەو هیچی نەخوند بوو، کە (مُتأثّر) ببیّ، وە (سوق)ی کا بۆ (إدّعا)یە. لە (جُملە)ی (ما يُوحى) ﴿إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا﴾ بیّ (شریك)ە لە هەموو (جهەت) ﴿فَاعْبُدْنِي﴾ بیّ (شرك) (خالِصاً) (مُخلِصاً) (مُطیع) و فەرمانبەردار بە ﴿وَأَقِمِ الصَّلَوٰةَ﴾ نوێژی بە جیّ بگەیەنە ﴿لِذِكْرِي﴾ تا (دائماً) لە یادت بم، ئەمە بۆ نوێژی (مُکرّر) وەکی ئێمە زۆر (موافق)ە (شێخ أبو علی) شتیّ وا (إظهار) ئەکا، بۆ (حکمەت)ی (تکرّر)ی نوێژ. (ممکن)ە بلێین: "بەس بەناوی من، نوێژ بکە، بە ئومێدی دیم، نا" ﴿إِنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ﴾ (قیامەت) دیّ (إنسان) (بعدالموت) زیندی ئەبێتەوە ﴿أَكَادُ أُخْفِيهَا﴾ نیزێکە بزرىکەم بە (دوام) لە (نَوع)ی (بَشر) بە (إختلاف)ی (أفکار) و (مَیل)، بە (شُبهات)، وە یاخود لە (قوم)ی تووی بزرکەم، باسی نەکەم، زێڕا زۆر تیّگەیشتی نین، بۆیە (أکثر)ی (وَعد)ی بە أمثالی (أرض)ی (فلسطین) و شیر و هەنگوین یەتی. (أمّا) (أُخْفِيها مِنْ نَفْسي) کاشکیّ نەوترابا، (مُبالغە) بەو (نوع)ە لەو (مقام)ە (دائر) بە (حال)ی (کبریائی) بیّ جیّیە، (مُحال)ە، (محال)ێ (ذاتي)یە، وەك (إخفا)ی (إنسان)نیە، لە (نفس)ی خۆی. گەلیّ جار(إنسان) ئیشیّ ئەکا، هیچ ئاگای لیّ نیە، پیّ ی ئەلێن: " کردووتە" سوێند ئەخوا: (نەم کردووە) ﴿لِتُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا تَسْعَى﴾ لە چاکە و خراپە، ئەگەر (معلوم) با بۆ هەمووکەس، هەمووکەس چاك دەبوو ئەگەر زۆر (مُستبعد) بوویا، کەم کەس (إیمان)ی پیّ ی دەبوو. وادەر ئەکەویّ (إیمان) بە ڕۆژی (جزا) وە بیّ (إیمانی) زۆر (تأثیر)ی هەیە لە

(سوق)ی (إنسان) بۆ چاکە و خراپە، (حقیقةً) وایە. (عَجایِب)ە کەسێ (دعوا)ی (رسالەت) بکا، وە بلّێ: " ڕۆژی (جزا)نیە" وەکی (بهاء افندی). بە (تقلید)ی (حُکماء)، (معاد) بۆ (روح) دائەنی وە (لذّت) و (ألم) (نظر) بە(علم) و (جهل)ە بۆ ئەو قسە، (رسول) ناردنی: بێ ناوێ.

(فلاسفە)ی (یوّنان) و (مسلمان) آن، گەلێ (سعی)یان کردیە، (إثبات)ی ئەم (مُدّعا)یە، لای خۆیان (دلائل)یان هێناوە، (دلائل)ێ بە (قُوەّت). ئەگەر (حشر)ی (أجساد) نەبێ، لای من (نبوّەت)ی پێ ناوێ ﴿فَلاَ يَصُدَّنَّكَ﴾ (یا موسى) ﴿عَنْهَا﴾ لە (إیمان) بەوی ﴿مَنْ لاَ يُؤْمِنُ بِهَا﴾ بە (وسوسە) و (إلقائات)ی (دغدغە) بە (خاطِر) مەگەیەنە. (ظاهِر) وایە هەر دوو (ضمیر) لە (عَنْها) وە (بِها) بۆ (ساعەت) بی ، (أوّل) بۆ نوێژ، یا بۆ (عبادەت) وە (ثانی) بۆ (ساعەت) یا هەر دوو بۆ (لا إله إلّا أنا)، یا (إعتبار)ی (خصال) بۆ (مرجع)ی هەر دوو (ضمیر) خۆیـنیە. (مقصد)یان (إظهار)ی (مُتفنّنی)یە (تلاعب) بە (ضمائر) ئەکەن، (منع)ت نەکا لە (إیمان) بە (قیامەت)، کەسێ (إیمان)ی پێ ی نە بێ ﴿وَاتَّبَعَ هَوَيهُ﴾ چی (نفس)ی خواستی. (ذاتاً) (إیمان) نەبوون، بە (ساعەت)، بۆ (تصفیە)ی گوناە لە (أکْدار)، (مُتابَعە)ی (هَوا) یە بێ (تأثر) (ولَوْ) بە ئاهی، (کەە گاهێ) ﴿فَتَرْدَى﴾ بە (هلاك) ئەچێ، (إعادە)ی (أموات) بۆ (حیات)ی (جدید) پاش ڕزین و (إستهلاك)، لای گەلێ کەس زۆر دوورە، وە بەلکو (محُال)ە، (حتّی) (قسم)ێ ئەلّێن: " (مُحال)ە". (خاصةً) ئەوانەی کەمێ (علم)یان بە (طبیعیّات) هەبێ، (إیمان)بە (قیامەت) ئەکەنە (علامەت)ی (بساطەت) و (أبْلَهی)، لەبەر ئەوە ئەبێ (أهل)ی (علم) ئاگاداری خۆیان بن، (شُبهات) (تأثیر)یان تێنەکا. دیارە کەسی (قوەت)ی (إیمان)ی بە (سعەت)ی (علم) و(قدوەت)ی (إلهی) هەبێ، (إیمان)ی بە (قیامەت) (سهل)ە. وە (إیمان) و (إتّکال) لەسەر (شفاعەت) (أثر)ی بێ (إیمان)ی ئەدا، بۆ (جسارەت) لەسەر (سَیِّئات) ﴿وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَا مُوسَى﴾ ئەوە چیە بە دەستی ڕاستتەوە؟ ﴿قَالَ

هِـيَ عَـصَايَ﴾ وەکـاظی منـە، دار عـەصـای خۆمـە. ﴿أَتَوَكَّـؤُا عَلَيْهَـا﴾ خـۆی ئەهاوێمە سەری، عادەتی شوانانە، دەستیان ئـەهاوێنـە سـەر عـصا یـا گۆپـاڵ ئەیدەنە بەر سینگیان ڕادەوەستن بە رامبەری مێگەل کە ڕایان ئەگرن بۆ لەوەڕ لە مرعی ی خۆش. ﴿وَأَهُشُّ بِهَا عَلَى غَنَمِي﴾ پەلکی دارانـی پـێ دادەتـەکێنمـە سەر گەلە مەڕم چ نێر چ مێ، عامَّةً غَنَمْ مُقابِلي مَعْزە! کوردیش ئـەڵـێ: مـەڕ و بـزن، وَلَـوْ نێریـشیان تیـابێ! غـایتي کـەم وایـە لـە بـەران و نێـرێ زیـاتر بـێ، کاوڕەگەل و گیسکە گەلی نێر زوو ئەفرۆشن بـۆ لبـاس و خـواردن. ﴿وَلِـيَ فِيهَـا مَآرِبُ أُخْرَى﴾ ئەوەی لە عَصاي بوەشێتەوە. ئەودار عـصایە چ بـوو؟ لـە کـوێ هاتیە؟ چەند درێژ بووە؟ ناوی چیە؟ وە ئەو مَقاصدە چ بووین؟ بڕۆ لـە (وَهَبْ بن مُنَبِّه) و أمثالي وەریگرە! ناشُکري نەبێ (إبنُ عبّاس)ی ئێمە ش بوویتە، یـا خود کردویانەتە، مَلْجأي قصّاص و أعْجوبە خوانـان. نـازانم سَـبَبی چیە لێـرە مـەلایـە گـەورەکـانی صـوّفي مَـشْرَب، مُقایـسە لـە بـەینـي پێغـەمبـەرو موسـی پەیادەکەن؟ چ مَقْـصَدْ؟ چ مُناسـبە؟ چ حاجـەت؟ مَعْنـاي آيَـةْ دەزانـدرێ، بـێ مُقایسە! وانەبووە حکایەتي حاڵیان (حِـينَ البَعْـث) وەك یـەك بـووبێ! ئـەو لـە غارو ئەم لە وادي، ئەو قَبل الهِجْرَة، ئەم پـاشـي هـەڵاتـن لـە ترسـي فِرْعـون!ـ حَقيقَةً قسەي بێ فأیدە وبێ مُناسبەیان کردیەـ وەقتی مِعْراج لە کێ؟ وە بَدئي رسالەت لە کێ؟ قسەشیان زۆر کردیە لە جَوابي!!. من واتێ ئەگەم کلیمي حُـر کردیـە، سـؤال بـە فـائـدەیـە، أنَّـهُ سـؤالي لـێ کرایـە. چیت لـێ دیتـوە؟ وە چ خصوصیە تێکی هـەیـە؟ ئـەویـش فـەرموویـەتـي: نـا! عـصایە وەکـي عَـصاي شوانان، فائدەشي عَیني فائدەیە، وەکازێ عادیە، والسّلام!!. ﴿قَالَ﴾ جەنابي حـەق. ﴿أَلْقِهَـا يَـا مُوسَـى﴾ بیهـاوێ بـۆ ئـەرز، تـابزانـي خێـر و فـائـدەي چیە. ﴿فَأَلْقَاهَا﴾ حَسْبَ الأمر. ﴿فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَى﴾ ماری لـەوێ بـە سُـرعَةْ ئـەڕوا. ئایا ئەگەر داري بەهەشت نـەبا فرێـدایا، نـەدە بـووە مـار؟ بـوونی دار بـەمـار، خارقەیە! داري بەهەشت بێ، یا داري جَهَنَّم! دیارە (کَلیّم) قَبلَ الحال نەیدیوە

بوو بیّ بە مار! ترساوە، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ﴾ ئەوی ووتوویانە دائر بە عَصا، بیّ أصله! (سَيِّدي آلوسي)ش قُبولّیان ناکا، زاتاً ئەوی هۆشی هەبیّ، ردّیان ئەکا! ئەو غَرائِب و عجائبە هیچی لە قُرآن ذکر نەکرایە، ئەوان بیخەنە ناو تفسیر، زۆر بیّ مَعْنایە!! ئەگەر درۆنە، ئەوا درۆن، ئەگەر ڕاستن، خۆرایی نیە خوا تەرکی کردینە ذِکْری نەفەرموونە! حَقیقَةً نقالەکان أکْثر بیّ تَفَکرن! ئەوجا دیارە کەسیّ داریّ ڕەق بکاتە مار، بیّ تَطَوّر، ئەتوانیّ عَناصِري إنسان خڕکاتەوە دووبارە هەیکەلیّ وەك هەیکەلی دونیای لیّ تَرْتیب بدا!! فَعَلَی هذا معلوم بوو مَوقِعي ئەو سؤال وجوابە چەند جووانە! چ رَبْطي ئەدا بە ما قَبْلُ و مابَعْدي؟! فەرمووی: بیگرەوە، هەڵیگرەوە، مەترسیّ! ﴿سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا الْأُولَى﴾ (حاڵەت)ی پێشی ئەوەی بیکەینە مار، نازانم ئەو وەختە کیّ لەویّ بووە؟ لیّ ی (نقل) کرابیّ، (دفعە)ی سیّ یەم (أمر)ی پیّکرا، (أمنیّەت)ی درایە، ئەوجا مارەکەی هەڵگرتەوە. (یاربّ)ی (ذات)یّ وەك (إمام)ی (أحمد)، چۆن لە (وَهَب) (نقل)ی (أخبار) ئەکا؟ (قابل)ە کەسیّ (رأساً) خوا (أمر)ی کاتیّ، (آناً) (مُسارعە)ی نەکاتی؟ (مادام) (إنسان) بیّ (وَلَوْ) شێر و (بَبْر) و پڵینگ بیّ، تاوی ئەداتی.

بۆ (نصب)ی (سیرة) ماندوو بوون، ئەگەر (منصوب) بیّ بە (سَنُعیدُ)وە (لام)یّ لەویّ (مَقدّر) کریّ، (یعني) (سَنعیدُ لَها سیرتَها الأُولی) (سیرەت) و ڕەوشت و (حاڵەت)ی پێشووی بۆ (إعادە) ئەکەینەوە، چ (قید)ی یە.

(بعض)ێ لەوان (إلی)ی (مُقَدَّر) کردیە لەسەر (سیرَة)، لام وایە ئەمن (دقَّەت)یّ زێترە. ﴿وَاضْمُمْ يَدَكَ﴾ دەستت (جمع) کە ﴿إِلَى جَنَاحِكَ﴾ (میل)ی پیّ بدە، بەلای تەنشتت، بیهاویّ با غەڵت ﴿تَخْرُجْ بَيْضَاءَ﴾ سپی ﴿مِنْ غَيْرِ سُوءٍ﴾ بیّ (علّەت) وەك (بَرص) سپیایەتیە (لطیف) و جوان، نەوەك مردە گێچ ﴿آيَةً أُخْرَى﴾. بیّ دەرمان و بیّ (علّەت)، دەست بیاتە باغەڵ بێتەدەر سپی، (آیەت)ە (آیەت)یّ (تام). (أمّا) (قلب)ی (عصا) بە (حیّە) (قیاس) لەوە ناکریّ،

(نسبەت)يان نيە. وا دێتە (خيالْ)م ئەو دەستي (قبطى) پێ كوژرا، بەو (نوع)ە سپى ئەبوو (علامەت)ى (برائەت) و نيشانى (فرعون)ى ئەدا: (دەستم (نقى)يە، (سوء)ى نيە، وەرە (هدايەت)، وەريگرە دەنا، تۆش لەو دەستە (ضربە)يە ئەخۆى!)

(عصا)يە واو (يَد)ىَ هكذاييمان پێداى ﴿لِنُرِيَكَ مِنْ آيَاتِنَا الْكُبْرَى﴾ (غير)ى ئەوانە، گەورەتريان (لازم)ە (نظر) بە دانە بێ. ئەو (آيات)ە دوايە دێ ﴿اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ﴾ (ملك)ى (مصر) ﴿إِنَّهُ طَغَى﴾ لە (حَد) تێپەڕىيە، (وَهَبْ) لێرە (إبزار)ى (فصاحەت) ئەكا گەلێ (أوامر)ى (إلهى) (ذكر) ئەفەرموێ، فەرمايشەكانى ناشيرين نين، ئەگەر (إسناد)ى (صحيح) بێ لە (حضرەت)ى (موسى) وەرگيرابێ، (أمّا) (غير)ى خۆى كەس لەوێ نەبووە، (روايەت)ى لێ بكا ﴿قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي﴾ (كليم) (ذات)ێ بوە (جبّار) بە (غَضب)، لە خوا ئەخوازێ سينگى (واسع)كا، (يعنى) (حلم)ى پێ (كرم)كا، (مُتكَلِّم) لە (أثنا)ى (دعوەت) و (مُناظرە) (غضب) بىگرێ، قسەى لێ تێك ئەچى ﴿وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي﴾ كارى (صعب)ە، (مُشكل)ە، ئاسان نيە، (دعوەت)ى (فرعون) زۆرى پێ ئەوێ، بێ (قدرەت) و (قوّەت) و (مُكنەت) نابێ، بەڵێ وا ئەبێ (إنسان)ى (كامل) و بە هۆش. وە ديارە هيچ بە ئومێدى (رسالەت) نەبووە، وە (إلّا) وەك (خياليّون)ە كانى (مُنتظر) ئەى گوت: " باش أُستنە، (حاضر)م! "، ﴿وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي﴾ گرفت، ئەو گرفتە چۆنە؟ لە چيەوە بووە؟ (قرآن) (إشارە)ى نيە، وەبێ (لزوم)ە. گەلێ (ذوات)ى گەورە (فِطرة) (قوّە)ى (تعبير)يان تەواو نيە، سستن بە منگە قسە ئەكەن، ڕادەوەستن، (سامع) (كيف)ى بە ڕاوێژيان نايە گوێ نا داتە (كلام)يان، تێيان ناگا، چى ئەڵێن؟ تا (ألان) (موسى) قسەى لەگەڵ گەلێ كەس كرديە، چ گلەيى لە زوبانى خۆى نەبووە، وە كەسيش (إظهار)ى تێ نەگەيشتنى قسەى نەكرديە. ديارە زوبانى (دعوەت)ى (فرعون) و (قوم)ى زوبانى ترە، (طلاقەت)ێكى ترى پێ ئەوێ. وە (ممكن)ە

(لسان)ی (قبطي) چاك زانی بیّ، بۆیه ئەلّیّ ﴿يَفْقَهُوا قَوْلِي﴾ تیّ بگەن. ئەو (حكايەت)ی ئەیکەن (دانر) بە سوتانی زوبانی (حضرەت)ی (موسی) لە زەمانی مندالّی (تورات) تیای نیه ﴿وَٱجْعَلْ لِي وَزِيرًا﴾ (معاون)ی لە (وَزَرَ) یە، بە (معنی) (ثِقَل)ه يە ﴿مِنْ أَهْلِي﴾ کیّ؟ ﴿هَٰرُونَ أَخِي﴾ (لأَبَوين) ﴿أَشْدُدْ بِهِ أَزْرِي﴾ (قوەت)ی پیّ(زیاد)کەی. محكم(کەی) ﴿وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي﴾ لە (أدی)ی (رسالەت) ﴿كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا﴾ زۆرت (تقديس) بكەين، زۆرت ياد كەين، لە (أوقات)ی (أدا)ی (رسالەت) و (تبليغ)ی ﴿إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا﴾ ئاگادار و (عالم)ی بە (احوالّ)ی ئێمە.

(نقل) ئەکەن لە (أسماء بنت عُميس) خێزانی (إمامی علی) و ژنی پێشووی (إمامی أبوبكر) دیویەتی پێغەمبەر لە خوای خواستیە، ئەوی (موسی) خواستیتی، (حتّی) (حلّ)ی (عقد)ی (لسان) وە لە جیّی (هرون) (علی) خواستیە، بۆ (وزير) (حقاً) ئەمە خوشەویست کردنە. لە (أوائل)ی (رسالەت) ئەو (دُعا)یە نەبووە، (علی) ئەو (وەقت)ە کەلّکی (وزارەت)ی نەگرتوە، وە (قابل)نیە، ببیّ بە (شریك)ی (رسالەت پەناه)، لە (رسالەت). پاش (أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ؟) (دُعا)ی چی پیّ ئەویّ؟ وە (سیّد)ی (كائنات) (أفصح الأنام) بووە ئەم (دُعا)یە هیچ (معنی)ی نیە. ﴿قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَا مُوسَىٰ﴾ گشیتی حتّا حلّي عُقْدي لِساني. مَعَ أَنَّهُ وەکو لە بَعْضە آيَة دەر دەکەویّ، إنسانیّ فصيح بووە، براي خۆي لەوي فصيحتر بووە_ وا دەر دەکەویّ لە (تَوْراة) خوای بۆ ظاهر بووە لە ناو ئاگرەکە، وە أمري داوە بە رسالەتي، وتويەتي نایکەم، خوا لێی توورە بووە فەرموويەتي: چما نازانم (هارون)ی برات فَصيحُ الكلامە؟! ئەويش بە إستقبالتەوە دیّ کە تۆ ببینیّ! لە دلّی خۆیدا شاد دەبیّ الخ... وە ئەو ماجرایە لە وەقتي شوواني بووە، پاش ئەو أمرە ئەچێتەوە لای خزووري روخصەتي لیّ ئەخوازیّ بۆ عَوْدَت بە طَرَفِي (مِصر)، ئەويش روخصەتي ئەدا_.

بەلّام كِتابي مُحَرَّف و مُتَرجَم بە ألسنه ي مُخْتَلِفە زۆر جیّی إعْتِبار نیە!

بزانين تَراجُمي (قُران) چي يه سەردێ، خصوص جوابدانەوەی (موسى) مُقابلي أمْري إلاهي وه ظاهرْ بووني خوا له ناو ئاگره، بێ أصله أفسانەيه ﴿وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰ﴾ حقاً (قرآن) حكايەت نيه ! له سِيَري رُسُلْ ئەوەي رووحي تيابێ، خُلَصەكي به مقام ذِكرْ ئەكا. لێره باسي (أهلْ) نەما، چيان به سەرهات؟ زێرا مَقصَدي رسالەت نيه. دفعەیێ تر با سابق بێ ﴿إِذْ أَوْحَيْنَا إِلَىٰ أُمِّكَ﴾ هاويشتمانه دڵی وەك وَحي نحل، جێی رسالەت و نُبوّەت نيه ! قرآن بۆ ثُبوتي نَسبی (موسى) حەقّي لەسەر شاني بني إسرائيليان هەيه، زۆر نێزيك بوو كەس پێيان بڕوا نەكات كه (موسى) له وانه ! منداڵی هەڵگیراوه، ثبوتي نەسەبی پێ ئەوێ! بەو مُناسبه ذِكري پاش سورەی (مَرْيَمْ)، زێده مُناسبەی هەيه ! ﴿مَا يُوحَىٰ﴾ شتێ موافقي حاڵ، چيه، ﴿أَنِ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ﴾ بيهاوێ ناو صندوقێ. ﴿فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ﴾ موسى، يا تابووت، مَعْنا دياره. ﴿فَلْيُلْقِهِ الْيَمُّ بِالسَّاحِلِ﴾ أنَّهُ خوا إشارەي بۆ ئەكا، كه من أمر ئەكەم به أمْري تكويني كه بَحْر ، موسى يا صندوقەكه باوێته كەناري بَحْر. ﴿يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّي وَعَدُوٌّ لَّهُ﴾ عداوەتي بۆ موسى، به إعْتباري مئاله. ﴿وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي﴾ چ محبَتّي؟ مَحَبَّتي كه خوا ئەفەرموێ (مِنّي)! ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِي﴾ لەسەر چاوي من بەخێو كريێ.

بَعْضي عُلماي كَلام تَأْويلي عَيْن به بَصَرْ ئەكەنەوە، ئاگايان لێ نيه بەخێوكردني شت، نه لەسەر چاو نه لەسەر بَصَرْ ئەبێ! دياره مُراد، تَحْت عِنَاية و مُراقَبه و ئاگاداريەتي! محقّق گەر به ماڵی (فِرْعَون) حوكمداری عالي و الاتجار بەخێو نەكرابا، خوا واي له حەق نەئەفەرموو! بێ شك له ماڵی بني إسرائيليەكي گەوره بووبا، إنسانێ وا جبّار نەدەبوو! تربيەي أبْناي مُلوكي ئەو زەماني وەرنەئەگرت. ﴿إِذْ تَمْشِي أُخْتُكَ﴾ ظَرْفي چيه؟ تەواوي قسەيان لێ كرديه ! ناوي دايكي، خوشكي، چيه؟ له (توراه)ي لاي ئيمەدا نيه ! وەپەكيش لەسەر زانيني ناويان نەكەوتيه ! ﴿فَتَقُولُ﴾ خوشكت. ﴿هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن

يَكْفُلُهُ﴾ بە خێوي بكا، زۆر مەمنون و مُتَشكّرْ ئەبين، تفصيل لازم نيە. ﴿فَرَجَعْنَاكَ إِلَى أُمِّكَ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا﴾ إنسان چاوي لە دوا شتێ بێ، دائماً چاوي لە دوا ئەگێڕێ، قرار و ئارام ناگرێ، كە ديتي، ڕا ئەوەستێ، لە و حَرَكات و إضْطِرابە دا نامێنێ. ﴿وَلَا تَحْزَنَ﴾ غەمي نەبێ، لە طَرَفْ آلي فِرْعَوْن أمين بێ، چ ئاسيب بە كوڕي ناگەيێنن! ﴿وَقَتَلْتَ نَفْسًا﴾ (قبطيي). ئەو وەقتي عومري (موسى) چەند بووە؟ (حِبْر) و (بَحْر) خلافيانە، نازانم بۆ، مَعَ أنَّهُ ظاهِري فەرموودەي (حِبْر)ە كە پياو بووە بە مستێ (قبطيي) يەكي كوشت.

لەو وەقتە دوازدە ساڵي بووە، بە كام تأريخي مَظبوط زاندراوە؟ غەمناك بووي ترساي ﴿فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ﴾ غەمي ئەوێ قَتْلي. أمّا غەمي تابووت و بَحْر، ئەو تێپەڕي! مَعَ أنَّهُ (موسى) لە و وەقتە شعوري بە إلْقاي (فِي التَّابوتِ وَ فِي البَحر) نەبوو! ﴿وَفَتَنَّاكَ فُتُونًا﴾ بە وَقايع و مَشقّە و مِحَنْ، قالمان كرديەوە، وەك زێری خالِصْ (لله دَرُّ النّائبات فانّها صَدءُ اللّئام وَ صَيْقَلُ الأحرار)! كەوابێ حەقە إمْتِناني پێ بكرێ! ﴿فَلَبِثْتَ سِنِينَ﴾ چەند ساڵ؟ دە. (وَهَب) ئەڵێ: "٢٨" ئەوە بۆ (صاحب)ی (بحر) باشە. (١٢)ە و (٢٨) دەكا (٤٠) ساڵ، بۆ (حساب)ی (رأس)ی (نبوەت) (موافق)ە. (أبَيّە إبن بَقِر) ئەڵێ:" كە چووە بۆ (مَدْيَنْ) عومری (٢٢) ساڵ بووە. من نازانم چەند بووە؟ (حتّى) (نَظر) بە (عبارەت)ی (قرآن) (تعيين)ی (١٠)ە شم پێ ناكرێ. (ممكن)ە (٨) ساڵ لەوێ بووبێ.

لە (تورات) دەڵێ: (موسى) كوڕەكی بووە، ناوی لێ نا (جيرْ شوُمْ)، چونكی (زِلادەت)ی لە (غربەت)دا بوە. (ظاهر) وايە (جير شووم) بە (معنى) (غريبى) بێ ﴿فِي أَهْلِ مَدْيَنَ﴾ لە ناويان دا مای، چەند ساڵێ. بە خۆشی لەگەڵ (قوم) ڕاتبوارد. (تورات) ئەڵێ: " ناوی خەزووری (موسى) (هانْ مَدْيانْ يَثْرونْ) بووە ئێمەش ئەڵێين: " ناوی (شُعيب) بوە ، بۆ (تصحيف) و (تحريف) لێك دوورن ﴿ثُمَّ جِئْتَ﴾ (إلى هُنا) ﴿عَلَى قَدَرٍ﴾ زەمانێ (مُقدّر) و (مُعيّن) لای خوا، يا خود

بە (تقدیر)ی (إلهی) هاتیە ئەو (مقام)ە. وە (إلاّ) (مقصد) و ڕێت نەبوو: وە (رسالەت) و گفت و گۆ و شونەوی، لە (خدمەت) (ذات)ی (کبریائی)، نە دەهاتە (وَهْم) و خیالْت ﴿يَا مُوسَى﴾ (ختام)ی (مرّه)ی (أخرى) ﴿وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي﴾ بۆ خۆم پێم گەیاندووی، بە (صَبر) و (ثُبات) و (عَزم) و (جَزم)، قالْ بوونەوە لە (شَدائد) و (أهوال) و (خُشونەت)ی (عیش)، بۆ (رسالەت)ی خۆم دروست کردی. تووم کردە ئەو (ذات)ە، بێ (شُبهە) بزانە (مُوفّق) ئەبی (حاصل)ی پەروەردەی (إحسان) و چراغ و نەمامی خوایە ﴿اذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِآيَاتِي﴾ (عصا) و (ید) ئەبێ (آیەت)ەکی واش هەبێ (هارون) (علاقە) کی لەگەڵ هەبێ، وە (إلاّ) (عصا) و (ید)ی (بیضا) هی (موسی)یە، (هارون) ببێ نەبێ، یەکسانە ﴿وَلَا تَنِيَا فِي ذِكْرِي﴾ (فتور) مەکەن، (هارون)یش (داخل)ی (خطاب) بووە، (أنّهُ) (حاضر)ە ﴿اذْهَبَا إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى﴾ لە (حد) دەر چووە. وە (ممکن)ە (حِينَ المُلاقات) ئەو (أمر)ەیان پێ کرابێ ﴿فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَّيِّنًا﴾ بە نەرمی و (أدەب) و (حُسنی) (تعبیر)، (بعض)ێ (جامد) هەن کە (أمر)ی بە (معروف) ئەکەن، قسەی دروشت و ناشرین و دوور لە (حُسنی) (مُعاشرە) و (آداب) ئەکەن. گۆی یا ئەوانە (مُتعصب)ی (لله)ن، (لا یخافوُن و لا یُبالوُنَ) (حقیقة)ئەمە (جهل)ە، بێ (تدبیر)ی بە (کلام)ی بێ (مُجاملە) و (مُلایمە) ناچێتە ناو گوێ ی، (مجرا)ی (سماعی) لێ وێك دێ، بێ (فائدە) ئەمێنێتەوە، ناگاتە دڵ. ئەڵێن: ، قسەی جوان و بە (طراوەت)، بێ (إذن) ئەچێتە ناو (أُذُن)! "

﴿لَّعَلَّهُ﴾ بەڵکوو ﴿يَتَذَكَّرُ﴾ (تأمُّل) و (تفکرّ) لە (حالْ)ی خۆی ئەکا، تێ‌ئەگا، ئەوەی ئەیکا خراپە، شایانی (مقام)ی (حُکمداری) نیە. لە (إنسان) ناوەشێتەوە، خۆی بە خوا، یا (غیر)ی خوا، بە خوا بزانی! (عبادەت)ی‌کەن، یا(عبادەت)ی کا ئەگەر (عاقل) و (مُتفکرّ) بێ. (غایەت) (کبر) بوویتە پەردەی (بصیرەت)ی ئومێدە بە (إرشاد)ی (حکیمانە)ی ئێوە پەردە (إزالە)کا،

(حقایق) ببینیٚ ﴿أَوْ يَخْشَى﴾ ئەگەر وانەبیٚ (ممکن)ە بترسیٚ (ذاتاً) (إنسان)ی (مغرور) بە ترس نەبیٚ، نایەتە ڕای. لە (قرآن) وا دەر ئەکەویٚ، لە (أوّل) (وَهْلَه) خوا نەی فەرمووە (من دلّی ڕەق ئەکەم، وە (إیمان) نایەنیٚ (حقیقةً) ئەبیٚ وابیٚ. (لکن) (تورات) قسە ئەهاویٚ، بە (موقع) و بیٚ (موقع) ﴿قَالَا﴾ هەر دوو برا ﴿رَبَّنَا إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَا﴾ تالّووکە بکا، نەیەڵیٚ بگەینە (مقام)ی (تبلیغ)، تا بە نەرمی قسەی لەگەڵ بکەین، ئومێدمان بە (تذکّر)و ترسانی زۆر (ضعیف)ە؛ (حتّی) بەقەد، (مفاد)ی (لعلّ)ەش نیە ﴿أَوْ أَن يَطْغَى﴾ لەسەر ئێمە، یا لەسەر (بنی إسرائیل)ی، بە جاری (إستئصال)یان کات (حُکمدار)یٚ (مغرور)ە، (مُستبدّ)ە، (مُعارض)ی نیە، (نافذُ الکَلِمه)یە، هەرچی بیکا، ئەیکا؛ (ممکن)ە بمانکوژیٚ.

هەزار ئافەرین لە (موسی) و برای، تا (دائر) بە (أحوال)ی خۆیان و (خصم)یان (وَثیقه)یان لە خوا وەرنەگرت، (بلا تدبیر) و (تفکّر) (یەکی (أعلا)، باش (اوستنە))، (قبول)ی (رسالەت)یان نەکرد! ﴿قَالَ﴾ خوا فەرمووی: ﴿لَا تَخَافَا﴾ مەترسن، لە (إفراط) و (طُغیان)ی (فرعون) ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ ئاگادارتانم (فَأْتِیَاهُ) بچنە لای ﴿فَقُولَا إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ﴾ خوای توو، هیچ کە (إدّعا)ی خوایەتی مەکە، ﴿فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ بەرەڵایان کە، لەگەڵ ئێمەیان خە، چیدی لە بن (نیر)ی (أسارەت)یان مەخە ﴿وَلَا تُعَذِّبْهُمْ﴾ بەسیە چیتر (عذاب)یان مەدە، (جمع) و (تفریق)ی (عناصر) شایانی ئێوە نیە ﴿قَدْ جِئْنَاكَ بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكَ﴾ أمّا آیَة! فەرقي جَمْع و مُفردي نیە، هەر فَرْدەکي جمعەکە. تۆشی بە إرْشادي ئێمە وەرە سەر هدایەت، هدایەتي دین و دنیا، هیدایەتی حوکمداري و ڕەعیەت پەروەري. ﴿وَالسَّلَامُ﴾ لە طَرَف خوا، یا سەلامەتي. ﴿عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى﴾ أما سەلامي خزنەي جَنَّة، حقیقةً زۆر دوورە، أوائلي رسالەتە، ماویەتي بۆ بیاني أحْوالي جَنَّة و نار و گفتوگۆ و شنەوي خزنەیان! ﴿إِنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَا أَنَّ الْعَذَابَ﴾ حتّا ذهابي مُلك و

سەلطەنەت. ﴿عَلَى مَن كَذَّبَ﴾ بە آیاتی إلاهي، کَوْني قَوْلي. ﴿وَتَوَلَّىٰ﴾ إعْراضْ بنیّ لە عدل و هیدایەت، گویّ نە داتە نُصْیحي ناصِحان، دوای هەوای خۆی بکەویّ! ئەوانیش چوون، تَبلیغي رسالەتیان کرد، بیّ هەرا هەرای قصّاصان.

﴿قَالَ﴾ فرْعون، لە جەوابي تَبْلیغ و أداي رسالەت. گویّ مەدە حکایەتي (وَهَب بنِ مُنَبِّه) وَلَوْ (أحْمَدْ) نَقلي بکا! زاتاً نُقاداني حَدیث إعتنایان بە نَقدي أحادیثي مَناقب نەکردیە! فَضل لە حکایەتی قصّاصان، تەماشاي (وَهَبْ) بکە ئەڵیّ: «بَعْدَ الّتبلیغ أمري دا بەگرتِنِ (موسى)، تاویاندایە بیگرن، موسى عصای فریّدا، جُندي فِرْعَون و فِرْعَون هەڵاتن، (٢٥٠٠٠) بیست و پیّنج هەزار کەس یەکتریان کوشت، ئەڵیّ کەهەڵاتینە یەك بەر یەك داهاتینە ئەوەندەیان لیّ مردینە.». ئەبیّ زۆریش نجاتیان بووبیّ! ئەو هەمو لەشکرە لەو مقامە کوو جیّی ئەبیّتەوە؟ بەمکرۆ فونیش أمري فِرعَونیان ناگاتیّ! فِرْعَون وَ لَوْ کافریش بووبیّ، حەق نیە قسەي سووکي لە حەق بکریّ! ئەگەر ئەو هاي و هوویە أصلیّکی هەبا، ئەلبەتە(قُرآن) إشارەي بۆ ئەکرد! ﴿فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَىٰ﴾ من بەخیّوم نەکردي؟ ئیّوە لە ژیّر دەستي من نین؟ ربّي ئیّوە، منم! مُمکنە لە (ربّ) قلبی شەکي کردبیّ!

﴿قَالَ﴾ مُوسی فەرمووی، أصل موُسی‌یە، وَ بَعْدَ خِطابِهما بە خصوصي نداي کردە موُسی، وە دوو کەس پیّکرا جواب بدەنەوە، بیّ مَعْنایە! لەوان ناوە شیّتەوە! بەڵیّ قَوْمي بیّ إنتِظام، جمعیّ سینگ هەڵکیّشی ئەکەن، نۆرە نادەنەیەك، پیّکرا جواب ئەدەنەوە، لای سائلی گەورە بیّ قیمەت ئەبن! ﴿رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ﴾ ئەو کلامە زۆر پر مَعْنایە. (داروین) بە قاعدەی نشأ و إرْتقا و إنتِخابی طَبیعی، لەگەڵ مؤیّدیّ وەك (هیکسلی) حُکَماي أقدمین بە قَوْلي إمْتِزاجي عَناصرْ وَعَرَضي أمْزاجي أنواعي مَوالید وأنواع نَوْع و أصْناف و أشْخاص و أعْضاء، حُکَماي جَدید لەگەڵ قَوْل بە ترکیبی کائنات لە کمترنیاتی کَهرَبائي_ ئە لەکترونات_ بیّن معلوماتي خۆیان دائر بە عالەمي

تَطَوّر و تَرَكُبْ بكەنە تفسیري ئەو ئایەتە کریمەیە!! حقّا قُرآن حەقي لەسەر (موسی) زۆرە کە نسبەتي ئەو کلامە بۆ ئەو ئەدا! زاتيَ بَلاغَة و نَظَر و فکري بکاتە ئەو دەرەجە، با زوباني (لَکْن)ي هەبێ، چ زیان و نُقْصاني نیە! هەر چەند (كُلَّ شَيْءٍ) عامّە، أمّا جُملەي ﴿ثُمَّ هَدَى﴾ كُلّ مُيَسَّر لما خُلِقَ لَهُ، لەگەڵ عالەمي حَیاة، بەڵکو حَیْوان بە مَعْناي شامِلْ بۆ إنسانيش، أمالە ئەکات! (أتباع)ی (داروین) بە (عقل) و (إنصاف) تەماشاکەن، ئەو (نظم) و (ترتیب) و(تشکیل) و(وضع)ی (قُوای) (عامل)ە و (مدُرك)ە لە (مواقع)ی خۆی، بنوارنە (هەیکەل)ی (إنسان) و (حیوانات)ی (راقی)یە، (معمل)ی (طبیعي)، (معمل)ی (کیمیائی) (معمل)ی (میکانیکی) لە (طبیعەت)ی بێ (شعور) چۆن (صادر) ئەبێ؟ جووجیلەی مریشك لە قەپێلکە دێتە دەر، (خلق) و (إدراك)ی تەواوە، (کامِل العَدَدِ وَالْعُدَدْ)؛ (آناً) (درك)ی دوشمن و دۆست ئەکا. ئەوە لە (طبیعەت) ئەبێ؟ بێ (صانع)ێ (غایەت) (علیم) و (حکیم) و (قدیر) و (مُدبّر) چۆن دێتە (خیاڵ) و (وَهَمْ)؟ کەسێ هۆشی هەبێ، (أثر)ی (علم) ئەزانی. هەزار کەڵەکە بەردی نارێك ئەبینێ، (فاعل)ت نایەتە (ذهن)؛ دووسێ بەردی (مُنظّم)ت دێتە پێش، دەر (حاڵ) دێتە (قلب)ت ئەمە (أثر)ی (علم)ە. تاتە بەردێ ئەبینی لە (دور)ەی کانییە، ئەزانی ئەمە بۆ نوێژ رێك خراوە. وەکی (بعض)ی لە (حُکما)ی (جدید) ئەفەرموون: " (مُناسبە)ی (عقل) لەگەڵ (نسج) و (ترکیب)ی دەماغ چیە؟ " (رەحمەت) لە (حکما)ی (إلهیّون)ی (قدیم) بێ کە ئەڵێن: " (مناسبە) لە (بین)ی (علّەت) و (معلول) (لازم)ە".

خۆزیێ بمزانیبا (مَعْنی)یە (محرّر) بۆ (طبیعەت)! تا (تصوّر) بکەین شتی (حکیم) آنەی لێ (صادر) ئەبێ یان نا؟ لام وایە (مُتکلّمون) و(طبیعیوّن) بە (صورەت)ی (تفاهم) لێك بییەن (مُنازع)ە هەڵ ئەستێ. (أعمال) و (عُمّال)ی (طبیعیّە) (إنکار) ناکرێ. (مشهور)ە (ترتیب) و( تنظیم) و (إحکام) بە بێ (علم) و (قُدرەت) و (إرادە) نایەتە (وهم)، خوا (معمل) (ترتیب) ئەدا، (عمل)ە

ئیش ئەکەن، ئەگەر (تدبیر)ی (علم)ی نەبێ، ئەو (عمل)ە لە (معمل)ی چۆن گرد ئەبنەوە؟ (لکن) وەکي (سَعَدُ الملّةِ وَ الدّین) ئەفەرموێ_ لە (بین)ی خۆیان و (معتزلی)یان_ : " ئێمە ئەتوێینە (سبب)ی (بعید)، ئەوان ئەتوێنە (سبب)ی (قریب).. إلخ..." بزانن (خلق) بێ (طبیعەت) و (خالق) نابێ، (أقسام)ی (هیُولا)مان (سابقاً) زانیوە؛ (غریزی)، (حسیّ)، (عقلی)، (وهمی). ﴿قَالَ﴾ (فرعون) ﴿فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الْأُولَى؟﴾ (إنسان) لە (حقیقەت)دا نازانێ (فرعون) ئەو (کلام)ە ی چۆن (تلقیّ) کردیە؟ (مُقابل)ی ئەو (کلام)ە (مُحیط)ە (سؤال) لە (أحوال)ی (أُمم)ی ڕابردوو ئەکا.. (لکن) وادیّتە (خیال) (فرعون) زۆر چاك لەو (کلام)ە گەیشتیە، وە(سعەت)و (إصابە)ی (علم) و (نظر) و (فکر)ی (موسی)ی لیّ (معلوم) بووە. هات دۆلابەکی گێڕا، (سؤال)ی لە (تأریخ)ی ڕابردوان کرد، وای زانی ئەمە (حقّ)ی (رسالەت) نیە؛ تا لە (نظر)ی (عوام) (نقص)ی (علم)ی (موسی) دەرخا ﴿قَالَ﴾ (موسی) ﴿عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي﴾ (تأریخ) بێ (روایەت) و (تحریر) و تقدیر نازاندرێ. (نظري)نیە، بە (فکر) و (أعوانی)ی بزاندرێ، (سمعی)یە. لە (زمان)ی (قبل التأریخ) چ بلّێین؟ وە (هَمْ) (إحاطە)بە (تأریخ)ی (قرن)ی ئیهەموو (سُکّان)ی (ارض) (قابل)نیە.

(حتی) ئەمڕۆ کە (واسطە)ی ئاگاداری (أقوام) بەسەریەك چەند زۆرە، (مُمکن)نیە، (فَکَیْفَ) بە (زمان)ی (حضرەت)ی (موسی)؟! (علم) بە (أحوال)ی (عموم)ی لای خوایە ﴿فِي كِتَابٍ﴾ : (مُحرّر) و (مَضبوط) ﴿لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى﴾ لیّ ی ناگۆڕێ، لە یادی ناچێ، نەك (فرد) بەڵکو (کلّ)ی (ذرّە)یە لە (ذرّات)ی (عالەم) لای (ممتاز)ە لیّی گووم نابێ، هەروەکو (قَبْلَ التّشکیل) (موادّ)ی یانی لا (معلوم) و (مُقدّر) و (ممتاز) بووە، (کذا) (بعد التّحلیل) ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا﴾ کلامي خوایە رأساً، خۆي ئەیفەرمووێ، یا بێ (قال)، موسی ذکري ئەکا! ئە و وەقتە (أخْرَجْنا)ي دوایێ ئەبێتە (إلتفات) بێ شك و خلاف. ئەگەر رأساً کلامي موسی بێ ، لە (أخْرَجْنا)

مُضْطرِ بن! حتّى بعْضي ئەلّێن: ئەوە رأساً كلامي خوايە. أمّا تَوْجيهي (إبنُ المُنير) ئەوە لە قبيلەي قسەي أعواني ملكە، أمرماندا وامان كرد، مَقْصَديان ملكە، زۆر چرووكە!! رسالەتی (موسى) بۆ إرشاد و هدايتە، مُداخلەي إيجاد و إخراجي أشياي نيە! حەقي لەگەلّ عالەمي تكوين نيە! إلاّ بە إسْتدلال نەبیّ! أعواني مَلِكْ بیّ مُلابسە و مُناسبە، نالّێن وامان كرد وامان نەكرد!!. ئەو خودايەي كە ئەرزي بۆ ئێوە كرديتە لانك، بەئەرزي ئەوي خەوي لەسەر بكەن! ﴿وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا﴾ چەند رێی بۆ ئێوە گوشاد كرديە، بۆ سَهْلي و جَبَلي. ﴿وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾ لە طرفِ عُلو باراني نارديە. أنَّهُ جەنابي باري قسەي لە (موسى) وەرئەگرێ، وَجْهي تَفْريعي ئەفەرموێ ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِ﴾ بە ئاوەكە. هەرچەند أشاعرەي ئێمە علّيەت و مَعْلوليّەتي حقيقيان بَينَالأشياءْ لانيە، بۆ غَيْري خوا ئەيكەنە أمري إعْتيادي! حتّا ئەلّێن: نسبەتي ئاوو ئاگر بۆ إرْواو إخراق يەكە! اما تَأْثيري (بِإذْنِ الله)ش، كە قَوْلي (غزالي) و (ماتُريدي)يانە، ڕوو پۆشيە! مَعْناي (بإذنِ الله) چيە؟ ئەگەر إذْني تكوينيە، قَوْلي مُعتزليانە! ئەگەر إذْني تكليفيە، نيە! وكَذا مُقابِلي (عادةُ الله)ی أشاعران، (سُنَّةُ الله)ی (سَيّدِ رَشيد) و سلفيان، مُزخرفە! ئەگەر سَبَبِّيَةْ هەيە، عادەت و سُنَّةْ نيە! ئەگەر نيە، عادەتُ و سُنَّة يەكن! إنكاري تأْثيري بَعْضي أشيا لە بَعْضي، ئێستا إنْكاري بديهيّاتە! بەلاّم تأْثيري وانيە مُغني بیّ لە خوا، موجبی كُفرو شِرك بیّ! تأْثيري خلق و إيجاد، عائدي كبريائيە! ﴿أَزْوَاجًا﴾ تفسيريان كرديە بە أصْناف و أنْواع. فەيدي نيە مقصودي لیّ بە دەست ئەكەوێ! زاتاً تا ئەو آواخرە كيفيەتي زواجي نباتات معلوم نەبوو بوو.

ئەو (أزواج)ە ﴿مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ﴾ زۆر بلاّو، ﴿كُلُوا وَارْعَوْا أَنْعَامَكُمْ﴾ لە نباتات و محَصولي نباتات. لەبەر رعايەتي (أنْعامْ)، نەيفەرموو (وَأَنْزَلَ لَكُمْ)، گەرچی إستفادەي أنعاميان، إستفادەي خۆيانە! ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ﴾ ئەگەر تەنها بۆ قريب إشارەبیّ، دوور نيە! بۆ عموم، ئەلّێن: ئەوی ذِكر كرا! ﴿لَآيَاتٍ﴾ زۆر وگەورە

﴿لِّأُوْلِي النُّهَى﴾ جَمْعي (نُهيه)يە، بە مَعْنـا عقڵـە. ئـەوی عاقـڵ بـێ أثـري علـم و قُدرەت ئەزانێ، تَفْريقي ئەكا. ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ﴾ ئـادەم. وەئێمـەش لـە مَـوادي ارضيَّه عُنصريّە، خلق كراين.

﴿وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ﴾ بَعْدَ التَّحليل، باوڕ مەكە جَسَدي إنساني هەرچی بێ، تحليل نەكاتەوە سەر عَناصِري أصليّە! بەڵكو جَسَدْ تـا لَطيـف تـر بـێ، زووتـر تحليـل ئەكا! ئێسك گەلێ پاشي گۆشت ئەرزێ لە ناو ئـەرزي! ﴿وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَـارَةً أُخْـرَى﴾ بـارێ دیگـەر عناصـر گـرد ئـەكاتـەوە_ علـى الطِّـرازِ الأَوَّلِ_ تـشكيلي ئەكاتەوە! واقعاً مُمكنە، لاي خوا دوور نيە، بَعْضي أجساد لە ڕزين حِفظكا.

أمّـا قَـوْلي ئـەوە دلالـەت ئـەكـا لـە تَـشْريفي أجْـسادي (فراعنـە) تـا ئـەو نێزيكانەمان تێك نەچوون سبب بە (موميا)! ئيتر خۆت حَكَمْ بـە، إعْتقـاد دوور كردن لە قَواعِدي طَبيعي لەو نوعە مسائلە، لام وايە زۆر بـە قيمـەت نيـە!! مَـعَ أنَّهُ مدار لەسەر بقاي رووحە، ئێمە وەكي نباتات ڕەگ و تۆمان لە ناو عارد نيە، لە ناو خۆمانە، بۆيە إنسان ئەنێـژرێ أمّـا شـين نابێتـەوە، وەقـتێ بـە قُـدرەتـي إلاهي شين بۆوە ژياوە، ئيتر نامرێ! ﴿وَلَقَدْ أَرَيْنَـاهُ آيَاتِنَـا كُلَّهَا﴾ ئـەوي قـەرار دادە بوو. ﴿فَكَذَّبَ وَأَبَى﴾ (إيمان)ى نەيەنا دەسـتي لـە (تعـذيب) و (تـسخير)ى (إسرائيلی) هەڵ نەگرت. (براهين) لە (إنسان)ى (جبّـار) و (متكبّـر) و (عنـود) و زەبر بـە دەسـت (تـأثير) ناكـا ﴿قَـالَ أَجِئْتَنَـا لِتُخْرِجَنَـا مِـنْ أَرْضِـنَا بِسِحْرِكَ يَـا مُوسَى﴾ دەست لە (بـني إسـرائيلي) هـەڵگرين، بـە (حريـەت) و سـەربـەسـتي بژيەن؟ پاش چەندی (لاشك) (إستيلاء) ئـەكـەی، (مـصر)ىيـان لـەسـەر مـاڵ و موڵكی خۆ دەرئەكەی! تـوو گوايـا بـۆ (إرشـاد) لای خـوا هـاتوو وی؟ (حاشـا) (خدعە) كی (سياسی)يە، ئەو (آيات)ى توو (سحر)ن. ﴿فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِ﴾ وەكی (سحر)ى تۆ، تابۆفت بەدەركەوێ ﴿فَاجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا﴾ ئـەمـەش زێدە (جسارەت) و (لا أُبالی)يە لە (موسی) (طلب) ئەكـا، (ميعـاد)ى (إجتمـاع) دانێ ﴿لَّا نُخْلِفُهُ نَحْنُ وَلَا أَنتَ﴾ خۆنەدزيەوە ﴿مَكَانًا سُوًى﴾ جێ يە ڕاسـت، بـێ

پەنا و پێچ، کەس لە کەس بزر نەبێ، تا فێڵ و (حیله) و دەغەڵی لێك نەکرێ، ئەوەی (ابران)ی ئەکەن (عَلی رؤسِ الأشهادْ) بێ، یاخود جێ یە بێ بۆ حاڵی هەر دوولا (مُساوی) بێ، (عظمەت) و (کبریائی) بۆ (طرف)ێ، (مذلّەت) و (حقارەت) بۆ جهەتی نا بێ (فرق) و جودایی لە (بین)ی (رئیس) و (مرؤس)، (سائس) و (مسوس)، (سیّد)ی (نُقّاد) و (وُقّاد) (آلووسي) ئەو دوو (معنا)یەی پەسند کردیە. هەندێ مەعنای تریان فەرموەوە، رای لێیان نیە، (حقیقةً) (رأي)ی نەبوونی بە جێیە ﴿قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ الزِّينَةِ﴾ رۆژی جەژن، (حقاً) (مقابلە)یە (عجیب)ی کردیە، ئەو رۆژەی دانا، کە (کمال)ی (کوکبە) و (حشمەت) و دارایی (فرعون) و (قوم)ی تیا (إظهار) ئەکرێ ﴿وَأَن يُحْشَرَ النَّاسُ ضُحًى﴾ (ظاهر) وایە لە رۆژی (زینەت) (وەقت)ی (ضُحی) (قوم)ی (فرعون) بۆ (إظهار)ی (سرور) و شادمانی، دڵ گوشا و با(صفا) ئەمە (عادەت)ە لە (أغلب)ی شاران_ خاصةً _ (عاصمه).

(بِناءاًعَلَيْهِ) ئەوە (تعیین)ی (زمان) و (مکان)ی تیایە. (أمّا) (تفسیر)ی (موعد) بە (معنا)ی (وعد)ی (مصدری) (جواب) بە (موعد)ی (مکانی) و(زمانی) (مُوجب)ی (تشویش)ە. ئەوەش لەبەر (خُلف) تووشی بووین، چ (قید)ێیە (موعد) بە (معنا) (زمان) و (مکان)ی (مُعیّن) بێ؟ یاخود ئەیکەینە (مُتعلّق)ی. (ذاتاً) ئەبێ (وعد) بەشتێ بێ، (وعد)ی بدا بە (زمان) و (مکان)ی معین چتاقمان (تخلف)ی لێ نەکەین. (تعرّض)ی بۆ (مکان) لەبەر (سُوی)یە ﴿فَتَوَلَّى﴾ گەڕایەوە لە (مجلس) (فرعون) ﴿فَجَمَعَ كَيْدَهُ﴾ (أسباب)ی (حیله) کاری گرد کردەوە ﴿ثُمَّ﴾ دوای ئەمە ﴿أَتَى﴾ بۆ (موعد). (طبیعي) (موکب)ی (ملوك) دوای دێ ﴿قَالَ لَهُم﴾ بە (سَحَر)ەکانی ووت: ﴿مُوسَى وَيْلَكُمْ﴾ (وَيْلي) بۆ ئێوە ﴿لَا تَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ كَذِبًا﴾ بە (آیات)ی (إلهی) مەڵێن: " (سحر)ە" ﴿فَيُسْحِتَكُمْ﴾ ئەگەر (إفترى)بکەن ﴿بِعَذَابٍ﴾ (أَسْحَتَ الشَّيء) (إِسْتأْصَلَهُ) (أصل) و (أساس)تان نایەڵی، لەڕەگ و ڕیشەتان دەردێنی ﴿وَقَدْ خَابَ مَنِ

آفْتَرَىٰ﴾ هەر کەسەکی ببی، (مادام) وابیٚ دیارە من (مُفتری) نیم ﴿فَتَنَازَعُوا أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ﴾ ئەوی پیٚیان سپاردرا بوو کە دەر (عهد)ی بوو بوون (یعنی) لە (غلب)ە لەسەر (موسی) کەوتنە (مشاورە) و (مُناظر)ە و گفت و گۆ، چۆن ئەبیٚ؟ چۆن نابیٚ؟ چیبکەین؟ چی نەکەین؟ ﴿وَأَسَرُّوا النَّجْوَىٰ﴾ (خلوەت)، قسەی بەدزی ﴿قَالُوا﴾ (سحر)ە: ﴿إِنْ هَٰذَانِ لَسَاحِرَانِ﴾ بە (حقەت) ئەوانە (ساحر)ن، (رسول)نین، ئیٚوە و خودا (فهم)ی (معنا) ناکریٚ، تا ئەڵیٚن: "هذین"؟ (مَعَ أَنَّهُ) بیستراوە لە چەند (أقوام)ی (عرب) وە (مُناسبە)ی لەگەڵ (بنا)ی (هذا) جوانتری ئەکا.

گەر حەزت لە(قال) و(قیل) و(قرائەت)ی (مُختلف)ە، وە (بعض)ی (حکایەت)ی (مُختلف)ی هەیە تەماشای «روحُ المعانی» کە (رەحمەت) لە (مُؤلّف)ی ﴿يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم﴾ دیارە (رآسەت) بۆ (سحر)ە نامیٚنی، (أَوْ أَنَّهُ) ئەبنە (رئیس)ی (دین) و جیٚ بۆ (ساحر) آن نامینیٚ، (إخراج)تان ئەکەن ﴿بِسِحْرِهِمَا﴾ (ألات)، (کیاسەت) و (سیاسەت) و (حذاقەت) ﴿وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ الْمُثْلَىٰ﴾ (طریق) و (مذهب)ی کە (أمثل) و (أفضل)ی (طُرق) و(مَذاهِب)ە، (یعنی) ئەو (دین) و ئایینی بوو ویانە، بە (سحر) و (شَعوَذ)ە کەرایان گرتیە، (ولَوْ) (نفس)ی (سحر) (دین)یان نەبوو بیٚ، (بناءاً علی هذا) ئاگادارین ﴿فَأَجْمِعُوا كَيْدَكُمْ﴾ ئەوی (فکر) و فیٚڵە گردی کەنەوە، ﴿ثُمَّ ائْتُوا صَفًّا﴾ رِوو بەرِووی (موسی) بە (جماعەت) و رِیز وەرن، یا پاتە و پانی یا لە دریٚژی، (ساحر)ە کان چەند بوون؟ پانزدە هەزار، وە (سی) وئەوەندە هەزار، وە حەفتا هەزار...

(مُبالغە)یە بیٚ (مەعنا)یە لەو مەیانە، (غلب)ە بە (عدد)نیە، کەم و زۆری (عدد)ی چ نیە. (قوەت)ی (سحر)یان گەر نەبوو بازو بەکار ئەهات؟ ﴿وَقَدْ أَفْلَحَ الْيَوْمَ مَنِ اسْتَعْلَىٰ﴾ هەموو رِۆژی هەموو زەمانی وا بووە، وادەبیٚ، کەس لای تیٚ شکاو، بەبنکەوتی نیە، ئەوجا ئاگاتان لە خۆبیٚ بەسەرکەون، (فوز) و

(فلاح) لەدەست مەدەن ﴿قَالُوا يَا مُوسَى إِمَّا أَن تُلْقِيَ﴾ ئەڵبەتە خەبەریان هەبووە کە موسی عصاي ئەهاویشتە سەر عارد، ئەبووە مار، ووتیان پاش هاتن بە طرازي سابق ئەی مُوسی، یا تۆ لە اوّلەوە عصات فرێدە ﴿وَإِمَّا أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَى﴾ جەنابی مُوسییان مُخیّر کرد، لەبەر وثُوق بە غلبەي خۆیان، یا لەبەر ادبێ عائدي و جْداني ئەوانە.

﴿قَالَ﴾ مُوسی ﴿بَلْ أَلْقُوا﴾ ئێوە باوێن لە اوّلەوە! نازانم کێیە؟ ئەڵێ: ئەمە دروست نیە، تجَویزي سحرە! ئەیکا بە وَعیدْ، نازانم ئەڵێن چی؟! مَقامْ مَقامي مُناظرەیە، هێشتا رسالەت لە مَعْرضي إمتحان دایە! حورمەتی سحر و حورمەتي تَجْویزي لەکێ؟ یا وجود ئەوان بە (مُوسی)یان ئەگوت ساحرە! تهدید وعَیدي (مُوسی) دەربارەی مُفْتَریان تێپەڕي!.

ئەوانیش عَصا وحِبالي خۆیان هاویشتە سەر عارد ﴿فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ﴾ بۆلای مُوسی. ﴿مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى﴾ وەکی زیندی حرکەیان ئەکرد، وە ئەهاتە خیاڵی، مخیَّلْ وایە، وانیە، هیچ!. لە زاتەکم بیست فەرمووی: جْمعي دانیشتبووین شَخْصي بَعضە شتێ وەك کۆتر و کەروێشك نیشاني ئەدایِن، وامان خیاڵ ئەکرد، کە ثابت و مُحَقّقن، پیاوي فوتوغرافي مَجْلسي کێشا، غیري خۆمان چ صورەتي تري تیا نەبوو! بەوە زانیمان مخیّلە أَخْذي بالعُیُونە!. سحر چیە؟ (إمامي رازي) و (بَیْضاوي) و أمْثالیان، قسەیان لێ کردیە. لام وایە بە غَیري مَعْناي عبارەت چیتري لێ نازانن!

﴿فَأَوْجَسَ﴾ إخْفاي کرد ﴿فِي نَفْسِهِ خِيفَةً﴾ ترسێ، زۆر، یا کەم ﴿مُوسَى﴾ أمّا أثري لێ ظاهر نەبوو. ئەو ترسە طبیعیە حاجەت بە چیرۆکە نیە. ﴿قُلْنَا لَا تَخَفْ﴾ مەترسێ أمین بە ﴿إِنَّكَ أَنتَ الْأَعْلَى﴾ مُحقّق تۆ بە سەریان غالب ئەبي مُمکنە رعایەتي عُلوەکیان بۆ بکرێ، کە لەو حینە، إیمانیان هێنا. أعلی ي (مُوسی) بووە سَبَبی عُلویان، بەلام لە مُناظرە ژێرکەوتن! ﴿وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ﴾ وەك سابقاً أمرت کرایێ! ﴿تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا﴾ قووتیان ئەدا. عصا

ببێتە مار، دوور نیە ئەو حبال و عصیّە قووتدا وە نەپەندمیّ!. نازانم (شیّخ محمد عبده) بۆ چی إنکاري ئەکات؟ ئەگەر لەبەر تداخُل بیّ، سهلە قابلە بووینە شتیّ وەك غازي هەوائي لە مسامّي دەرکەوتبن! ﴿إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ﴾ سالّی چەند لە مەوپێش جَمْعي هاتنە (کۆیە) هەندیّ ألعابي هکذائیان کرد، گەورەکەیان ئەیووت: کۆیینە پێمان مەخەڵەتێن! ئەمە هەمووي بۆفە! ئێوە ئاگاتان لەو علمە نیە! کەسیّ ئاگادار بوویا، پاقري ئێمەي دەر ئەخست!. گەلیّکم دوعا بۆ کردن مەمنونیان بووم. ئەگەر وەك شێخەکان فێڵاوی بان، عالەمیان إغواء ئەکرد. ﴿وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى﴾ هەر کەسیّ بیّ، لە هەر کێوە بیّ! ﴿فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سُجَّدًا﴾ کەوتنە سجدە، سەر بەر زەمین. ﴿قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ هَارُونَ وَمُوسَى﴾ بۆ تقدیم و تأخیري (موسی) لە (هارون)، نُکاتي بلاغەتیان فەرمووە. مُمکنە بۆ تأکید ئەو کلامەیان تکرار کردبیّ، گاهیّ بە تَقدیمي (موسی)، گاهیّ بە تَأخیري، گاهیّ بە رعایەتي مقام، باریّ بە رعایەتي عُمر ﴿قَالَ﴾ فِرعَون ﴿آمَنتُمْ لَهُ﴾ بۆ (مُوسی). أصل ئەوە، رسالەتي (هارون) بە دوعاي (مُوسی)یە. صاحبی بحر ئەفەرمویّ: (أمن) ئەگەر تعلُّق بکایە خوا، وَصْلي بە (ب)یە_ أمنتُ بالله_ ئەگەر بە غیر تعلُّق بەستیّ، بە (ل)ە_ قسەیّ جوان و مربوط و بە نُکتە_ ئەگەر مُخالفەیّ ببیّ، ئەبیّ لەبەر إیجابیّ بیّ!. خۆشي ئەفەرمویّ (علی الأکثَر)!. فرعون ووتي إیمانتان بۆ هێنا؟ ﴿قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ﴾ یَعني بیّ إذنِي من. لازم نیە ئەگەر پرسیان پیّ کردبا، إذْني ئەدان! ﴿إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمُ الَّذِي عَلَّمَكُمُ السِّحْرَ﴾ بۆیە رعایەتتان کرد، سحریّ واتان نەهێنا کە مُقابلەي پیەکریّ لەبەر أستادي إیمانتان پیّهێنا– إنسان نازانیّ ئەو کلامە چۆن توجیە بکا ئەوەندە نابە جایە وەبیّ إنصافانەیە!!_.

﴿فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ﴾ راست و چەپ، ئەوە تُوانُن بە تەواوي تێك ئەدا! ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ﴾ هەڵتان دەواسم ﴿فِي جُذُوعِ النَّخْلِ﴾ مسألەي (في)، سهلە! أمّا (جُذوعُ النَخل) بۆ؟ ئەبیّ سرّەکي هەبیّ! نەمدیت

كەس قسەي لىٚ بكا! وعيدي بەجىٚ هێنا، نەيهێنا، نەي معلوم! (إمام) ئەفەرموىٚ: له اخبار ثابتْ نەبووه!

(سَيِّدي آلوسي) ئەفەرموىٚ: ظاهرَ سەلامەتيه! ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَا أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَى﴾ من يا ئەو خوايەى إيمانتان پىٚ هێنا لەسەر دەعوەتى (موسى) ؟ وا دەرئەكەوىٚ واى صلب نەدەكردن زوو بمرن نەفەسيان ببرىٚ، بۆيه ئەيهاويشتنه ناو كەلي داري خورماكە چقليان تێداچىٚ پتر ألم بچێژن. ﴿قَالُوا﴾ بلّێم: "سحره به (إعتبار)ى (ما قبل الآيمان) يا بلّێم: ئەو (مُؤمن)آنه وەك (فخرالدين) (إشارە)ى بۆ ئەكا" ﴿لَن نُّؤْثِرَكَ﴾ (إختيار)ت ناكەين، (ترجيح)ت نادەين ﴿عَلَى مَا جَاءَنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ﴾ (إيمان) كەبه (دليل)ى (قاطع) (ثابت) بوو، چووه ناو دلّ، به (عذاب)دان و كوشتن له دلّ دەر ناچى، بەسەر (حيات)ى (ترجيح) ئەكات ﴿وَالَّذِي فَطَرَنَا﴾ (جناب)ى (حق) (ترجيح)ت نادەين لەسەر ئەو كەسەى ئێمەى (إيجاد) كرديه، تابه (واسطه)ى (بيّنات) (إيمان)يان نەهێنا، (تأمّل)يان له (فاطر) نەكرد ﴿فَاقْضِ مَا أَنتَ قَاضٍ﴾ ئەوەى ئەىكەى بىكە، بىٚ (منّەت) به ﴿إِنَّمَا تَقْضِي هَٰذِهِ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا﴾ ئەوەى دەىكەى له (حيات)ى (دُنيا) پێت ئەكرىٚ، ئێمه چ دلّمان لىٚى نيه، (ذاتاً) ئەبڕێتەوە، ئەمرۆ ناسبەى ﴿إِنَّا آمَنَّا بِرَبِّنَا﴾ (ممكن)ە (عُموم)يان (مُراد)بىٚ، (فرعون) و (موسى) و (هارون) و خۆيان ﴿لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَايَانَا﴾ ئى (سابق) له (كفر) و (أعمال)ى (خاصّه) ﴿وَمَا أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ السِّحْرِ﴾ له (سحر) و (مُقابله) و (مُعارضه)مان خۆش، له (قيامەت) (مُؤاخذه)مان نەكات. (أمر)ى پادشاهان، (خصوصاً) يەكىٚ وەك (فرعون) له (تهديد) و ترساندنى خەڵكى دى به (قوەت)تر و هەژمەت تره ﴿وَاللَّهُ خَيْرٌ﴾ له (جهەت) (ثواب) ﴿وَأَبْقَى﴾ (يعنى) (لا ينقطع)ە، (مُقابله)يه جوان، دياره تا ئەو (وەقت) (دين)ى (ألْا سلامُ يَجِبُّ ما قَبْلَهُ)يان له (حضرەت)ى (موسى) نەبيستو. ﴿إِنَّهُ﴾ (شأن) ﴿مَن يَأْتِ رَبَّهُ مُجْرِمًا﴾ گوناهكار بىٚ لەسەر (كفر) و (معاصى) بمرىٚ (بعد الموت) يا رۆژى (جزا) بۆ

لای خوا بێ، بچێ ﴿فَإِنَّ لَهُ جَهَنَّمَ﴾ بۆ وی یە ﴿لَا یَمُوتُ فِیهَا﴾ تا (نجات)ی ببێ لە (عذاب) ﴿وَلَا یَحْیَى﴾ بە (حیات)ێ خۆش، (دائماً) لە (عذاب) دایە ﴿وَمَنْ یَأْتِهِ مُؤْمِنًا﴾ (ایمان)ی دروستی بە (ثمر) ﴿قَدْ عَمِلَ الصَّالِحَاتِ﴾ ئەوی بەجێ بێ، هەر (وەقت)ە (نوع)ە (عمل)ێکی لێ ئەوەشێتەوە، (مثلا) (عمل)ی (صالح) بۆ (مسلمان) آن ئەمڕۆ،کە (أکثر) وەك (بنی إسرائیلی) لە ژێر باری (أسارەت)ن، چارەی (نجات)ە ﴿فَأُولَئِكَ﴾ (إشارە)یە چەند جوانە ﴿لَهُمُ الدَّرَجَاتُ الْعُلَى﴾ (منازل)ێ پایە پایە بڵند ﴿جَنَّاتُ عَدْنٍ﴾ (بدل)ە یا (بیان)ە ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ جۆرو جۆبار ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ لە (جنّات) ﴿وَذَلِكَ جَزَاءُ مَن تَزَكَّى﴾ لە (کفر) و (عصیان) پاك و خاوێن بێ. (إیمان)ی بێ (عمل)ی (صالح) چ (تزکیه)ی تیا هەیە؟ ئەو (کلام)ە چ (رأساً) لە (طرف) خواوە بێ، وەك (مختار)ی (نەیسابوری)یە، چ (قول)ی تازە (مُؤمن)ە کان بێ، جێی (نظر) و(إلتفات)ی بۆ (مؤمن)ی (عاصی) نیە (مُناسب)ی (مقام) (إقتضا)ی (مقابلە) ئەکا، لە (بین)ی (کافر)ی (عاصی) و (مؤمن)ی (مُطیع)، ئەوان (جهنّم) ماڵیانە، ئەمان (درجات)ی (أعلی)، ئەگەر (مُلاحظە) بکەین (مؤمن)ی (عاصی) وەکی کام لایان نیە، بشچنە بەهەشت، ناگەنە (درجات)ی ئەمانە، کەوابێ (حاجەت) بە (مناظر)ە و (مُنازع)ە ی(سُنّی) و(مُعتزلی) نیە، هەر یەك (عصا)ی (قلم)ی هاوشێتیتە سەر کاغەز، وەك مار (جولان) ئەکا نازانم (سُنّی) چ(خیر)یان لە (مؤمن)ی (عاصی) دیوە؟ چ (أمل) ێکیان پێ هەن؟ ئەوەندە (طرف) داریان ئەکەن! لە (جهنم)دا ئەنوون، (عذاب) (درك) ناکەن! ئێمە (لله الحمد) (مؤمن)ین، وە بە (قدر) (حال) (عمل)ی (صالح) یشمان هەیە، (بعض)ە شەوی هاوین لە (کۆیە) گەرم ئەبێ، هەور و هەرا، پێشکە (هجوم) ئەکا، خەومان لێ ناکەوێ، آیا ئەوە هەر بۆ (عُصات)ی ئەو (أمّەت)ە یە؟ ئەدی (أمّەت)ە کانی‌دی؟ ئەگەر بڵێین: "ئەوان (عذاب) ئەچێژن" بۆ؟ گۆیا (قُرب)و زێدە (شەرەف)ی (حضرەت)ی (رسالەت) پەناە، لای خوا (إیجاب) ئەکات

(مُراعات)ی (عُصات)ی (أمّەت)ی بکا! چۆن؟ (بعث)ی (رسُل) بۆ چیە؟ لەبەر ئەو (نوع)ە (إغرا)یە بوو، (مسلمان) بێ (مُبالات) بوون؛ (علاوةً) (إنتساب)ی (مشایخیەت)ی هاتە ناو. وایان لێ هاتیە، ئەو (سیّآت)ی ئەمان ئەی کەن، مەگەر (کافر)ی زۆر (غلیظ) و دلرەق، بیکا، وە ئەو (ضرر)ی ئەو (نوع)ە (مُؤمن) آنە، بە (دین)ی (إسلام)یاندا، (کافر)ەکان ئەو (ضرەر)ەیان نەدا!

(إفساد)ی (ملیّون) لە (إعتقاد) (فدیە) و (أشباە)ی بوو، بە (مسیحی) بە ئومێدی (فدیە)ی (عیسی) ئەوی ئارەزوو کەن ئەیکەن، دەرکەی (درکات)ی (فسق) و (فجور)یان لە ولاتی ئێمە کردەوە (نعوذُبالله) بە هەزار (رسول)ی وەکی (قادیانی) و (بهائی) چ ناکرێ، ئەوانیش (علاوةً) بوونە (باعث)ی زێدە تێکچوونی (مسلمان)آن ﴿وَلَقَدْ أَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى﴾ لە پاش (ماجری)یە زۆر و (یأس) لە (فرعون) خوا هاویشتیە (قلب)ی (موسی) ﴿أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي﴾ شەو رۆیشتنیان پێبکە ﴿فَاضْرِبْ لَهُمْ﴾ بەچی؟ بە (عصا) ﴿طَرِيقًا فِي الْبَحْرِ﴾ لە (بحر)دا رێیەکیان بۆ بکەو ﴿يَبَسًا﴾ رێ یە هیشك ﴿لَا تَخَافُ دَرَكًا﴾ دوژمن بتان گاتێ ﴿وَلَا تَخْشَى﴾ لە (غرق) (سالماً) تیای تێئەپەڕن.

بەو (نوع)ە رۆیشتن ﴿فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِ﴾ خۆو لە شکری لە (تعقیب)دا چوونە ناو (بحر) ﴿فَغَشِيَهُم مِّنَ الْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ﴾ بەسەریان داهات، ئەوی بەسەریان داهات، چۆن چوونە ناو (بحر)؟ بە (صورەت)ی ناشیرین، کە (جبریل) دلی سەخلەت ئەبێ، لەو (خیالات)ە پیس و پووچە! (إمام فخری رازی) بە قسەکەیان (راضي)نیە، لە (قوم)ی (موسی) و (جُند)ی (فرعون) زۆر (مُبالغە) ئەکەن، لە شکرێ (مُقدمّە)ی حەفت سەد هەزار سوار بێ، (سائر)ی ئەبێ چەند بێ؟! ملیونیك و نیو (عەسکەر) بە جارێ لە (جبهە)یە چۆن (تعقیب)ی (عدو) ئەکا؟ ﴿وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُ وَمَا هَدَى﴾ کەس (کما آدّعاهُ) نە (طریق)ی (مُثل) یان بوو، نە (صلاح) کاری بۆ (قوم). کەسێ لە (سیر)ی

(جناب)ی (رسالەت) پەناه بفكرێ، (مناسبه)ی لەگەڵ (حال)ی (موسی) (عليه السلام) زۆرە.

چۆن خوا (نجاة)ی (موسی)ی دا، وە(موفق) بوو؟ (طه) تۆش (نجاة) ئەدا وە(مُوفق) ئەبی ﴿يَا بَنِي إسرائيل﴾ (جناب)ی (حق) (بعد النجاة) (ندی)يان ئەكاتیێ ﴿قَدْ أنجيْنَاكُم مِّنْ عَدُوِّكُمْ﴾ خۆتان ئه زانن چ دوژمنی (قوی) و (ظالم) بوو ﴿وَوَاعَدْنَاكُمْ جَانِبَ الطُّورِ الأَيْمَنَ﴾ (صفەت)ە بۆ (جانب)ی، (كيف)م لەگەڵ (جرّ)ی نايە، (جرّ)ی (جوار) بیێ، يا (غير)، خۆ ماندی كردن بە (توجيه)ی (قرائەت)ی (شاذّ)ەم بیێ هوودەيه، (يعنی)بە وێندەرێدا (عُبور) ئەكەن بۆ (أرض)ی (موعود) ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى﴾ ئەوێ دياره (مَواعد)ی (نزول) و (إنزال)ی (تورات)نيه ﴿كُلُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾ خاوێن و (حلال) و (زُلال) ﴿وَلَا تَطْغَوْا فِيهِ﴾ (تجاوز) له (حدّ)ی خۆتان بۆ (حقّ)ی ئيديكه مەكەن، ئەگەر (طغيان) بكەن ﴿فَيَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبِي﴾ (لازم) ئەبیێ وەك (حُلول) (دين) ياخود (أثر)ی (قرار)گيرئەبیێ، وەك (حلول)ی (عَرض) له (مَحَلْ) ﴿وَمَن يَحْلِلْ عَلَيْهِ غَضَبِي﴾ (العِياذُ باللهِ) ﴿فَقَدْ هَوَى﴾ له جیێی بلّند بەرئەبێتەوە، (هلاك) ئەبیێ ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ﴾ له (شرك) و گوناه ﴿وَآمَنَ﴾ (إيمان)ی بیێ (شائبه) ﴿وَعَمِلَ صَالِحًا﴾ باشی، رێك، چاك ﴿ثُمَّ اهْتَدَى﴾ بۆ مَصالحي دين و دونيا، ياخود دەوامي بوو تا آخر نەفەس له سەر إيمان و عَمَلي صالح. ئەو كلامه لەگەڵ (بَني إسرائيليان)ە، دَخلي بە قاتِلي (حَمْزه)ي نيه. ئەو تۆبه نەكا وه عَمَلي صالح نەبیێ، يا إسْتِقامه ي نەبیێ، ئايا خوا لێی خۆشي ئەبیێ يان نا؟ مَعْرَكەي سُنّي و مُعْتَزِليه!. لام وايه صيغەي مُبالَغه ي (غفّار) رێی نزاعيان نادا! مَعَ أَنَّهُ ئەوي لازم بیێ بۆ اوّلي نَشأتي دين، مؤمِني عامل و مُستقيمه! فاسِقي مُذْنبي بەد عمل، واجبُ الدّفعه! تەماشاي اِماميّه بكه له (إمام محمد باقر) نقل ئەكەن (ثُمَّ اهْتَدَى) أي إلى وِلايَتِنا__ ئەيهوو__

چناریێ از لورستان میبريدند كی از بويیێ دلاوێزی تۆ مَسْتَمْ

چ باس و خواسي ولايەتي أئمّە نيە! هەر دوو پێغەمبەر لەم هەنگاوەدا، ئاگايان لە أئمّەي أخلافيان نەبووە! سەخلّەتيە! أوائلي رسالەت! لە (نوح) تا (عيسى)، رسولێ نەبووە إشارەكا، فضل لە تصريح بە ولايەتي (عَلي) و أئمّەى كرام! ﴿وَمَا أَعْجَلَكَ عَن قَوْمِكَ يَا مُوسَى﴾ ايجازى قُرانى لەگەلەك جێ، ناظر ئەخاتە حيرەت، جامُفَسِّرني مُضْطَرين!. وەعدەى جەنابى كبريائى بۆ ميقات لە قُران معلوم بووە وە ذِكر كراوە، وە ذِكري ئەوەندە جُملەيە لەبەر بَياني حالّي قومە! جەنابى حەق ئەوەي لە حەقي بَني إسرائيلي فەرموو، ئەوانيش چوون و مُقابلەيان كرد. بۆ هدايەت دان وعْدي‌دا بە إنْزالي كتاب، موسى چوو بۆ كتاب، بەو نوعە خوا فەرمووي: بۆچى لە قَومي خۆت إنْفِرادت كرد؟ بەجێت هێشتن؟ ئەمەش حاشا عِتابي تيا نيە! بەلّكو مُقدّمەيە بۆ بَياني سوئي عَمَلي قوم!

﴿قَالَ هُمْ أُولَاءِ عَلَى أَثَرِي﴾ نێزيكن، يا لەسەر پەيڕەوي منن؟ مُنتَظري كتابن بە تەواوي إقْتداو إقْتداي پێ بكەن. ﴿وَعَجِلْتُ﴾ تالووكەم كرد. ﴿إِلَيْكَ﴾ بۆ طَرَفي كبْريائي ﴿رَبِّ لِتَرْضَى﴾ چونكي مُطيع و فەرمان بەرداريِن ﴿قَالَ﴾ خوا فەرمووي: ﴿فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ﴾ تجرُبەمان كردن. ﴿مِن بَعْدِكَ﴾ دواي تۆ بِلافاصِلْ ﴿وَأَضَلَّهُمُ السَّامِرِيُّ﴾ ئەو قومە قومێ نين لەسەر ڕەوشتي توويِن مُنتَظري تَكاليفي شرعيّە بن. كێيە (سامِري)؟ كێندەريە؟ لە چ قَوْمێكە؟ ناوى چيە؟ كێ بە خێوي كرديە؟ نايزانم! لە مَنبَعي مَوثوق چمان دەست ڕەست نەبووە! ﴿فَرَجَعَ مُوسَى﴾ گەڕايەوە ﴿إِلَى قَوْمِهِ﴾ ئەوقومە نجيبە؟! ﴿غَضْبَانَ أَسِفًا﴾ رِقي لەگەلّ حُزن زۆر ناخۆشە!

مَسْأَلەى پێ هظم ناكرێ! غَضَبْ فوران ئەكا وەچارەي پێ ناكرێ. حُزن دايەگرێ ﴿قَالَ﴾ مُوسى. ﴿يَا قَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْدًا حَسَنًا﴾ إنزالي (تورات) و سائِري نِعمي دي، يا وعد بە بەهەشتيش داخل بێ، بۆ خاطري (حَسَنْ) ﴿أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ الْعَهْدُ﴾ زەماني وعد زەماني جودايم. لەبەر طولي مُدّە شكتان

بوو لە إنجازي وعد؟ ﴿أَمْ أَرَدتُّمْ أَن يَحِلَّ﴾ لازم و ناظریبیّ ﴿عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ غضبی شدید کەتقدیر ناکریّ. ﴿فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِي﴾ تا دیّمەوە لە میقات، بۆ وەرگرتني کِتابْ، صبرگرن! ﴿قَالُوا مَا أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا﴾ بە هەوەسي خۆمان.

مُعروف و مشهور لاي ئیّمە فَتْحي(مَ) و سکوني(لْ)ە. قرائەتي تریش هەیە کَسري(مِ) ضَمّي(مُ)، فَتحي(مَ) و (لَ)، یەکن؟ معنایان مُختلفە؟ عائدي لُغتە ! !.
﴿وَلَكِنَّا حُمِّلْنَا أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ الْقَوْمِ﴾ لە خشلي قِبْطیان ﴿فَقَذَفْنَاهَا﴾ فریّماندا، هەر کەسی ئەوي لاي بوو هیّنایە لاي (سامِري) فریّیدا، بردي! مُمکنە اوّلاً بە تَسْویلي یادگار ئارەزوویان بوویێ هەیکەلەکي لیّ دروست بکەن. ئەوانە لە و چۆل و بیابانە مخشّلات چ لیّ بکەن؟ ﴿فَكَذَلِكَ أَلْقَى السَّامِرِيُّ﴾ وەکي ئیّمە لەوەي لاي بوو، هیّناي. ﴿فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا﴾ هەیکەلیّ بیّ رووح. ﴿لَّهُ خُوَارٌ﴾ واي دروست کردبوو هەواي پیّدابیّ و بچیّ، ئەو نوعە دەنگەي لیّوە بیّ. ئەوەش بە صُنْعي خواو بە امري(کن)ە؟ حاشا!. بعضە روایەت ئەکەن دائر بە (عِجْل) إنسان سەغلەت ئەبیّ! ﴿فَقَالُوا﴾ سامري و هاومَشْربي. ﴿هَذَا إِلَهُكُمْ وَإِلَهُ مُوسَى﴾ ئەوانیش (قبولّ)یان کرد،(سواد)ی (أعظم) (مشغول) بوو بوون، بە (عبادەت)ی (عِجْل)، بیّوو لە (حُلی) دروست کرابیّ (بني إسرائیلي) کوو نای پەرستن؟ لە (تورات) ئەڵیّ: " هارون بۆی دروست کردن" (سبحان‌الله) لە لایە (رسول)ی خوایە، لە لایە (صنم) بۆ(قوم)ی خۆی دروست ئەکا، وە(عبادەت)ی کەن. ئەوانە (رسالەت) بەچی تیّ ئەگەن؟ (طبیعي) ئەوە لە (طرف) (عُلما)یان (قبول) کرایە، (قوم)یّ (هکذایي)لیّیان دوورنیە، ئەو (عِجْل)ە کە لەبەر چاوی وان دروستکرا، (إعتقاد)ی پیّبکەن، ئەوە (إلە) یا نە ! (إمام)ی (أنام) بە دووری ئەزانی، بەڵیّ لە (عاقل) دوورە، (لکن) (میل)ی (نفس) عقل نایەڵیّ ئەگەر (بعض)یّ (شیخ) پەرستەکانی، (زمان)ی ئیّمەی دیبا (قطعیاً) ئەمەی بە دوور نەدەزانی ﴿فَنَسِيَ﴾ خۆی لە یاد چوو، وە(إلاّ) ئەبا بشلّیّ (و إلهی) (ولَو)

خۆی دروستی كردبی، (فرق)ی نیە، بۆ (نسبەت)یی (أُلوهیّـەت) بـۆ وی، وە بـۆ (قـوم)ی (موسـی)وە (موسـی) (علیـە السلام)، (أمّـا) (رجـوع)ی (ضـمیر) بـۆ (موسی) زۆر بیّ (معنا)یە، گەرچی (إبن جریـر)یـش (إختیـار)ی كردبـیّ، بـوونی (عِجْـل) (وَالْحالَـةُ هـذِهِ) بـە (إلـە) یـا (ممثَّـل)ی (إلـە)، (بَـدیهِيُّ الإسْـتحالە)یـە (حاجەت)بە دلیل نیە (أمّا) بۆ (تنبیە) ئەفەرمویّ: ﴿أَفَلَا يَرَوْنَ؟﴾ ئایـا نـابینن، نازانن؟ ﴿أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا﴾ (صـورەت)ی گۆلكـە وەك (سـائر)ی وگۆلكـان و (صُور) آن قسە ناكا، هۆرە هۆرەكی لیّدیّ و بـەس ﴿وَلَـا يَمْلِـكُ لَهُـمْ ضَـرًّا وَلَـا نَفْعًا﴾ (جامد) و بیّ (أدراك) و (شعور) و هیّزە، دیارە (إنسان) بـە سـەد هـەزار (درجە) لەو (جماد)ە، زیّترە، (ولَوْ) لە (دُرّ) و (ألماس) تاشرابیّ، (ذلّەت) و بـیّ هۆشی، بەو (درجە)یە؟!

(مُحَیّرُ العُقولَ)ە، (عجائب)تر ئەمـەیـە، بلّـیّن: " ئـەو (ذلّـەت) و (خـسّـەت) و (دنائەت) و (حماقەت) و (جهل)ە، خوا لە (إنسان)ی دا(خلق) ئـەكـا، (أساسـاً) (بشر) (شرف)ی خۆی نازانی، خۆی لا بیّ(قیمەت)ە، ئەگەر شتەكی بۆییّ، لـە لارای ئەزانی، (إنسان) بە خێوت ئەكا، تالّاوی مەرگ ئەچێژی تا پیّت ئەگەیەن، كەچی لە (غیر)ی ئەزانی، كەسیّ زۆر دور بـیّ خێـر وبیّـر، بـە سـەریـا (تـرجیح) ئەكەی.

﴿وَلَقَدْ قَـالَ لَهُـمْ هَـارُونُ﴾ قوربانـت بم، (ممنـون)ی (خـاتَم الرُّسُـلْ) بـە، وات (تبریە) ئەكا ﴿مِنْ قَبْلُ﴾ پێشی (دعوەت)ی (موسی) لە (میقات) ﴿يَا قَوْمِ إِنَّمَا فُتِنْتُم بِهِ﴾ پیّی (ضـال) بـوون، بـە (هـلاك) چـوون (حاشـا) (إرشـاد)ی تیانیـە ﴿وَإِنَّ رَبَّكُمُ الرَّحْمَنُ﴾ چ (رحم)یّكی لە (حق) كردن، (نجات)ی دان، (بحـر)ی بـۆ شەق كردن ﴿فَاتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوا أَمْرِي﴾ لە (عبادەت)ی گۆسالّە گـەریّـن ﴿قَـالُوا لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ﴾ (زائل) نابین ﴿عَاكِفِينَ﴾ (دوام) ئـەكـەیـن لـەسـەر (عبـادەت)ی ﴿حَتَّى يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَى﴾ كە هاتـەوە، بـزانین چ دەكا؟ چمان پـیّ دەلّـیّ؟ (ممكن)ە ئەوانەی ئەلّیّن: " (ضمیر)ی (نسبی) بۆ (موسـی)یـە، بلّـیّن: ". وایـان

(أمل) ئەكرد، (موسى)ش (عبادەت)ى (عِجْل) بكا، (أنَّهُ) خواى خۆى نۆزيەوە !
" ﴿قَالَ﴾ (موسى) گەڕاوە، (أحوالات)ى ديت، بە (هارون)ى ووت: ﴿يَا هَـٰرُونُ مَا مَنَعَكَ﴾ چى تووى (مجبور) كرد؟ ﴿إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوا﴾ (وەقت)ى ديت، گومڕابوون بە (عبادەت)ى (عِجْل) ﴿أَلَّا تَتَّبِعَنِ﴾ دووام نەكەوى (مادّى) يا (معنوى) ئەگەر بهاتباى بۆلاى من، ئەوانت (ترك) كردبا، نێزيك بوو، پە شيمان بنەوە، بێنەوە سەر (هدايەت)، وەبتگێڕنەوە وەك (سيّدى آلوسى) ئەفەرمووێ:
" لەو حالە، (مُفارق)ەى (رئيس)ى وەك (هارون) لايان گران بوو (قابل) بوو، بۆگێڕانەوەى، بگەڕێنەوە" ﴿أَفَعَصَيْتَ أَمْرِي﴾ بە (حُسن)ى (سياسەت) (هجوم)ى كردە سەر، سەر و ڕيشى گرت ﴿قَالَ يَا ابْنَؤُمَّ﴾ كوڕى دايكم، ئەڵێن:
" ئەوە بۆ (إستعطاف)ە (وإلاّ) براى داك و بابى بوون" ﴿لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلَا بِرَأْسِي﴾ (لحيە) كە (إطلاق)كرا، (مُراد) ڕيشە، (وَلَوْ) لە (أصلا)بە شەويلاك بلێن ﴿إِنِّي خَشِيتُ﴾ ئەگەر (مُعارضە)يان بكەم بەو (نوع)ە ﴿أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي﴾ (رعايەت)ى قسەى منت نەكرد، (حُسن)ى (سياسەت)م لە (مجاملە) زانى، بەنەرمي بيان دوێنم، نەبە درشتى ﴿قَالَ﴾ موسى، پاش بيان و سماعي ماجرى، توجيهي خطابي بۆ (سامري) كرد فەرمووي: ﴿فَمَا خَطْبُكَ يَا سَامِرِيُّ﴾ شأنت، طَلَبت، سَبَبى چ بوو وات كرد؟ تێ بكەن، نافەرمووێ چۆنت كرد. ﴿قَالَ﴾ سامِري ﴿بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا بِهِ﴾ بابە(ت)ي خطابيش بێ، وەك لە بعضي قرائتا ديتى، زانى، ئەوەي ئەوانە، يا ئێوە، نەتانزاني! ئەوە چ بوو؟ لە (إبنُ عبّاس) نقل كراوە: ئەو ڕۆژە (جبريل) پێشى قوم، سوارى (فَرسُ الحَياة)ي بە طَلَبْ بوو بوو، سامِري ديتى، ناسيەوە چونكى بە منداڵى (جبريل) بە خێوى كردبوو، داكى لە ترسى فِرعَون لە غارێ شاردبووبيەوە، (جبريل) تَعَهُّدي ئەكرد قَبْضيەكي لە ژێر سمي فَرَسي (جبريل) هەلگرت، هاتە دلّى ئەو خۆلەى بهاوێتە سەر هەرچى، بيگوتبا (كُنْ كَذا)، إلاّ ئەبوو! !. وە ڕوايەتێ دي لە (إمامي عَلي) نقل ئەكەن، (علي) ئەڵێ: ئەو وەقتە

کەهات (موسی) ببا بۆ میقات، چاوي پیّ کەوت، کەسیتر نەیدیت!.
(زُمَخْشَري) لێرە. ئەو روایتە، وە لە (أعْرافْ)، روایەتي سابق، ئەلّیّ!! وەلێرە ئەلّیّ ناوي فَرَسەکە (حَيْزوم)ە. ﴿فَقَبَضْتُ قَبْضَةً﴾ بە (ص)یش قرائەت هەیە.
﴿مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ﴾ يَعْني لە اثري فَرَسي رسول، خۆلي بن سمي. ﴿فَنَبَذْتُهَا﴾ هاویشتمە ناو هەیکەلەکە. ﴿وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِي نَفْسِي﴾ زینەتیدا، جواني کرد.
خُلاصە لە مَحْضي إتّباعي هەوا، وام کرد. والسّلام.

هەر چەند ئەو تفسیرە لەسەر رێی جمهورە، لە أصحاب و تابعین و أجلّەي مُتَأَخِّرینە، بەلاّم حقّ الانصاف، خرافاتە! بیّ أصل و أساسە، لە رَسولي أکرم نقل نەکراوە، تَدَخُّلي إسرائیلیات بیّ شکە!! کەي ئەو کابرایە (جبریل)ی ناسیە؟ کەی (جبریل) سواري مایني بە طَلَبْ بووە، بیخاتە پێش فرعون؟ حیاتیّ کە عالەم تیاي مُتَحيِّرە، سرّي إلهە، چۆن ئەیخەنە ژێرسمي فَرَسي (جبریل)؟ ئەو تأثیر و أمري (کُنْ) بۆ غیْري خوا، بەکیّ ئەدریّ؟. رجائەکەم کەمیّ هۆشی لازمە! لاییّ ئەلّێن: خوا لۆمەی کرد لەسەر إسْتِعْجال. لاییّ ئەلّێن: جبریل لە دووي هات. وە ئەو معنایە، نَظَر بەو عبارەتە، وەك مەتەلّۆك وایە، لەبەر ئەوە (أبومُسْلمي أصْفهاني) لەو معنایەي لاداوە، معنایەکی تري لێداوە تەوە، هەر چەند (فخرُالدین) تقویەي ئەکات، لام خۆش نیە!! ئەلّیّ (: لە جوابي موسی، سامري ئەلّیّ: زانیم ئەوي قوم لەسەریەتي، حەق نیە سابقاً قبضەکم لە أثري رسولە يَعني موسی هەلگرتبوو ؛ یعني چەپکەکم إیمان پیّ هەبوو، فرێمدا، خُلاصە ئەو دینە حەق نەبوو، فرێمدا!!).

(سَیّدي آلوسي) بە مُقابلي (فَخري رازي) بە چەند وجە تزيین ي ئەو قسەي کردیە، (حقيقةً) قولیّ پووچە! أمّا لە قَوْلي جمهور نێزیك ترە!. کەسیّ پەروەردەي (جبریل) بیّ، بیناسیّ، خواصي فَرَسي بزانیّ، بە موسی بلّیّ دیني توو حەق نیە، عبادەتي ئەو عجلە، إتّخاذي بە (إلە) حەقە، خەیلیّ خەیلیّ دوور، بەلّکو مُستحیلە!! سەیریّ تر لە (یهود) نقل ئەکا: ئەوەی سامری

هاويشتيه ناو (حُلی)، پارچه (حُلی) بوو بعضه طَلَسْماتي لیّ نوسرابوو، (يعقوب) هاويشتبويه ملی (يوسُفی) به منداڵی، به هه‌ر نوعیّ ئه‌بیّ ئه‌که‌وێته ده‌ست سامری، به خاصيّه‌تي ئه‌وه‌ی لێی نوسرابوو، ئه‌و (خوار)ه‌ی ئه‌كرد! !_ حقاً ئه‌و نوعه قسه، به (خُوار) حسابه_! (يهود) وه‌كي عرض‌كرا، نسبه‌تي بۆ (هارون) ئه‌ده‌ن. وه له (توراه) باسي (خوارُ) (سامِري) و (جبريل) و (فَرَسيَ جبَريل) و (خۆڵی ژێر قَدَمي) نيه !_ سُبحان الله نازانم بۆ به ظَريفي تأمُّليان له عباره‌تی قُرآن نه‌كرديه؟_ ئايا (سؤال) له (كيفيه‌ت)ی (صنع) و (خُوار)ی (عجل)ه؟ يا له (سبب)ی (عمل)يه‌تی؟ بۆچی واتكرد؟ ئه‌و (قوم)ه‌ت (إغوا)كرد؟ له خوا په‌رستی هێنات بُت په‌رستی! (الجواب) واده‌ر ئه‌كه‌ویّ ئه‌و پياوه، به (بصيره‌ت) ئاگاداری بوه، زانيوه‌تی (بنی‌إسرائيلی) بی(تمثيل)ی (إله) نايه‌نه رِای (إتّفاق)يان نابیّ، له (بحر) (نجات)يان بوو، (آناً) ووتيان: (إجْعَلْ لنا إلهاً كما لَهُمْ آلِه)وه (خبر)دار بوو، له (مصر) (ميل)ی (عجل)يان له دڵ شين بوو بوو. وه‌تیّ ده(فكر)ی، (قوم)ی (فرعون) (عساكر)ی (فرعون) له چ (إطاعه)يه‌كی دان، چه‌ند (مُتَّفق)ن، يه‌كن، (دين)يشيان بت په‌رستيه! له‌به‌ر ئه‌وه له (أثر)ی (رسول) كه (عباره‌ت)ه له (موسی)ی (كليم) ئه‌وه‌نده‌م هه‌ڵ گرت وفرێم دايه، به (مجبور)يم زانی بۆ (إتفاق) و (إجتماع) (تمثال)یّ (هكذا)ئيان بۆ بكه‌م، وه زێده (تشويق)يان بده‌م له‌سه‌ر (عباده‌ت)ی گه‌وره‌كانی (مُصلحه) كانی (بنی‌إسرائيلی) ئه‌وه‌يان (تَفطّن) نه‌كرد، بۆ (نفس)ی من، ئه‌وه (نفس)ه (مُدرك)ه وای بۆ (تزيين) دام، لام وايه (غير)ی (نهی) (عباده‌ت)ی (بُت) هه‌رچی (رسول) بفه‌رمویّ (إطاعه)ی ئه‌كه‌ن، وه(قوم)یّ (مُكمّل)يان لیّ په‌يا ده‌بیّ، وه‌ك (قوم)ی (فرعون)وه دياره(إيمان)ی به (حضره‌ت)ی (موسی) بووه، (أفلاطون) له (جمهوريه‌ت)ی خۆی شتیّ وا ئه‌فه‌رمووێ "(دين) زۆر (لازم)ه بۆ (ملّه‌ت) (أمّا) (اجتماع)يان بیّ (تمثيل) (مُشكل)ه". براده‌ران ئه‌مڕۆ ته‌ماشای إطاعه ی (ژاپۆن) و (إعتقاد)يان كه‌ن،

گەرچی (جواب)ی (سامری) گەلێ (مُجمل)ە، بەڵکوو (مُبهم)ە تەماشای (أمور)ی (خارجی) پێ ئەوێ. ئەوی من (عرض)م کردن، هەم لە (فهم)نێزیکە، وەهەم (أمور)ێ (خارجیە)ی (قریب)ن، لە (أحوالات)ی (مُبیّن)ەیان وەرئەگیرێ ئەوەی (قوم) فەرمووبانە بەس (مُختَلَق)ە، بێ (شك) لە (إسرائیلی) یانە، نافامرێ نە لە (عبارەت) نە لە (سائر)ی (مواقع)ی (قرآن). تەماشای (دُعا)ی (حضرەت)ی (موسی) ﴿قَالَ﴾ (موسی) (دُعا)ی لێ‌کرد ﴿فَاذْهَبْ﴾ برۆ ﴿فَإِنَّ لَكَ فِي الْحَيَوةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ﴾ (مادام) تو ئەوەندە غەمخواری (بنی‌إسرائیل)ی، حەز ئەکەی (إتفاق) و (مُوفقی)یان ببی، وە بەو (نوع)ە کردیان ئەکەیەوە خوا بەدەردەکت با ههر بڵێ: " (لا مساس) پێم مەکەون، پێتان نەکەون، تخوونم مەکەون، تخوتنان ناکەوم، تەك و تەنیا، (وحشی)یانە آوارەبی (دام) و دیار بی: (دُعا)یە چەند (مناسب)ی (حال)ە، ئەوە جێ ی (إنکار)نیە، خۆم دیومە، (بعض)ە کەس، (حتّی) لە دوور (إشارە)یان بە لای قەبرغەیان‌دا دەکەن، رادەچەنن، زۆر (مُتألّم) ئەبن؛ (عرض)ێ (هکذا)یی، (إستیلا)ی (وجود) (سامری) کردبێ زۆر نێزیکە، (أمّا) (مسألە)ی (تا)ی نازانم، (أمّا) (جُبّائی) (إنکار)ی ئەکا، لام وایە (کلیم) هەر (دُعا)ی لەوی کردیە، لە (وَلَدْ)نا، گەرچی (ممکن)ە (ولد) یشی دووچاری دەردێ (هکذا)ئی بووبێ ﴿وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا﴾ رۆژی (جزاء) ﴿لَنْ تُخْلَفَهُ﴾ تووشی ئەبێ، خۆت پێ قووتار ناکرێ. (وعد)ی (إلهی)یە (خُلف)ی (ممکن) نیە ﴿وَانظُرْ إِلَى إِلَهِكَ الَّذِي ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا﴾ (أوّل)ی خۆی (ذکر) نەکرد، ووتی: " (إله)ی ئێوە و (أله)ی (موسی)"، خۆی لە (فکر) کرد. لێرە (خصوصی) (إضافە)ی ئەو (إلە)ە(مُزخرف)ەی بۆ (سامری) ئەدا.

بنۆرە چەند بە (موقع)ە ﴿لَنُحَرِّقَنَّهُ﴾ بە ئاگر ئەی سووتێنین سووتاندنی زێڕو زیو زۆرێ پێ ئەوێ، (ممکن)ە لە (حرق)ی بە (معنی) لە مەورەتدان بێ، (یعنی) لە (مەورەت)ی ئەدەین، ئەیکەینە (براد)ە ﴿ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُ فِي الْيَمِّ

نَسْفًا﴾ بە (بحر)ى دادەدەين، بەسەريا بڵاودەكەينەوە، وات پيێئەگوتن (ئەمەيە، ئێوەى لە (بحر) (نجات)دا؛ ئەوهاى لە (بحر)آ گووم ئەكەين ﴿إِنَّمَا إِلَهُكُمُ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ﴾ بێ (شريك)ە (واحد)ێكە، (قابل)ى (تمثيل)نيە ﴿وَسِعَ كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ شتى (جامد)ى (حيوانى) بێ (علم)، چۆن ئەبێتە (مُمثّل)ى ئەو (إله)ە؟ ديارە (أُلوهيّەت) و (رُبوبيّەت) بێ (علم)ێ (شامل) ناكرێ ﴿كَذَلِكَ﴾ بەو نوعە موافقي حالي رسالەت. ﴿نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاء مَا قَدْ سَبَقَ﴾ نەبە وجهي حكايەت و چيرۆكە! ﴿وَقَدْ آتَيْنَاكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا﴾ علمي رسالەت پەناە، بە أنباي ماسبق و سائري ما في القران، (لدُن)يە! بە خوێندن و سماع نيە! ﴿مَنْ أَعْرَضَ عَنْهُ﴾ لەو ذكرو كتابە كە حاويە بەسەر أنبا و أُمورێ، كە شاياني تَذكّر و تَفكّرە. ﴿فَإِنَّهُ﴾ ئەو كەسە. ﴿يَحْمِلُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وِزْرًا﴾ بارێگران، لە دونيا لاي گران بووە، تصديق و تَحَمُّلي (ما في الذِّكْرِ الكريم)ي نەكردوە ﴿خَالِدِينَ فِيهِ﴾ لە وزر، لە ژێر يا ئەمێنن. ديارە ئەمانە زۆرن. ﴿وَسَاء لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِمْلًا﴾ بارێ پيس و قبيح. لە دونيا لايان ناشيرين بوو خۆيان بخەنە ژێر بارى ئەو ذكرە، لەبەر كِبْر وأنانيّەت، قبوڵيان نەدەكرد! ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ﴾ يَعني لە أوّلي رۆژي جزا، تا أَبَدَ الاباد، لە بن ئەو بارەدا دەمێنن. ﴿وَنَحْشُرُ الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ﴾ ئەوێ رۆژێ. ﴿زُرْقًا﴾ وەك لە قامُوس ئەڵێ: (كوێر)! ئەوانەي گوناهكارن بە كوێريان حشرئەكەين. تفسيري بە (چاوشين)م، لا جووان نيە! گەرچى سەرامِداني مُجرمني، أساطيلي كُفر و ضَلال، دوشمني دين و نامووس و شەرەف، ئەمرۆ چاوشينەكانن، مەگەر مُجرمەكان عبارەت بن لە عەرەبەكاني چاوڕەش! ﴿يَتَخَافَتُونَ بَيْنَهُمْ﴾ بە صبرۆكە خۆبە خۆيى ئەڵێن ﴿إِن لَّبِثْتُمْ﴾ لە بَرْزَخْ يا لە دونيا. ﴿إِلَّا عَشْرًا﴾ شەو يا رۆژ، بە مُناسبەي اتي، اساساً إنسان لە چەنگ تذكير و تأنيثي عەرەبي سەغڵەتە، ئەوجا إنقلابي بابي إعداديشي علاوە بكرێ! مُدّەي (لبثي) دونيا كە پێى مغرور بوو بوون، وە لَبْثي بَعْدَ الموت كە لايان وابوو نيە، چونكە إنكاري زيندوو بوو نەوەيان دەكرد،

چەندە کەم بوو! ئایا ئەوانە لە قەبرا مُعذَّب نەبووین؟ لام وایە (إبن) بۆ ئەوە تَفَطّنی کردیە ئەڵێ: (مُراد لَفطي بَيْنَ النَّفْخَتَيْن ە، ئەو مُدَّە عذابیان لەسەر هەڵئەگیرێ) بڵێمچی؟ ئەوەش زۆر تەواو نیە ﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ﴾ مُدّەی لَبْثیان.

﴿إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً﴾ أعْدَل و أرجَحْیان لە جهەت رأي و عقل ئەیوت: ﴿إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا﴾ رۆژێ، مدەیێ کەم. زۆروکەم رۆیی بێ فائدە چوو، ئەوەی لە و مُدّەدا کردمان بووە موجبي حَسْرەت و نَدامَة و ئەندۆە.

﴿وَيَسْئَلُونَكَ﴾ مُنكري بَعثْ سؤالت لێ ئەکەن. ﴿عَنِ الْجِبَالِ﴾ ئەو (أجرام)ی رەق و گەورە، پڕ لە (معادن) (قوی) (دائمی) چی بە سەردێ؟ (یعنی) ئەو (نَظم)ە (چۆن) تێك ئەچێ؟ لە شێوەی (قرآن) وا دەرئەکەوێ (جناب)ی (حق) پێشی (سؤال) کردنیان (خبر) ئەداتە (رسول)ی خۆی، کە (سؤال)ت لێ ئەکەن، وەپێشین (جواب)ی بۆ (ترتیب) ئەدا، (حقیقة) ئەبێ وابێ، تا (رسول)ی خۆی (مقابل)ی (خُصماء) (ساکت) نەمینێ، چ جایە (تأخیر)ی (جواب) دڵ رەنجاندنی (رسول)، (کیف) خۆش کردنی (أعدا)ی خۆ و (رسول)ی ﴿فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسْفًا﴾ ئومێدە بەو (ف)ێ یەئەو (حکایەت)ەی ئەیکەن، نەچێتە گوێی (سامع) آن؛ بڵاوی ئەکاتەوە ﴿فَيَذَرُهَا﴾ چیایەکان ﴿قَاعًا صَفْصَفًا﴾ ئەرزێ رێك و لووسی، بێ کەندو کۆسپە ﴿لَا تَرَى فِيهَا﴾ لەو(قاع)ە ﴿عِوَجًا وَلَا أَمْتًا﴾ پێچ و پەنای نیە ﴿يَوْمَئِذٍ﴾ رۆژی (قیامەت)، ئەوێ رۆژی ﴿يَتَّبِعُونَ الدَّاعِيَ﴾ (رسول)ی خوای ﴿لَا عِوَجَ لَهُ﴾ خواری بۆ (داعی) نیە، ئەزانین (داعی) (إلى الحق) بووە، بێ فێڵ و (محابا)، (لکن) ئەو (تبعیّت)ە بێکەڵکە، ئەبا لە (دنیا) با، تا ئەورۆ بۆیان بە کاربێ ﴿وَخَشَعَت الْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ﴾ ئەوانەی لە (غرور)ە وەئەیان نەڕاند، (نعرە)یان لێ ئەدا، لە مەیدان (ئشتلم ئشتلم)یان ئەکرد! گرە گرو شیرەیان نامێنێ ﴿فَلَا تَسْمَعُ﴾ (أيها السّامع) ﴿إِلَّا هَمْسًا﴾ سرتە یا خشکەی (قدم) ﴿يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ﴾

لە کەس بۆ کەس ﴿إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَنُ﴾ خودا (إذن)ی بۆبدا ﴿وَرَضِيَ لَهُ قَوْلًا﴾ بە (قول)ی (شافعی) دەر (حق)ی ئەو تکا بۆ کراوە (راضی) بێ ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾ (أهل)ی (محشر): (مؤمن و (کافر) و (صالح) و (فاسق) و (تابع) و (متبوع) ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِ﴾ بە (معلوم)ی خوا ﴿عِلْمًا﴾ (حاصل)ی (شفاعەت) بەو (نوع)ەی تێ ی ئەگەن، نیە، کەس خۆی پێ نەخەڵەتێنێ، (أمّا) (علم) بە (ذات)ی (کبریائی) (غیر)ە (ممکن)ە، نەبە (نَظر) نە بە (خلق). ئەوەندە ئەزانین (صانع)ێ هەیە، بۆ (عالم)ی (إمکان)، (فوق الطّبیعی)یە ﴿وَعَنَتِ الْوُجُوهُ﴾ (نوات)ی (أعضا)ی (معلوم)ە (خاضع) و (ذلیل)ە ﴿لِلْحَيِّ الْقَيُّومِ﴾ وەك (أسیر) آن، کەس سەر ئە فرازی و گوستاخی و زوبان درازی پێ ناکرێ، هەر ئەوە (فوق الطبیع)ە، نامرێ (قائم)ی (بالذّات)ە (غیر) (قیام)ی بە (واسطە)ەی ئەوە، هەمووی بۆ (نوامس) و (قواعد)ی (طبیعەت) (ذلیل)ە، بێ دەسەڵاتە ﴿وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا﴾ چ (مؤمن) چ (کافر) ، (أمّا) (فرق)ی (خیبەت) هەیە، چ بە(کَمْ) چ بە (کیف) ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ﴾ دیارە (ممکن)نیە (إنسان)ێ هەر چەند (عمل)ی (صالح) هەیە، بیکا، (إنسان)ی (فقیر) (حجّ)ی بۆ ناکرێ، (نحیف)ی دەردەدار، ناتوانێ بچێتە (جهاد)، (عمل)ی (صالح)ی (خصوص) هەیە، (عمومی) هەیە، هەرکەس بە گوێرەی خۆی عمل (صالح)ی بۆ داندراوە ﴿وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ بە خوای (واحد) و ئەوی (رُکن)ی (إیمان) بێ ﴿فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا﴾ (خاصةً) ئەوی (ظُلم)ی نەکرد بێ، (تصوّر) ناکرێ (ظُلم)ی لێبکرێ ﴿وَلَا هَضْمًا﴾ (نقص)ێ بە تەواوی (مکافات)ی (أعمال)ی (صالح)ی خۆی ئەدرێتێ (ظاهر)ی (عبارەت) (شاهد)ە، لەسەر (فرق) لە (بین)ی (ظُلم) و (هَضم)، ئەوی لە (دُنیا) (حقوق)ی (شرعیە) بێنێتەجێ، چۆن دێتە (خیال) لە رۆژی (جزاء) (حق)ی وی (ناقص) بدرێ؟! دیارە شتی وا هەیە، ئەگەر خوا بیکا (معاذالله) بڵێن: "ئەوە (ظُلم)ە، (أصحاب)ی ئێمە، لام وایە (فرق)ی (ظُلم) و (غَضب)یان نەکردیە، ئەگەر

هەرچي خوا بيكا، (ظُلم) نەبێ، (معنا)ی ئەو (آيەت)ە چيه؟ ئەفەرموون: " دروستە بۆ خواى (مؤمن)ی (مُتقّى) (عذاب)بدا" ئەو (تجوين)ە لام (ظُلم)ە، (هضم)ی (مُشكل)ە. ئەگەر بنۆڕيتە (قهر) و (غلبە) لە (موضوع) دەرئەچين ﴿وكَذَلكَ أنزَلْنَاهُ قُرآنًا عَربِيًا﴾ قَوْمي تۆ چاكي تێئەگەن. ﴿وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ الْوَعِيد﴾ تكرارمان كرد.

حقّاً سَوادي أعْظَمي بَشَرْ بێ ترس، نايەتە راي! ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ خۆيان ئەپارێزن لە أموري نالايەق. ﴿أوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا﴾ فكرێ إعتبارێ كە سوقيان بكا بۆ أمورێ حسنەی شايانی شَأْنی بَشَري، ئەوە لە (إمام فخرالدين) وەرگيرايە! (سَيِّدی آلوسی)ش لای حسنە! قسەی تريان زۆرە، خالّی نين لە خَدْشة! ﴿فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ﴾ خوایێ بلّند، پادشاهێ ثابت، بەر قەرار، لايَتَغَير و لايَنْفَعِلْ، حقّاً عاليە، لە حەقی عبادي بۆ إرشاديان چ مُجاراة و مُداراتێ ئەكا! چ تدبير و سياسەتێ محبوب بۆ جذبي قلوب ئەگێرێ! تالۆكە ناكا بۆ هيلاكيان، با وجودي زۆر مُستَحَقِّن! حەقي حياتيان نەماوە. ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِالْقُرْآنِ﴾ تالۆكە بە قرآن مەكە. ﴿مِن قَبْلِ أن يُقْضَى إلَيْكَ وَحْيُهُ﴾ تەواو ببێ. مُفسرينی كرام دەست لە تالۆكەی پێغەمبەری ناكەنەوە، جارێ دوو، بيان تالوكيە رسولُ الله بە فەرمايشی خوای نەكرد، لە وەقتی قرائەتی جبريل إسْتِعْجالی ئەكرد، بيان جا ام آيتە وەك (لاتُحَرِّكْ بِهِ لِسانَكَ)، نهيە لەو تالووكە! ياخود نهي لێكرا لە عجلە، بە جوابدانەوەي سؤال! وەك لە (ماوەردي) نقل ئەكرێ: أهلي (مَكّە)، (أُسْقُفي نَجْران) ووتيان يا (مُحمّد)(ﷺ) خەبەرمان بدەرێ لە شتێ، ناشرێ چيە، وە سێ رۆژمان مُهلەت دایێ، وحي تأخير بوو، پێغەمبەر سەغلّەت بوو، إستِعْجالي وَحي كرد، ئەو آيتە نازل بوو.

باری الاهی! ئەمە چيە؟ قسەی پڕو پووچ و بێ أصل و أساسە!! جماعتێ لە (حسن) نقل ئەكەن ژنێ شكاتی كرد، مێردی زللەيی لێداوە، فەرمووی: قصاصە، ئەو آيتە نازل بوو، رسولی أكْرَمْ راوەستا تا آيتی (الرِّجالُ قَوّامُون على

النِّساء)ى نازل بوو.

پێغەمبەر چیبکا؟ جوابي سؤال ئەدا، قايل نين، ئەڵێن ئەبا إنتّظاري وَحي بكا، إنتظاري وحي دەكا، دەڵێن تأخيري ئەكا! ئەدي چ بكا؟ وە يەك دوو قسەي تريشيان هەيە لەو مقولە، نا مُلائم و غيرە معقولە! ئەبێ ئەو نوعە معنايە، لەگەڵ ئەم عبارتە، كوو رێك بكەوێ؟ وە لەگەڵ ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْماً﴾ رَبْطي مَعْنَوي چيە؟ زاتاً ئەڵێن كلامێ إستطرادي يە. منيش ئەڵێم: رسولي كبريا، إسْتِعْجالي ئەكرد خواي تعالان ايتێ، حُكمێ فاصل بنێرێ، نهايەت بدا بەو مجرمانەى عنودايەي دوشمنانەي (أزْرَق). ئەگەر وابا گەلێ آية ئەمانەوە موجبى نزوليان نەدەما، ئەمەش مُمكن نەبوو. مُدّەي مانەوەي وان، موجبى زێدە تقريري آيات و براهين و تحريري أحكام و إيضاحي حقّ و حقايقە، بۆ توو زێدە علمە، چەندي صَبْر و تحمُّلكە ي، علمت زياد ئەبێ آياتت پتر بۆدێ.

﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ﴾ ابوك و ابوالبشر! ﴿مِن قَبْلُ﴾ پێش عهدي توو. ﴿فَنَسِيَ﴾ عهدي لە ياد چوو، إعْتِناي پێ نەكرد. ﴿وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا﴾ ئەگەر بوو با، لە خواي بزر نەدەبوو! خۆى ئەگرت عهدى شكاند، تۆ إقتدا بە خوابكە، بە أدەم نا! ئەوجا بنۆڕە چەند جوانە، چەند مربوطە! نازانم بۆ بۆ وانە بەو نوعە تفسير دروستە، بۆ ئێمە دروست نيە؟! قيامەت علمى لاى خواديە. ئەو هەمو عذاب و مشقتى جەنابى رسول لە طرف ئەو دوشمنانى قوى، مانع لە إنتشارى دينى إسلام، خەريكى إخْمادى نار و إطفاى نوورى بۆ خاطرى زێدە بوونى عِلمى نَبَوى، عِلْمى عَمَلى، علم بە آياتى كونّيە، بە أسرارى طَبيعَتە!! عومر صرف كردن لە (نحوُ) وە قيل و قال، (حقيقةً) خُسرانەىێ عَظيمە! خەريك بوون بە مُنازعاتى مَذهَبى، چ أصلى چ فرعى، بەلايێ گەورەيە! عزم، رئيى مُصمّم و ثُباتْ قدم لە أمورە! أمّامَعْناى (لَمْ نَجِدْلَهُ عزْماً) على الذَّنْبِ، يَعْنى گوناهى بە قصد نەكرد، زۆر دوورە! لەبەر نسيان، تووشى ئەو معنايە بووين! تَفْصيلى عهد و نسيان و بێ عَزمي ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰئِكَةِ﴾

ئـەوانـەی (علاقـە)دارن ﴿اسْجُدُوا لِـآدَمَ﴾ (أبوالبـشر) (المَخلـوقُ علـى صُـورَتِهِ الإنسانيّةِ) يا (أوّل ذات)ێ كە گەيشتە ئـەو (مقـام)ە بـۆ (خـاطر)ی (داروين) و (دارويني)يان، (مَذهب)ی (داروين) چۆنكە لە (مدارس)ی (رسمی) ئەخوێنـدرێ، زوو ئەكەوێتە مێشكی مندالآن.

مندالّه (مسلّمان)ی پـێ تێـك ئـەچـێ، (أمّـا) منداڵـه (مـسيحی) (تعـصّب)ی زيـاتر ئـەبـێ،(مَـعَ أنّـهُ) (مُنافـات)ی (داروين) لـەگـەڵ (تـورات) زۆر (صـريح)ە ﴿فَـسَجَدُوا﴾ (بـلا تـأخير) ﴿إلّـا إبْلِـيسَ﴾ پـڕ (تلبـيس) ﴿أبَـى﴾ بـە(شـدّەت) (إمتناع)ی كرد، (سـجد)ەی نـەبرد ﴿فَقُلْنَـا يَـا آدَمُ إنَّ هَـذَا﴾ ئـەوەی ئـەوا ئـەی بـينی، ديـتـت، چـۆنی (مخالفـه)ی (أمـر)ی خـوای كـرد ﴿عَـدُوٌّ لَـكَ وَلِزَوْجِـكَ﴾ (إعاد)ەی (ل) بۆ (خاطر)ی (صحّەت)ی (عطف)ە. (قوم)ی ئـەڵێن: " (عطـف) لەسـەر (مجرور)ی (مُتّـصل) بـێ (إعـاد)ەی (جـار) دروسـتە" (وعلـى الْقَـوْلَيْن) (فائده)ی (بلاغەت)ی چيە؟ (إشار)ەيە بـۆ (أصـالەت)ی (عـداوەت)ی (إبلـيس) لەگەڵ (زوجە) و (آدم)؛ گەرچی (نـسبەت)ی لـەگـەڵ (سـجد)ە و (مخالفـه)نيـە. (حاصـل)ی هـەر دووكتـان ئاگـادارين، دوژمـنی هـەر دووكتانـە! ئايـا (نُكتـه)ی (بلاغەت)، بۆ (أصل)ی (قواعد)ی (نحويە) (إعتبار) ئـەكرێ؟ (يعـني) (أمـور)ی (ضرورية) (لازم)ە، (نكتە)ی پـێ ناوێ. لە فـەرمايـشی (علّامـە)ی (تفتـازانی) وا دەرئـەكـەوێ: (كـەبۆی ئـەگـوترێ). (ممكـن)ە (لازم)يـش بـێ و (فائـد)ەكـی (زيـاد)يشی هـەبـێ ﴿فَلَـا يُخْرِجَنَّكُمَـا مِـنَ الْجَنَّـةِ فَتَـشْقَى﴾ مانـدوو ئـەبـی، بـە (متاعب)ی (دُنيا)، بارگرانی (زوجە)شت دێتە سەر. (ذاتـاً) ئـەمـرۆ ژن بـارە بـە ملی مێردی ﴿إنَّ لَكَ﴾ بۆ توو هەيە ﴿ألّا تَجُوعَ فِيهَا﴾ لە (جنّەت) برسـی نـەبـی ﴿وَلَا تَعْرَى﴾ رووت نەبی ﴿وَأنَّكَ لَا تَظْمَـؤُ فِيهَـا﴾ تێنيـت نـابێ ﴿وَلَـا تَـضْحَى﴾ رۆژت پێناكەوێ، بێ (مسكن) و سايەبان نابی، (فرضـاً) ئـەگـەر لـە بـەهـەشـت (غير)ی ئەوانە، هيچ (نعمەت)ی تر نەبێ، (كـافي)يـە، بـۆ (مُحافظـە)ی تيامـانی. (فيالحقيقەت) برسيايەتی، بۆ (حيات)ی (دنيا)، بووە (مدار)ی هەمـوو (فـساد)،

کە (عالم)ی (حیوان) یەکتر ئەخۆن، بوونە (عدوّ)ی (حیات)ی یەك، وا ئەبیّ لە برسان باوك (ولد)ی خۆی ئەخوا. ڕووتیش (دخل)ێکی زۆری تێدایە بۆ (قتل)ی (حیوان) بۆ لەبەر کردنی پێستی. هەر چەند تێنیایەتی و گەرما و بیّ (مسکن)ی (مُناسب) بوون، بەو (درجە) نین، (أمّا) ئەوانیش (ضرر)یان بۆ (إنتظام)ی (حیات) زۆرە. (آیەت)ی (کریم)ە، (إشارە) ئەکا، خواردن بۆ(دفع)ی سیاسەتی،(لباس) بۆ(دفع)ی ڕووتی،ئاو بۆ(دفع)ی (عطش)، (مسکن) بۆ (دفع)ی (حرارەت)ی (شمس) (کافی)یە، زێتر (مُضِر)ە، (حقاً) وابوو ئەمڕۆ (عالم)ی (مدنی) تەماشاکە، لە (مأکل) و (ملبس) و (مشرب) و (مسکن) هاواریەتی، لە (طاقەت)ی دەرچووە ! ئەڵێن: " (مُناسب) وابوو (لاتجوُع) و (لا تَظمؤُ)ی وێکڕا (ذکر)کا"، " (وکذا) (لاتَعْری) و (لاتَضْحی)" (أمّا) ئەوە پێی ئەڵێن: " (قَطع النَّظیر)" کە لە (بلاغە) (ممدوح)ە، (إشارە)یەکە ئەوانە، یەك یەك (مَحطّ)ی (نظر)ن، جای (إعتنا)ن. تۆ بنۆڕە لە (آیەت)، (علاوةً) شتی تریش هەیە، (عبارەت)یان جوایەزە، لە (أوّل)ی ئەفەرمویّ: " إنَّ لَكَ" بە (کسر)ی (ألف) و زێدەیی (ل)م لە (ثاني)_ (بناء) بە (قرائەت)ی (مشهور)_ (و أنَّكَ) بە (فتح)ی (ألف) و بیّ(ل)م، ئەگەر (رعایەت)ی (تناظُر) کرابا، ئەی فەرموو: " وإنَّ لَكَ أنْ لاتَظْمَأ فِیها وَ لاتَضْحی"، گەرچی لە(قرائەت)ی تر، بە(کسر)ی (ألف)ە، (لکن) (أیضاً) بیّ(ل)مە. ئەمە بۆ وایە؟ (بنا) بە (قرائەت)ی (أوّل) (تقدیر)ی (عبارەت) وایە، (وإنَّ لَكَ أنَّكَ لاتَظْمَؤُ) ئەمە زۆر جوانە، (إن) ناچێتە سەر (أنّ) (لك)، (حائل)ە. بە ڕاستی و دروستی بۆ تووە" توو لە (جنەت) تێنیی‌یو گەرمابردی نابی". ئەو (زێد)ە (تأکید)ە (إشارە)یە، کە (حیات)ی (جنّەت) پەکی لەسەر ئاوو ڕۆژ نەکەوتوە، (نوعاَما) (شبیهە) بە (حیات)ی (ملکی) (فَوق الطبیعەت)ە، جا ئەگەر (دقّەت) بکەی، ئەزانی (جمع)ی (قرآن)ی چەند جوانە، دیارە (بلاغەت)ی (فِطري) لای (فاطِر) (أهَمْ)ترە، لە (بلاغەت)ی (صُوری)، (لَفظی) توشنە لەبی (عرفان) تا تەماشای

ئەو (آیەت)ەکا، لە (ینابیع)ی (حکمەت)ی تێر و پاراو نابێ ﴿فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ﴾ (أنَّه) وەك تیر بۆی هاویشت، (إلقا)ی (قَلْب)ی کرد، نیشانەی ئەنگاوت. دیارە (تأثیر)ێ لە بێ (عزم)ی (حضرت)ی (آدم) بووە! ئەگەر (میل) و(قابلیّەت) (زێد)ە نەبێ، وەس وەسەی (شیطان) چ (تاثیر)ێ ئەکات؟ ﴿قَالَ﴾ إبلیس. ﴿يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ﴾ ئەتەوێ نیشانتدەم، پێش رەویتکەم، بۆ سەرداري أبَدیَّةْ، ئەوي لێی بخوا، نامرێ! ﴿وَمُلْكٍ لَا يَبْلَى﴾ ناڕزێ. حیاە و گوزەران و عَیْشي مُستَمِر ئەبێ، بێ کَدَر. لە (تَوْراة) ئەڵێ: «خوا فەرمووی إنسان وەکی ئێمە ئەبووە عارف و دانای خێر و شەڕ، نێزیك بوو دەست ببا بۆ داری حَیاة، وە لێی بخوا، وەبژێ الی الأبدْ، لەبەر ئەوە خوا لە جَنَّةُ الْعَدن‌ی دەرکرد». _لە پێشەوە بَعْضە قسەی خەرافاتیتری تیایە، ڕەنگ نیە نقل بکرێ_ . لەسەر ئەو حاڵەش، ئەوروپایی و ئەمەریکایی، بە ناوی "کِتابي مُقدَّس"، نَشری ئەکەن!

﴿فَأَكَلَا مِنْهَا﴾ لە شَجَرَةُ الخُلدی درۆ! ﴿فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا﴾ عورەتیان بۆ یەك دەرکەوت، تا ئەو وەقتە خَیالی (سَوآتَیْنیان) بە دڵ دا نەهاتبوو. دیارە وەکی عرضم کردینە، ئەو دارە (مَنْهِيّ و عنە) وە، شتێ بووە مهیج لِباسی نوور، نازانم مَعْنای چیە؟ وە لِباسی نینۆکی چ لطافتێ تیا بووە؟ فائدەی چ بووە؟مادّەیێ وا رەق ببێ بە لباسی ؛ ئەبێ وەك قرژاڵ و کیسەڵ بووین! رەحمەت لە (إبنُ عبّاس) زاتێ گەورە بووە، قسەیان زۆر بە زوبانی هەڵبەستوە!

﴿وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ﴾ قصّاص ئەڵێن: هەنجیر! لەگەڵای هەبخیر پانتریان نەدیوە، ئەگەر مۆزیان دیبا، ئەیانکوت مۆز! گەڵای سەبز و پان و درێژ، ئەڵێی فەنەوزی کەسکە! ﴿وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ﴾ بە إرْتِکابی مَنْهِيٌّ عنە. ﴿فَغَوَى﴾ رێی بە مَقْصَد نەبرد حیاتێ مُستَمِدّ و خۆش، لە جێێ خوررەم دڵگوشاد. لێرە بە نَظَری إعْتِبار تەماشاکەین ئاگاداربین خاصةً ئەوانەی مُقرّبین

خۆبپارێزن لە مُخالفەی فەرمایشی خوا، بە حاڵی خۆ مغرور نەبن. بۆ مشایخ و روأسای دین، دِقَّة لازمە! بۆ ذراری رُسُل، اَلْزَمە! أمّا مخالفاتی عُلمای کلام، ئایا رُسُل مَعْصومن یان نا؟ تَفْصیلی لە کُتُبی کلام نوسراوە، لازم نیە لێرە إیرادی بکەین!! باپیرە گەورەم (مەلاعبدولرەحمانی جەلی) تحریرەکی هەیە لەسەر (منحُ المکیَّە) زۆر جوانە بە قەدەر رسالەیێ تەواو ئەبێ، شایانی مُطالعەیە! لە پاش ئەمە کە خوا ئەفەرموێ ﴿ثُمَّ اجْتَبَیهُ رَبُّهُ﴾ إختیاری کرد توفیقی دا بۆ تَوْبە، تَوْبەی کرد.

﴿فَتَابَ عَلَیْهِ﴾ تەوبەی قبوڵ کرد، رووی مەرحەمەتی تێ کردەوە. ﴿وَهَدَی﴾ بۆ مصالحی دارێن. دیارە چیتر بە وَسْوَەسەی شَیْطان فریب ناخوا. ئێمە لە حەق آدەم بڵێین چی؟ نابێ خود سەرانە نسبەتی گوناهی بێ عَزْمی بۆ بدەین! پێش خَلْقی آدەم، خوا بە ملائکەتانی فەرموو: من خلیفەیێ لە أرض دا ئەنێم، لەوی خلق ئەکەم آدەم چووە بەهەشت، ئەمە چۆن ئەبێ. ئەو ماجرایە بۆ ئەوە بوو کە ادەم بێتەوە مَقَرّی أصیلی مَکانی خۆی و أوْلادی، الی القِیامَة! ئەگەر وانەبا رأساً لە جَنَّة دەر نەدەکرا، نەدەهاتەوە أرْضی! ﴿قَالَ﴾ جەنابی حەق. ﴿إهْبِطَا مِنْهَا﴾ بچوونە خوار لە جَنَّة. ﴿جَمِیعًا﴾ آدەم و حوّاو إبلیس.

لە قُرآن باسی مارو طاووس نیە، ﴿بَعْضُکُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ جنة جێی عداوەت نیە، أرض منشأ و مأوای عداوەت و بُغضە. خۆبە خۆیی، ژن و مێرد، داك و باوك و أولاد، خزم و أقارب، إنصاف و عُروق، حتّا أهلی مَحَلّەیێ، مَحَلّەیێ لەگەڵ مَحَلّەي تر، مَعَ أنَّهُ صِرفْ بۆ أمرێ إعْتِباری دانـدراوە، وە هەم لەگەڵ إبْلیس، إبْلیس لەگەڵ ئێوە، دوشمن ئەبن!! پێش ئەو قرنە، عالەمێ بە سیرەت ئەهوەن بۆ مَحَبَّة و دۆستایەتی فِي الجُمْلە هەبوو، أمّا پاش تَعَمُّمی سیاسەت إنسان وای لێ هات هەموی خُفْیَة، بوونە دوشمنی یەك! هەر وەقتێ لێی هەڵکەوت، وەك عَقْرَبْ پێوەی دەدا، مَحَبَّة و دۆستایەتی نەما! ﴿فَإِمَّا

﴿يَأْتِيَنَّكُم﴾ به إعْتِباری ذُرِّيَّة. ﴿مِّنِّي هُدىً﴾ کتابێ، رسولێ. ﴿فَمَنِ إتَّبَعَ هُدَايَ﴾ مَقْصَد شخص نیه، هدایته! ﴿فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى﴾ لە دونیا و قیامەت، بە حیاتێ معیشتێ بَسیط راضی ئەبێ، ناکەوێتە ژێر باری مەدەنیەتی مُزَخْرَفە ی مُصَوَّرە ی کە هەمووی ضَلال و تَعْب و هیلاکی و ناڕەحەتیە! ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي﴾ قرآن و (سائر)ی (کُتُب)ی (ألهی) کە بۆ (هدایەت) ناردراون (تخصص)ی (هُدی) و (ذکر) بە قرآن بێ جێیە، (مُتابعە)ی ئەکا، چی(إیمان)ێ پێ بێ یان نا؟ ﴿فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا﴾ تەنگ (وَلَوْ) زۆریش دەوڵەمەندبێ، (دائما) دڵی سەغڵەتە، (لذەت)ی لێ نابینێ، تووشی هەزار (صدمە)ی ئەکات، ڕووئەکاتە (عُشرەت) و (سفاهەت) ئەکەوێتە (وادی) (سفالەت)، (قمار) ئەکا، رووت و قووت دەرئەچێ، لە ئێمە (معلوم)ە (مُشاهد)ە تا (مدنیەت) (ترقی) ئەکا، (ثروەت) زۆرتر ئەبێ، (عالم) دڵ تەنگتر ئەبێ. گەلێ (أبوملیون) (حسرەت) ئەکێشن، بۆ (عیش)ی (فقیر)ی (بسیط) لە ناو (کوخ)ی بە دڵێ (ڕاحەت) لەگەڵ (عائلە)ی خۆی بە سەری ئەبا! بنۆڕە کە (ساعەت)ی (عملە) (غروو)ی کرد (شرکەت)ەکان و (معمل)ەکان، چیان بەسەر دێ، (دنیا)یان لێ ئەبێتە چەرمی چوێلەکە. لە (بعض)ێ (إنکلیز)ەکان ئەپرسم _لای خۆی بە (لطیفە)_ (کۆیە) خۆشترە یا (لوندەرە)؟ ئەیان ووت: " کۆیە" ئەم ووت: "بۆ" ئەیان ووت: " (کۆیە) هەوای هەیە (نور)ی هەیە، لە ژێر و بۆری (شمس) (هوا)ی (صاف) (إستنشاق) ئەکەین، ئەوە لە (لۆندەرە)نیە".

(حتّى) چەند ساڵێ لە مەوپێش (جرائد) (إعلان)ی کرد، (ئەمڕۆ ڕۆژێکە،کە (تأریخ) نەی دیوە، (مُدّە)ی (٨)سعات لە (لوندەرە) ڕۆژ دیتراوە، (نور)ی داوەتە دەر و دیار!) توو خوا ئەمە (عەیش)ە؟ ئەوە لە (دار)ی (دنیا) (عیان)ە وە لەو(مقام)ە ئەمە (مقصد)ە، لە بەهەشت دێن بۆ (أرض) بۆ (دُنیا)یە بە (تعب)، لێرە (صرف)ی بۆ (قبر) و (قیامەت) لام جوان نیە ﴿وَنَحْشُرُهُ﴾ ئەمە بۆ (قیامەت)ە ﴿يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾ کوێر، نازانی بۆ کوێ

بچیٚ، روو لە کیٚکا؟ ﴿قَالَ﴾ ئەو (شخص)ە ﴿رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنتُ بَصِيراً﴾ چاوم هەبوو ئاگادار بووم ﴿قَالَ كَذَلِكَ﴾ بەو جۆرە (موافق)ی (بصیر)ت ﴿أَتَتْكَ آيَاتُنَا﴾ (مُبْصِرَة) ﴿فَنَسِيتَهَا﴾ (یعنی (ترك)ت کرد، بە دڵتا نەهات، با (وجود)ی خۆت بە (بصیر) ئەزانی ﴿وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى﴾ (ترك) ئەکریٚی لە کۆریدا، دیارە (مقام) (مقام)ی (نسیان)ی (عبارەت) و لەبەر ئەمان نیە.

(شێخ علی خالصی) فەرمووی: " چوارده (جز)وم قورآن لەبەر کردبوو، باوکم پیٚ ﷺ زانیبوو، (خبر)ی بیستبوو فەرمووی: " رۆڵە ناترسی لە بەرت نەمینیٚ؟" ئەی فەرموو: " لەو قسەی بابم زۆر ئەترسم" بۆیە (دائماً) خەریك بوو، بە (تلاوەت)ی (قرآن) لەبەر،(کرامەت)یٚکی (عجائب)م لیٚ دیت، قرآنی لە تەنیشت خۆی دانابوو،گاه گاه لە دڵدا (تردّد)ی ئەبوو لە (آیەت)یٚ، وای ئەکرد قورآنە کەی بیٚ(توقّف) لیٚك ئەکردەوە، ئە ی تۆریـە (آیەت)ەکە، (وهَکذا) بیٚ نیشانە و بیٚ (علامەت) ﴿وَكَذَلِكَ﴾ وەکی ئەو (جزا)یە ﴿نَجْزِي مَنْ أَسْرَفَ﴾ لە (لذات) و (شهوات) ڕۆچوو بیٚ ﴿وَلَمْ يُؤْمِن بِآيَاتِ رَبِّهِ﴾ خوای خۆی ﴿وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ﴾ دوای (بَدْأ)ی (حشر) ﴿أَشَدُّ وَأَبْقَى﴾ (لازم) ناکا تەواو نەبیٚ ﴿أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ﴾ بۆی (بیان) نەکردینە؟ ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ﴾ (بعد التعمیم) (توجیه)ی (خطاب)ە بۆ (قوم)ی (رسالەت) پەناه ﴿يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ﴾ هات و چۆیان ئەکرد، بە (أمین)ی و (مُطمَئن) ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّأُوْلِي النُّهَى﴾ (عقل)یٚ (ناهی) (زکی) وە (إلاّ) (قوم)ی تووش، تووش ئەبیٚ وەك ئەوانی‌تر (هلاك) ئەبیٚ.

(أمّا) (إنسان) سەیرە، پیٚك پیٚ ئەکەنن ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ﴾ کە (مُستأصل)یان ناکا، بە (عذاب)ی (سماوی) وەکی (أمەت)ەکانی‌تر ﴿لَكَانَ لِزَامًا﴾ (لازم) بوو (إیجاب)ی ئەکرد (محو)یان کەین ﴿وَأَجَلٌ مُّسَمًّى﴾ لەبەر (أجل)یٚ (معلوم) نەبا، کە لە (علم)ی (إلهی) بۆیان داندرایە ئیٚستا(ضرب)ە

کمان لیّ ئه‌دان ﴿فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ﴾ پیّی (مُضطرب) مه‌به، جیّ ی (ترك)ی (قتال)نیه، تا (نسف)کریّ ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ﴾ هه‌ر دووکیان به‌جیّ بیّنه، له (نقص) (تنزیه)، به (کمالات)ی (لائقه) (توصیف)، (مُحقّق) بزانه، (تأخیر)ی (عذاب)یان له (عجز)نیه ﴿قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ﴾ پیّش ڕۆژ هه‌لاتن ﴿وَقَبْلَ غُرُوبِهَا﴾ ئاوابوونی ﴿وَمِنْ آنَاءِ اللَّيْلِ﴾ (ساعات)ی شه‌و ﴿وَأَطْرَافَ النَّهَارِ﴾ (أجزا)ی (بین)ی (طلوع) و (غروب)، لام وایه (تطبیق)ی له‌سه‌ر (أوقات)ی (صلات) (مُشكل)ه، (یعنی) (غافل)مه‌به، له (تنزیه) و سوپاسی (کبریائی)، (مُواظبه) بکه له‌سه‌ر (دعوه‌ت)ی (أنام) بۆ (تسبیح) و (تحمید) ﴿لَعَلَّكَ تَرْضَى﴾ به (هدایه‌ت)ی (قوم)ت، (إلاّ مَنْ حقَّ عَلَيْهِ الكَلمَة) ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ﴾ چاوت له دوای نه‌بیّ! ﴿أَزْوَاجًا مِّنْهُمْ﴾ أصناف له‌وان، کافران، مُعْرِضان، مُلحدان. مه‌تاعی دونیا زیّده له قه‌ده‌ری کفاف، ثقله، تَعْبه، له بَدَنْي أمر، مانعه له ته‌ره‌قّي، حُبّي مُوجبه بۆ تَدَنّي. ﴿زَهْرَةَ الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا﴾ زینه‌ت و بَهْجَته. واقعاً مالّ بۆ إنسانی چاك، زۆر چاکه، خصوص بۆ مه‌لایی وه‌ك من، خدمه‌تی علم به حه‌ق، بیّ‌مالّ ناکریّ! مقصد له‌و پیّدانه ﴿لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾ تیّیدا به هیلاك بچن. ئه‌یزانی له ڕیّی صوابی صرف ناکه‌ن، پیّی مالّ ویّران ئه‌بن. ﴿وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ﴾ ئه‌وی بۆی دانایی، ئه‌مڕۆ سبه‌ی، نصیبت ئه‌بیّ! قسه له قیامه‌ت نیه! باسی قناعه لیّره مه‌که! ﴿وَأَبْقَى﴾ له ئی وان. رجا ئه‌که‌م گویّ مه‌ده‌نه سَبَبی نزُولی، که صاحبی (روحُ المعانی) له صدری سوره‌ت نقلیّ له (جلالی سیوطی) ئه‌کا ئیّوه و خودا (پیّغه‌مبه‌ر میوانی بیّ مجبوراً بنیّریته لای جوویّ ئاردی بداتی به سَلَفْ تا هلالي رَجَبْ، جوو بلّیّ تا به ره‌هن نه‌بیّ نایده‌م، «ابو رافِعْ» بگه‌ڕیّته‌وه خه‌به‌ری بداتیّ، پیغه‌مبه‌ر سویّند بخوا: ئه‌من أمینم له ئاسمان أمینم له أرض به‌و حالّه له‌سه‌ر ئه‌و حالّه، خوا ئایه‌ت ئه‌نیّریّ به‌و عیباره‌ته؟) ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ﴾ عائله‌ت. ﴿بِالصَّلَوٰةِ﴾ روو له خوا که، به‌عیشی حاضِرْ راضی به، وه‌ك (حوّا) نه‌بیّته محرّك بۆ ذلله! ئه‌گه‌ر ئه‌و

سوُرەتە وەکی (إبنُ عبّاس) و (إبن الزُّبیر) ئەفەرموون، مَکّی بیّ، مُراد بـە أهـل، دیارە چیە! وە بەو مُناسبەی کە إظْهارمان کرد دەرئـەکـەویّ حـەقـی (علـی) و (أصْهار)ی بە سەرەوە نیە! زوجەی مُطَهّرە ئەو وەقتە حضرەتی (خدیجـە) أمّ المؤمنین (خَدیَجة الکُبری) بووە کـەلای هـەمومـان خۆشـەویستە مُحترمـە دایـە گەورەمانە! کەوابـیّ حاجـەت ناکـا هـەشـت مانگـان رَسـولی أکْرَمْ بچێتە بـەر دەرگای (عَلی)، هەموو سبەینان بلّیّ: الصَّلواة رَحمکُمُ الله! انمّا یُریُـد_ الآیـة_؟ ئەوەچیە؟ ئەمە عزّەتـی (علـی) تیایـە!! یـا رَسـولی أکْرَم مـأمور بـووە وەکـی (بلال) عَرْضی خلافەت پەناهی بکا (الصّلوة)! دیارە قَوْلیّ بیّ أصـلـە. لام وایـە عەیب و عارە بۆ (إمامی علی)! ئـەبـا پـاش یـەك دووجـار زوو بـە خـەبـەر بـیّ، حاجەت نەکا بە هاتنی رَسولی أعْظَمْ! بعضی نُقّال ئاگادارن، بۆیە ئـەو ئایـەتـەو ئایەتی پێشی ئەڵێن: (مَدَنی)ن! أمّـا تَـوْجیهی ناکـەن، بـۆ إیـرادی لـەو میانـە! أمریّ لە طَرَف رسالەت پەنـاە، بۆ أهلـی، کافیـە! چـونکـی أهلـی وی، أهْلـن! ﴿وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ خۆشت دەوام کە لەسەر نوێژ، دائمُ التّوجُّه الی الله، بە! ﴿لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا﴾ خوا لە عبادی خۆی، عبادەتی ئـەویّ، مَقْصَدْ ئـەوەنیـە چ کـار و کەسب مەکە هەر نوێژ بکە! توو خووا إنسانیّ مُحتاج بیّ ئارد قەرزکا لـە جـوو، خوا پێی ئەڵیّ (لانسئلُك رزقاً)؟ ﴿نَّحْنُ نَرْزُقُكَ﴾ إنْتِظـار کـە ئـەمرۆ یـا سبەی چ رزقەکت بۆدێت! ﴿وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ سَبَبی اقوی، تَقْوایە. خـۆتبگـرە صـبرکە لەسەر دەعوەتی (الیالله). ﴿وَقَالُوا﴾ لە مُقابلی دەعوەتی رسالەت پەنـاە، بـۆ حیاتیّ طَیِّب و خۆشی ﴿لَوْلَا يَأْتِينَا بِآيَةٍ مِّن رَّبِّهِ﴾ سُبحانالله لـەو قومـە عنـودە ناگوێزە وەیە، دەست لە إقْتراحاتی فاسدەی خۆیان هەڵنـاگرن! ﴿أَوَلَمْ تَـأْتِهِم بَيِّنَـةُ مَـا فِـي الـصُّحُفِ الْأُولَىٰ﴾ (إبـراهیم) و (موسـی) و سـائری رُسُـلی کِـرام، ئەوەندە کافی نیە؟ حقاً کُلّی ئایەتیّ لە ئایاتی قُرآن کە مُشْتَمله لەسەر ئایـاتـی أکوان، هەزار مُقْتَرَحاتی وان دێنیّ! أموری مُعْتادەی نافعەی مُسْتَمِرّە، ئایـاتن! خارقەیّ بێت و بروا وەك برق چ کەڵکێکی هـەیـە سبەی ئـەبێتـە حکایـەت، لـە

پەناڕا هەزار ئەفسانەی لەگەڵ هەڵدەبەستن! ﴿وَلَوْ أَنَّا أَهْلَكْنَاهُم بِعَذَابٍ﴾ لە دونیابە عذابێ مُبید. ﴿مِّن قَبْلِهِ﴾ پێش ناردنی رسول. ﴿لَقَالُوا﴾ رۆژی جزاء. ﴿رَبَّنَا لَوْلَا أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا﴾ ئێمە غافڵ بووین لەبەر مەیل و هەوا فکرمان تێك چوو بوو، بۆیە بە تأمُّل نەبووین دەنائەتی أعمال و إعْتِقادیاتی چاك مان نەدەزانی.

﴿فَنَتَّبِعَ آيَاتِكَ﴾ إیمانمان دێنا (إطاعە)ی رسولمان ئەکرد ﴿مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ﴾ بە عذابی دونیا و اخرەت ذەلیل و مُفْتَضَح بین ئابڕوومان بچێ. خُلاصە ئەگەر رسولمان بۆ نەناردبان، نوعاًما مَعْزور ئەبوون، (دَفْعاً لِکُلِّ ذلكَ) خوا تا رُسُل نەنێرێ، أقوام وَلَوْ لە غایەتی بەدی بن، مُسْتَأصَل یان ناکا بە عذابی دونیا. ﴿قُلْ﴾ بە وانە بڵێ ﴿كُلٌّ﴾ لە ئێمەوە لە ئێوە. ﴿مُّتَرَبِّصٌ﴾ مُنتَظِرین چاوە نۆڕین عاقبەتمان چیە؟ کام لامان نائلی فَوْز و فلاح ئەبینێ؟ ﴿فَتَرَبَّصُوا﴾ دەوام کەن لەسەر ئەو (إنتظار)ە ﴿فَسَتَعْلَمُونَ﴾ (عن قریب) ﴿مَنْ أَصْحَابُ الصِّرَاطِ السَّوِيِّ﴾ کێ (صاحب)ی ڕێ ی ڕاستە ﴿وَمَنِ اهْتَدَىٰ﴾ بە ڕێی ڕاستدا دەڕوا، ئەگاتە (مطلوب) (مدنیَّەت)ی (فاضِلە) وەکی (فاراِبی) دەڵێ، ئەوەتە (أمَّەت)ێ (قانون)ێ باشی ببێ، وە(عمل)ی پێ بکەن، ئەوانە بە(دەوام)، (ماعدی)یتر، هەر (مدنیەت)ێ ببێ (أهل)ی (محکوم)ی (إنقراض)ە، وە لە (سورەت)ی (آتی) کە پێ ی ئەڵێن:(سورەت)ی (أنبیاء) وە(مەککی)یە (بالإتفاق)، یا یەك (آیەت) نەبێ ،(عدد)ی (آیات)ی (١١٢) (آیەت)ە، (نوعاًما) (بیان) ئەکرێ، (صاحب)ی (صراط)ی (سویُّ) و (من اهتدی) (بالفعل و العلامة) بۆتان (معلوم) ئەبێ.

## سورەتی (الانبیاء)

﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾

﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ﴾ بۆ ئەو (مُنْكِر) آنە، کە (إمهال) درابوون، بەڵکوو خۆ ئەپارێزن، (إیمان) ئێنن، (أمّا) نەیان کرد (أجل)یان نێزێك بووە، (وەقت)ە خوا (حساب)یان ببینی، (ختام)یان پێ بدا، ئەفەرموێ: " بە(ل)" (أنّهُ) (کیف)یان پێ دێ، ئارەزووی ئەکەن، زوویان بۆ بێ، لام وایە (حاجەت)نیە، (تأویل)ی‌کەن، بە (معنی): (إلی) یا (مِنْ) ئەو(قُرب)ە لام وایە، لە (دنیا)یە، باسی (قیامەت)نیە بۆیە (مُفسّرین) لە (توجیه)ی (مُتَحَیِّر)ن ﴿وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ﴾ تیای ڕۆ چووین ﴿مُّعْرِضُونَ﴾ لە (مصالح)ی (دارەین): لە تەماشای (سَیِّئات)ی خۆو و لە (مُحاسبه)ی (نفس) ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ﴾ (علی الإطلاق) (مِنْ) بۆ (تنصیص)ی(عُموم)ە ﴿مِّن رَّبِّهِم﴾ لە (طرف) خوای ﴿مُّحْدَثٍ﴾ تازە (مُجَدَّدْ) قسە لە(قدم) و (حُدوث)ی (زمان)ی نیە ﴿إِلَّا اسْتَمَعُوهُ﴾ (أمّا) (إستماع)ی (إعتبار) و (عِظەت) و (تَذَكُّرْ) نا ﴿وَهُمْ يَلْعَبُونَ﴾ گەمەی پێ ئەکەن. (سبحان الله) (أُمّەت)ێ هاتە (دور)ی (إنقراض)ی (أبداً) گوێ لە قسەی چاك ڕاناگرن، ئەوانەی (ناصح)ن قەشمەری یان پێ ئەکەن ﴿لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ﴾ دڵیان (ذاهل)ە (غافل)ە، ئاگای لە هیچ نیە. لە (ضمن)ی (إستماع) شتەکی ناچێتێ.

(عطف)ی (نَظر)ی ئەلای بکا کە دڵ (غافل) بوو، (إنسان) (شعور)ی بە (إدراك)ی (مشاعر) نابێ ﴿وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجْوَى﴾ بەدزی لە پەنا (خَلْوَه) ئەکەن ﴿الَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ ئەوانە لە (بین)ی خۆیان، دەربارەی (مُذكّر) گفت و گۆیان ئەکرد، ئەمە چیە؟ ﴿هَلْ هَذَا﴾ ئەوپیاوە ﴿إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ وەکی ئێوەیە،

چۆن (إتّباع)ی ئەکەن؟ ﴿أَفَتَأْتُونَ السِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾ ئەزانن(سحر)ە، چۆن (قبولْ)ی ئەکەن، وە (إیمان)ی پیّئیّنن؟ ﴿قَالَ﴾ (رسول) دوای ئەم گفت و گۆیە، وە لە (طرف) خوا (إعلام)ی‌کرا ﴿رَبِّي يَعْلَمُ الْقَوْلَ﴾ (سرّ) و (جهر) ﴿فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ﴾ لە هەر کویّ یە بگوتریّ: لە (عالم)ی (عُلویّ) و (سُفلی) ﴿وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ ئەو خوایە ئەزانیّ، (شاهد)ە، من (ساحر)نیم، (آیەت)م (سحر)نیە ﴿بَلْ قَالُواْ أَضْغَاثُ أَحْلاَمٍ﴾ خەونیّ تیّکەلاّو پیّکەلاّو، (إحتمال)ی هەیە (آیات)ی (دائر) بە (فتح) و فەیرۆزی‌یو (إستیلا)ی جهان (حمل) کەنە سەر خە ونی (مُختلط) و بیّ(تعبیر) ﴿بَلِ افْتَرَاهُ﴾ خۆکردیە،(نسبەت)ی بەخوا ئەدا ﴿بَلْ هُوَ شَاعِرٌ﴾ ئەوی هەوەسی لیّبیّ، (مدح)ی دەکا، ئەوی (کیف)ی لەگەلْ نەیە(هجو)ی ئەکا.

(خُلاصە) (أقوام)ی (مُضْطرِب)یان دەرحەق، (رسول)ی (أکرم) ووتیە، بۆ (إغواء) و (إضلال) و (منع)ی ناس، لە (هدایەت) و (إیمان) بە (قرآن) و (صاحب)ی (قرآن) ﴿فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ﴾ (أُعجوبە)یە ﴿كَمَا أُرْسِلَ الأَوَّلُونَ﴾ (آیەت)یّ وەکی (آیەت)ی وان، (مادام) (دعوی)ی (رسالەت) ئەکا، وەکی وان ئەبیّ (آیەت)ی وەکی وان بیّ. (لکن) لە (مواقع) و (حالات) نا (فکر)ن ﴿مَا آمَنَتْ قَبْلَهُم﴾ ئەوانەی (رُسُل)ی (سابق)یان بۆ چووین ﴿مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا﴾ (إقتراح)یان ئەکرد، باز (إیمان)یان نەهیّنا، بە (هلاك) چوون. ئەوان (إیمان)یان نەهیّنا ﴿أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوانە (إیمان)ی ئینن؟ گاهیّ بەهانەیان ئەگرت بەو (نوع)ە، گاهیّ ئەیان گوت: " (بشر) نابیّتە (رسول)" ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلاَّ رِجَالاً﴾ پیاو، إنسان. ﴿نُّوحِي إِلَيْهِمْ﴾ رأساً یا بە واسطەی مَلَکی مُوکَّلی بە وَحی. ﴿فَاسْئَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ﴾ عُلَمای تَأْریخ، لە أهلی کتاب. گەلیّ جار مُراجعە یان ئەکەن، وُثوقیان بە قسەیان هەیە. وهەموو عالەم ئەزانیّ، (نوح) (إبراهیم)، (موسی)، (عیسی)، ملائکە نەبووین. تَفْسیری أهلی ذکر لیّرە، بە أهلی قُران، یا بە ئالی رەسول، غَلَطە! وکذا بە أهلی تَهْلیلە و ختمە، ئەمە گەلیّ دوورترە! ﴿إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ ئاگاداری أحوالّی رُسُل نین. سؤالي عوام لە فُقهاء،

ضروریە ! سوادی أعْظَمْ طَبْعا بە مُقَلِّدی ئەمێنن، أمّا أهلی علم، ئەبێ یا ئەبا خۆیان هەڵکوتن لە تقلید دەرچن. ﴿وَمَا جَعَلْنَاهُمْ جَسَدًا﴾ وەك عْجلی (سامری). ﴿لَا يَأْكُلُونَ الطَّعَامَ﴾وە ناسن بنی ئادەمن. حاصڵی إنسان بووین حیاتیان مُتَوَقِّف بووە لەسەر طعام، خواردیتیان ، خواردیتیانەوە شتی تریشیان بووە، وەك سائری بَشَر. بَشَر بە رسالەت بە ولایەت بە سیادەت، لە قاعدەی طبیعی ناچێتەدەر! ئەژێ، ئەخوا، ئەمرێ! ﴿وَمَا كَانُوا خَالِدِينَ﴾ قَطْ نەمرن لێرە قسە لە (عیسی) ناکەن، امّا ئەو وَلَوْ تا ألئان نەمردبێ، آخری هەر ئەمرێ! امّا (قادیان)یەکان مُسرّن لەسەر مردنی لە وەقتێ خۆی. ﴿ثُمَّ صَدَقْنَاهُمُ الْوَعْدَ﴾ بە نجاتی اوداء، وە هیلاکی اعْداء. ﴿فَأَنجَيْنَاهُمْ﴾ رُسُلەکان، ﴿وَمَن نَّشَاءُ﴾ لە أُمّەتیان، ﴿وَأَهْلَكْنَا الْمُسْرِفِينَ﴾ لە کُفر و سیّئات. بە نوعێ کە تأثیر لە أعقاب بکا. ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ﴾ زاتاً مَقْصَد هدایەتی أُمّتە، ﴿كِتَابًا﴾ أما چۆن کتێبێ؟! هەر تێگەیشتنی پێئەوێ!! ﴿فِيهِ ذِكْرُكُمْ﴾ نام و نەنگ و شەرەف. ئەگەر إتّباعی بکەن، نأیلی هەموو فخارێ ئەبن، وەالاّ زەلیل و مَذموم و بێ قەدر و قیمەت ئەمێننەوە، بَیْنَ الأُمَم! ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ تابزانن ئێوە لە چ زیللەت دان، بە شیر و قشپلی حوشتر بە رێوە ئەچن!_ علی الأکثر عەرەب قەدری ئەو نعْمَتە نازانن!_.

میللەتێ صاحێبی رەسول، رەسولێکی وەکی (محمد)(ﷺ) کتابیان بووبێ، کتابێ وەکی قُرآنی کریمی حکیم، صاحبی شریعەت، صاحبی إعْتقادیاتێ فەیلەسوفانە، صاحبی قواعد و إسْتنْباط، صاحبی خَطّ و قەڵەم، بۆ هیچ إحتیاجیان بە أُمّە تێ تر نەبێ ئەوانی تر إحتیاجیان بەوان ببێ، خوا ئەزانێ ئەمە نِعْمەتێ چەند گەورەیە ! (حقیقةً) ئەگەر عاقڵ بان ئەوەندە ترغیبە، کافی بوو بۆ إیمان و هدایەتیان!! إنسان روو لە هەموو شەرەفێ وەرگێڕێ و شەرفی فِطْری بَشَری ضایع بەکا، مُقابلی صنمێ، کا راوەستێ، إظهاری مَسْکَنَتی عبودیّە تی بۆ بکا، ئەوە چ إنسانێکە؟ چ إنسانیّتە؟﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ﴾ لە قُرای خۆش و دلگوشا و صاحب مَناظِرْ، بە تَرَف و طَرَبْ،

وەك پاریس و بَعضە مَواقِعی تر لە أیّامی ئێمە. (قصم) شکستی لێك بوونـەوە، (فصم) بە(ف) درزی بَیّنی بـێ جـودا بوونـەوە، مُـرادی أهلـە، دیـارە! ﴿كَانَـتْ ظَالِمَةً﴾ لە هەر جهتێ وەبە هەر نوعێ بێ، تجاوزی لـە حَدْ کـردوە، ظُلمـی تیـا بلاّو بووتەوە، عام و شاملە! وە ظاهِرە ئەو نوعـە قریـە بـە هـیلاك چـوو وێـران بوووە، زۆر بووە! گوێ مەدە روایاتی پووچ، عبارەتی قُرآنی بۆ تێك مەدە! بـا بۆ خـاطری (إبـنُ عبـاس) (حُـضور) و (حـول) داخلـی قُـرای وێـران کـرای بـن!
﴿وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا﴾ پاش (هلاك)یان، لە دوای (قوم)ی (محو) بوەوە،

﴿قَوْمًا آخَرِينَ﴾ ئیتر، نەك لە (ذُرِّیەت)ی وان، نەم دیوە، کـەس قـسەی لـە (نُکتە)ی (بعد)ی کردبێ ﴿فَلَمَّا أَحَسُّوا﴾ رابـردووەکـان ئـەوانـی پـێش (قـوم)ی (آخر) ﴿بَأْسَنَا﴾ دیتیان (عذاب)ی ئێمە، چێشتیان ﴿إِذَا هُم مِّنْهَا﴾ لەو (قریە)ی پڕ (شهوات) و بە (نزاهەت)، هەر (قوم)ی لە(قُرا)ی خۆی ﴿يَرْكُضُونَ﴾ غاریـان دەدا، بە پێیان، بە سواری، نەخـشە بـێ لـەو شـارانەی کـە ئـەمڕۆ، (منبـع)ی (فـسق) و (فجـور) و بـێ (شـرف) و بـێ (ناموسـی)نـە، خـوا بیـان شـکێنی (عذاب)یان‌دا، هەلێن، لە ولاّتی (لهو) و (لذّەت) پێیان ئەگوترێ: ﴿لَا تَرْكُضُوا﴾ غار مەدەن، هەلّمەیەن، ئەو شارە خۆشە، خوڕەمـە، ئـەو (قـصر) و (قـصور)ە خۆشە، بەجێ مەیەلّن، شەرمکەن ﴿وَارْجِعُوا إِلَىٰ مَا أُتْرِفْتُمْ فِيهِ﴾ بگەڕێنەوە بـۆ لای ئەو ناز و (نعمەت) و (شهوات)ی زۆر، بە (عیش) و نۆش، (إمرار)ی (وەقت) بکەن ﴿وَمَسَاكِنِكُمْ﴾ (قصر) و کۆشك و سەراو شانشین و عروسی، مـەیخانـەو و تیاترۆخانەو وئـەویـدی! ﴿لَعَلَّكُمْ تُسْأَلُونَ﴾ بـەنـدەکـان و (خـدم) و (حـشم) و ئاییندەوو ڕەوەندە لە میوان (طالب) آنی (جُود) و (نـوال)ی ئێـوە، (أحـوال)ی (عالی)تان ئەپرسن، لە (صحّەت) و (عافیەت) و خۆش حالّیتان.

(جناب)ی (إبن) ئەلّێ: " وەك (ملوُك)ەکانی دەر بە دەر، ئەوماخولیایە یان ئەدەنەبەر" ئەمڕۆ فەرمـوودەی (شـێخی عربـی) ئـەخوێننـەوە، کـە (دولّـەت)ی (عثمانی)_ بعدالفُتور_ (قُوّەت) ئەستێنێەوە، بێچارە (آلعثمان) وا پـەڕاگەندە بوون، (فقیر) و بێ دەسەلّـات تـا (أبـد) (إعـاد)ەی (مُلـك) ناکـەنـەوە ﴿قَالُوا﴾

بەگەورەیی ﴿إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً﴾ (عطیّە) بۆ هەردووکیانە، یا (ولد)ی (ولد) یا (زیاد)ەکەوابێ بۆ (یعقوب)ە (ضَرر)ی نیە لەبەر (قرین)ە ، ئەگەر لایان (مُشارك)ەی (معطوف) و (معطوفُ علیە) بوو، لە (قُیود)ی (زائد)ە، (لازم)نیە ﴿وَكُلًّا﴾ هەر چوار ﴿جَعَلْنَا صَالِحِينَ﴾ چاك و ڕێك لەگەڵ یەك، لەگەڵ (عباد)ی خوا ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً﴾ (إمام) و (مُقتدی بە) لە (دین) و (دُنیا) ﴿يَهْدُونَ﴾ (أمّەت) ﴿بِأَمْرِنَا﴾ بە (ڕسالەت) ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ﴾ بۆ (کُلّ)ێکیان ﴿فِعْلَ الْخَيْرَاتِ﴾ (مقصد) لە (وحی) (خیرات)؛ کردنی (خیرات)ە، گەرچی (نفس)ی (فعل) (وحی) ناکرێ؛ (أمّا) ئەوان کە (خیرات) و (حسنات)یان بۆ (وحی) کرایە بە (نوع)ی بووە، کە(سوق)ی کردینە بۆ(عمل)، (کأنّە) (نفس)ی (فعل)ەکە (وحی)کرایە. لام وایە ئەو قسەجوانە لە (بین)ی (زمخشری) و (أبوحیّان) (نزاع)ە ﴿وَإِقَامَ الصَّلَاةِ﴾ نوێژیان چۆن بووە؟ نازانم ﴿وَإِيتَاءَ الزَّكَاةِ﴾ دیارە (رُسل)یش (مکلّف)ن بە (زکاة)دان، ئەمەش (تفصیلات)ی (مجهول)ە ﴿وَكَانُوا لَنَا﴾ (خاصةً) ﴿عَابِدِينَ﴾ (خالص) و (مخلص) و بی(ریب)و (شكّ) و (شرك) و (سمعە) و (ریا) و (دەغەڵی) و (فەلب) و (قلّابی) ﴿وَلُوطًا﴾ منسوبە بە فعلیٚ ﴿آتَيْنَاهُ﴾ تفسیري ئەکا ﴿حُكْمًا﴾ ئەڵێن حکمەت، یا نُبُوّة یا فصلي قضاء ﴿وَعِلْمًا﴾ شایاني رسالەت. ﴿وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَت تَّعْمَلُ الْخَبَائِثَ﴾ أنواعي أشنعە. ﴿إِنَّهُمْ﴾ أهلي قریە. ﴿كَانُوا قَوْمَ سَوْءٍ فَاسِقِينَ﴾ خارجن لە إطاعە. ﴿وَأَدْخَلْنَاهُ فِي رَحْمَتِنَا﴾ ڕەحمەتي إلاهي دەورەیدا، تیای غرق بوو، لە هەمو خصوص لە دونیا و آخرەت. ﴿إِنَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ قط شرابي نەخوارد بۆوە، بەمەستي زیناي لەگەڵ کچی خۆي نەکردبوو، حاشا ! ثُمَّ حاشا ! لە مقامي رسالەت دوورە ! ! بەڵام (یهود) حەقي مقامي عالي رسالەت نازانن ! مرتبەي صلاح، گەورەیە، بە دەست هەموو کەسی ناکەوێ، گەرچی ئێستا دەربارەي کەچە شێخێ بڵێی لە صالحانە، توورە ئەبێ ! ! وکذا مُریدي بغضت ئەکێشن. حضرەتي رسولي أکرم خاتمُ الرُّسُلیش خوا لە دەست مکّکەییانی نجاتدا، لە (مدینە) إقامەيکرد، مدینە بووە أرضي بە بەرەکەت، بەرەکەتي

فوقي كلّي بركات. ﴿ونوُحًا﴾ ئەویشمان نجات دا ﴿إِذْ نَادَى﴾ هاواري بردە بەر خووا، هانام بە بەرتۆ (ربی)! ﴿مِن قَبْلُ﴾ پێش ئەوانە. ترتیبي ذکري مخالف بۆ ترتیبي واقعي، إنساني بلیغ ئەتوانێ نکتەهای بۆ ذکر بکا. ﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ﴾ بەهانای هاتین، بە فریادي گەیشتینی، دوعامان قبولکرد. ﴿فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ﴾ عائله و مالێ و مندالّی نجاتمان‌دان قورتارمان کردن ﴿مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ﴾ غەمێ شدیدي، عُقدەی گەورەي، کۆرە گرێ ﴿وَنَصَرْنَاهُ مِنَ الْقَوْمِ﴾ نافەرموێ (علىالقوم)، چونکی یاریدەیی نجاتدان و حمایەکردنی، بە طُوفان بوو! بە قووەي بازوو نەبوو! حفظمان‌کرد لە قومي خۆي ﴿الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا﴾ کەونی و قەولی ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمَ سَوْءٍ﴾ بەد، ڕووچوو لە شەڕ ﴿فَأَغْرَقْنَاهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ هەموو، تأکیدە سەربەخۆ بێ‌تبعیەتي (کل)، چ فەیدییە؟ ئەگەر کەمیشي بێ وەك (إبنُ مالكْ) ئەفەرموێ ئەوەندە کەمنیە، إسْتِعمالي مُخِلّي فَصاحةْ بێ، مُمکنە بۆدفعي قیل و قال، وەك قیلێ ئەلّێ بکرێ بە (حال)! لاهوایە چی‌تیانیە! (سیّدي‌آلوسي) ئەفەرموێ: (وهُوکَما تری)! ﴿وَدَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ﴾ ذکریان بکە، شێوەی قصّەی وان وەکي ئەواني پێشونیە! إدارەي مُلك و سَلْطَنَتە، وەحُکم و عدالتە! ﴿إِذْ يَحْكُمَانِ﴾ سابقاً لە زەماني خۆیان، ئەمە أنّە صورەتي حالّی حاضرە ﴿فِي الْحَرْثِ﴾ مزرعە، ئەگەر باغ بووبێ، مجازە! ﴿إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمِ﴾ تێی‌بەر بوو بە شەو مێگەلی دێ. دیارەئی یەك شخص نەبووە، وەك خوردەمالّی عومومی بووە ﴿وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ﴾ بین الخصمین. یا جمع بووبێ چ فەیدییە؟ ﴿شَاهِدِينَ﴾ مُراد عنایەتی إلاهییە بەوانە! وە إلاّ خوا ئاگاداری هەمووشتە! أمّا لازم نیە ئاگاداری هەموو شت بکات هەزار حوکام و مەجتەهید بە غەلّەت ئەچن لە طەرەف خوا إیقاظ ناکرێن! ﴿فَفَهَّمْنَاهَا﴾ حُکمی حکومەت، یا فتوی! توخوا ئەم های و هویەی چی‌پێ ئەوێ؟ فهمی مرام ئەکرێ بە (ها)بێ، چ بە(ە)بێ!! جەنابی حەق حکمی صواب یا أصْوبي إلقاي قَلْبي ﴿سُلَيْمَانَ﴾ی کرد. ئایا حضرە تي (داود)یش حُکمي قَطعي فەرموو؟ لە قُران وەرناگیرێ! لام وایە ظاهراً مُذاکرەیان فەرمووە! لە إثْناي مُذاکرە حکمی

معقول و مقبول بۆ (سليمان)ى هووەيدا بووە، حضرەتي باوكيشي پێی راضي بووە! حُكم بە تعين، لە قرآن دانيە! لە روايات ئەفەرموون:: حضرەتي (داود) مێگەلەكەی داوەتە صاحِبي (حرث)، حضرەتي (سيلمان) گۆييا مندالْ بووە فەرمويەتى: شتيێ تر ارفقە مێگەلەكە بدرێتە صاحِبي (حرث) منفعەتي بۆوي بێ خاوەني مێگەلەكە خزمەتي (حرث)ە كە بكەن تاباشي ئەبێتەوە حاصلات ئەداتەوە. ظاهِرْ وايە حُكميان لە نَظَر و إجتهادەوە بوويێ، خوايە ماجرايە كە راضيە، قدمي هيچ كاميان ناكا، ئەفەرمووێ ﴿وَكُلًّا﴾ هەريەك لە داود وسُليمان ﴿آتَيْنَا﴾ (آلوسي) وهاي نووسيە! ﴿حُكْمًا وَعِلْمًا﴾ ئيتر چەند و چووني مەلاياني چيپێ ئەوێ؟. لەگەلێ جێ رام لە مُنازعەيان نيە! غايتي ما في الباب حُكُم يا حُكمي أرْفَقْ إلْهامي حَضرەتي (سُليمان) كرايە! دواێ (زُمخشري) ئەلێ: ئەگەر مادەێ هكذايي لە زەماني شريعەتي إسلام بقەومێ، حُكمي چيە؟.

من ئەلێم: ئەوەي عُلماي ئێمە ئەيفەرموون بۆ دَفعي فساد باشنيە! حتّا ئەگەر بێ أدبي نەبێ بۆ خاطري سدُّ الذَّرايع و إيقاظي أُمَّةْ حُكمي (داود)م لا باشترە لەحُكمي (سُليمان)، وَلَوْ كەحُكمي (سليمان) أرفقە!! مێگەل رەزەكەی خوارد– جنايةُ العَجْماءِ جُبار– چۆن ئەبێ؟ زاتاً نَفْسي عَجماء جنايتي نيە! وە ياخود ئەو وەقتە چۆن زەرەري مێو بقەرسێني با قەرسيل، قيمەتي چەندە بيدەتيە صاحبي باغ يا مزرعە، باغەكي دە رۆژە جووتي لە وەقتي پشكوتن هەموي بخورێ، قيمەتي پشكۆژەي درهەمەك نيە! صاحبيشي خانە خشتور بووە! ئەوەی حالّي حاضر حُكمي پێ ئەكەين بە تقدير زۆرباشە. ﴿وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُدَ الْجِبَالَ﴾ نافەرمووێ: لە: زێرا(تسخير)ى (جبال) لێرە (توافق)ە، (جبال) بە (مُتابعە)ى ئەو ﴿يُسَبِّحْنَ﴾ (تقديس)ى (كبريائى)يان ئەكرد، چۆنيان (تسبيح) ئەكرد؟ (ظاهِر)وايە بە (لسان)ى (قال). ئەمرۆ دوورنيە (غرامافۆن) (تسبيح)ى (داود) و (تقديس) ئەكا (حيات)يشي نيە، (لكن) (أساساً) (لذي حيات) ئەبێ. خوا (منشأ)ى (حيات)ى (كُلّ)ە، ئەتواني (تسبيح) بە (خيالْ) بكا با ئاگاداريش نەبن. (قسم)ێ لە (معتزلى) (مُشوّش)ن قسەی بێهوودە ئەكەن، بەلێ

(ممكن)ە بكەن، (داود) (إستیلا)ی (جبال)ی (أطراف)ی (فلسطین)یكرد (مُلك)ی (واسع) بوو، لەو (جبال)ی (إستیلا) كراو، گرمەو (ضجّە) و (صدی)ی (تسبیح)ی (إلهی) ئەهات. (دین) و (توحید) تیایا (نشر) بووبوو، لەبەر (سعەت)ی (مُلك) (إحتیاج)ی بە ئاگاداری (أطراف) هەبوو، (جناب)ی (حق) كو (جبال)ی لەگەڵ (مُسخّر) كرد ﴿وَالطَّيْرَ﴾ (طیر)ی (برید)ی (مُعلَّمْ) بۆ (خبر) هینان، ئەویشی بۆ (مُسخّر) كرد. تا ئاگاداری (أحواڵ)ی (ممالیك)ی خۆی بێ ﴿وَكُنَّا فَاعِلِينَ﴾ ئەمە (أثر)ی (شأن)ی (إله)ییە ئەوجۆرە كارە بكا ﴿وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ﴾ ئەوەی (إنسان) بێ فێر بوون لە (أستاد) بیزانێ و بیكا، دیارە (إلهام)ی فێر بوونی لە (طرف) خوایە، (فطري) بۆ (فاطر)ە، ئەو (مصنوع)ە چ بوو؟ زرێ. بۆ چ بوو؟ ﴿لِتُحْصِنَكُم مِّن بَأْسِكُمْ﴾ هەنگامی شەڕ، تیرو ڕم بە (زەحمەت) كاری تێ ئەكا ﴿فَهَلْ أَنتُمْ شَاكِرُونَ﴾ لەسەر ئەو (نعمەت)ە. بەڵێ ئەوی (مسڵمان) بێ لەسەر (منافع)ی (عمومی) ئەو میراتە، (تشكّر) ئەكا، وە ئێمە ئەبوو (اختراعات) بكەین، بۆ (صیانەت) و (تحصین)ی خۆمان و وڵاتمان (لكن) (مانع) هەیە، چیە؟ (إعتقاد) (إعتقاد)ی (مزخرف)، كە نەخوا پێیخۆشە نە پێغەمبەر. بە ناوی (قوەت) و (قدرەت)ی (إلهی) و (معجن)ە، (عالم)یان (محروم) كرد، لە (قوەت)ی خوا ﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ﴾ با ﴿عَاصِفَةً﴾ بای بە (قوّەت) ﴿تَجْرِي بِأَمْرِهِ﴾ بە گوێرەی (میل)ی ئەو، دیارە ئەو (نوع)ە (أمر)ە (أمر)ی (تكوینی)یە، (حتّی) بۆ خوایە ﴿إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا﴾ (شام) لە (أطراف)ی (مملكەت) بۆ (جهەت)ی (عاصمە) ئەهات ﴿وَكُنَّا بِكُلِّ شَيْءٍ عَالِمِينَ﴾ ئەو (ریح)ە كوو (مُسخّر) بوو؟ ئەگەر بنواڕیە قسەی (نُقّال)آن، ئاسانە لە (قرآن) باسی (بساط)نیە، زێڕا ئەو (بساط)ەی (حكایەت) خوانان باسی لێ ئەكەن، لە (صحرا)ی (خیاڵ) نەبێ، جێی نابێتەوە بە بای (وهم) نەبی ناڕوا. (ممكن)ە شتێ وەك (طیّار)ە بوونی، بە (بُخار) ، (حركە)ی كردبی. (إختراع)یّ وایان بۆكردبێ، ئەوە لەگەڵ (نهایەت)ی (آیەت) زۆر (موافق)ە (جنابی آلوسی) (ڕەحمەت)ی لێ بێ ئەڵێ:" لە(عجایب)ە، (أهل)ی (لندن) خۆیانماندی

ئەکەن، کە(سفینە)یە (هوائی) دروست کەن، (قوەت)ی (بخار) بڕوا،(مغرور) بووین بە (پاپۆر)، بۆیان تەواو نەبوە، وە(ظن)نابەم بۆیان تەواوبی"، ئەڵێ: " (بعض)ی (خبر)دار، (خبر)ی دایمی کە (سفینە)یە لە (هوا) ئەڕوا، دروستیان کردیە، (أمّا) بە (إرادە)ی وان، (حرکە) ناکا، (کیفما إتّفق)یە" لای وایە چونکی ئەمە (مُعجز)ەیە بۆ (حضرەت)ی (سلیمان)، نابێ (إنسان) لە (طریق)ی (علم) (تسخیر) (هواء)بکا، خۆزی (سیّد) ئەمڕۆ زیندی با، دیبای لە (بەغدا) (طیارە) چۆن دێ و ودەڕوا، گوێی لە (ڕادیۆ)ی با بە (تلفۆن) (مُخابرە)ی کردبا. بەڵێ (عرض)م کردن، (إعتقاد) (مانع)ی (ترقی)یە. (ئاوروپایی) کە دەڵێن: " دین مانعە"، ڕاست دەکەن، بەو (نوع)ەی (ڕۆسا)ی (دین) تێیان گەیاندین، دیارە (مانع)ە. وە بەڵکوو گەلێ (دین) بۆ (سفالەت) (سوق)ی (إنسان)ی ئەکا.

(معتزلی) با (وجود)ی (عُلما)ی (عقل)ن، لایان وایە، ئەوەی (بشر) ئەیزانێ لە (صنائع)_ (حتّی) (أدویە)ی (أمراض)_ هەمووی لە پیغەمبەران وەرگیرایە! ﴿وَمِنَ الشَّيَاطِينِ﴾ مەهەرەی (صانع) و لەوان و (مهندس) و (معماری) باشیانمان بە (مُسخّر) کرد ﴿مَن يَغُوصُونَ لَهُ﴾ بۆی ئەچوونە بن (بحر) بۆ (لؤلؤ) ﴿وَيَعْمَلُونَ عَمَلًا دُونَ ذَلِكَ﴾ (غیر)ی ئەوە لە (بنا) و (صنائع لە (تأریخی عمومی) ئەڵێ: " پاش (حضرەت)ی (موسی) لە(بنیإسرائیلی) (٣) (ذوات)ی (عالی)یان هەیە، کە (بنیإسرائیلی) لە (زەمان)یی وان گەیشتنە سەر تەپۆڵکەی گەورەیی: (طالوت) (مُؤسس)ی (دوڵەت)، (داود) و (سلیمان)، (داود) (توسیع)ی پێدا (سلیمان) (بهجەت) و (حشمەت) و دارایی (سلطنەت)ی زیادکرد. (تفسیر)ی (شیاطین) بە (مەهەرە)ی (صنایع) و (غوّاص) لەگەڵ ﴿وَكُنَّا لَهُمْ حَافِظِينَ﴾ زۆر (مُوافق)ە، دیارە چوونە ناو (بحر) بۆ وان، جێ ی (خطر) بوە، خوا (حفظ)ی کردینە. (أمّا) (شیاطین)ی تر، بەقسان، بە ناو عارد و ئاوو چیا وهەوادا، وەك ئێمە بەسەر عارردا، دێن و دەڕۆن. (مُفسّر)ەکان تووشی (أسئلە)وو (أجوبە)یە سەیر سەیر ئەبن، هەرچەند کە (غوّاص)ی (بحر)ی (معانی) و (دقائق)ن، (لکن) لێرە بە (کیف)ی من نین، وە لە (جُملە)ی

(آخر)یش (مەعنا)ی (خلاف)ی (ظاهر) لیٚئەدەنەوە، باوڕناکەم (شیطان) (معماری) بزانی. لە (تأریخی عمومی) ئەڵێ: " (معماری) لە (فنیکە- فنیقیەکان)یان (جلب) ئەکرد، (فنیکەئی) (سعەت)ی (مُلك)یان بوو بوو، بوو بوونە (صاحب)ی (معادن) و مەڕمەڕ و (أشیا)ی دی، (ملّاحی)ش پیشەیان بوو، لە (بحرا) بە (قوّەت) بوون، لەوانی ئەو (لوازم)ە دەرکردیە" ئەمە خۆیەتی. دوایە دیم، ڕۆژی دوو شەمو، پێنجی شوّال لە (مجلە)ی (هلال) عددی(خامس) (شهر)ی (یولیو) (١٩٣٨)؛ (بحث)ی لە (أسطول)ی (ملك) (سلیمان) ئەکرد، زۆرم پیخۆشبوو، (حتّی) کە (حضرەت)ی (سلیمان) (إنشا)ی (أسطول)ی کرد، (طریق)ی (تجارەت) لە (بادیە) ڕووی کردە (بحر)ی (أحمر)، (سفائن) دەهات و دەچوو، (محصولات)ی (شام) و (یمن) و (هندی) ئێنا و ئەبرد،(خزینە)ی (سبأ) چۆل بوو، لە (مُکوث)ی (تجاری)، بۆیە (ملکە)ی (سبأ) (مجبور) بوو، هاتە (زیارەت)ی (سلیمان )" (أمّا) (نُقّال)آنی ئێمە، بەس (کیف)یان لەگەڵ (أعُجوبە)نی (سحر) و (کرامەت) و (معجزە) دێت، گۆیا (إیمان)یان بە (رسول)آن بە (قوّەت) دەبیٚ!

﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ﴾ هاواري بردە بەر ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ﴾ نەصاغي ﴿وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ بەڕەحمەتي خۆت شفام بدەی. نێزیکە بڵێم من لە (أیوب) نەصاغ ترم حاڵم ناخۆش ترە بە باداري و مایە سیري مُتبلام لە أوّلي عومرەوە، فقر نعوذُ بالله، قسم الفقرُ ظَهري، مُلك لیٚ غصب کراو، ماڵ بە تاڵان چوویی، کە سیٚ مُطّلعي حالم بیٚ تعجُّب ئەکا چۆن شتیٚ ئەزانم وە چۆن ئەتوانم بنوسم؟ علاوەي هەمووي آل چاغي (أحمد دەیونی) حُزناً علی حُزنٍ ئەدا!.[1] تفسیری حاڵی أیّوبی لە سورەی (ص) دیٚ! ﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِن ضُرٍّ﴾ دوعامان قبوڵ کرد شفامان دا. علاوةً ﴿وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ﴾ بۆی نویٚ کراوە سەر لە نویٚ أولادی بوو. ﴿وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ﴾ لە أحفاد مع الثروةِ. ﴿رَحْمَةً مِّنْ

---

[1] ـ مەبەست لێی (ئەحمەد دەیونی) قائم مەقامی ئەوسای (کۆیە) بووە لە ساڵی ١٩٣٨.

عِندِنَا﴾ رەحم بە أيّوبي. ﴿وَذِكْرَى لِلْعَابِدِينَ﴾ صبركەن، نائلي أجرئەبن! دوعابكەن خۆهەڵنەخەڵەتێنن! دوعا مُنافي رضانية، رضا إقتِضاي تركي دوعا ناكا! گەلێ كەس بە دوعاي باطلە تجاوز لە حد ئەكا، أما لدى الإختبار، بۆڤی دەرئەكەوێ! حقاً مَسْلكي أنبياي كرام لە هەموو مسلكێ باشترە! ﴿وَإِسْمَعِيلَ وَإِدْرِيسَ﴾ ئەوانە معلومن. ﴿وَذَا الْكِفْلِ﴾ كێيە؟ نەي معلوم! مُفسّرين أقواليان زۆرە، ئەو عنوانە لە بني إسرائيلي ناوە شێتەوە! ﴿كُلٌّ﴾ لەوانە ﴿مِّنَ الصَّابِرِينَ﴾ ديارە تووشي شَدائد و أهوال بووين خۆيان گرتيە. ﴿وَأَدْخَلْنَاهُمْ فِي رَحْمَتِنَا﴾ كەوتوونە ناوي، انّهُ بوويتە لباس و ظرفيان. ﴿إِنَّهُم مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾ صلاحي عامّە. هەر مرتبە نوعە صلاحەكي هەيە! ﴿وَذَا النُّونِ﴾ ئەويش يادبكە! (يونس بن متىّ) إرحج (متّى) ناوي بابي بووە، نسبەتي زێتر ذكر نەكراوە. ﴿إِذ ذَّهَبَ مُغَاضِبًا﴾ لە قومي بۆ خواي، لە خواي نا!! ﴿فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ﴾ تضيقي ناكەين، نافەرموێ (لنْ نَقْتَدِرَ)! ئەم ظنّە معاذ الله، كُفرە! باوڕەكە (فرعون) بتوانێ بڵێ خوا إقْتداري بەسەر من دانيە! خيالێ ئەكرێ خوا كەسێ بكا بە رسول أمري بكاتێ بۆسەر أُمّتێ بچێ، نەچێ بەلاێ تردا هەڵێ؟ حاشا! بەلام حەوصلەي (يهود) دائر بە رسالەت، زۆر واسعە! خوا عكس الظّنْ، تەنگی بەسەرداگێڕا، كەوتە ناو زگی ماسي! ﴿فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ﴾ بۆ جَمْعي ظُلُمات، لازم نيە (حوت)ێ گەورەتر، (حوت)ی ئەو قووت بدا! ﴿أَن لَّا إِلَهَ إِلَّا أَنتَ﴾ توجُّهُم هەر تووە! ﴿سُبْحَانَكَ﴾ مُنَزَّهي بۆ تووە. بەشەر خالّی نيە لە نقص، بێ تحمّلە! ﴿إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ صبرم نەگرت، بێ إشارەي تو رۆيشتم. يارسول تۆ وا مەبە! مُنتَظري أمريە! ﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ﴾ دوعاي بيسترا إيجابەكرا. ﴿وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ﴾ ئەوي تياي بوو. ﴿وَكَذَلِكَ﴾ بەو نوعە. ﴿نُنجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾ لە بەلاو غەمان خوايە ئێمەش نجاة بدەي! ﴿وَزَكَرِيَّا﴾ ئەويش يادكە! ﴿إِذْ نَادَى رَبَّهُ﴾ تعالى ﴿رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا﴾ تەنيا بێ ولد و وارث. ﴿وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ﴾ بە مُقْتَضاي خيرُالوارثيت، ميرات گرێ چاكم پێ كەرەمكە!

﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ﴾ دوعایەكەي ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَى﴾ لە سورەی(مَرْيَمْ) نوعامـا تَفسیري رابورد ﴿وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ﴾ شایاني مُعاشره خلْقاً و خُلْقاً! أمّا زوبـان درێژي لـە حـەق ناكـەم! ﴿إِنَّهُمْ﴾ ئـەوانـي ذكـر كـران ﴿كَـانُوا﴾ مُـستمر بـوون ﴿يُـسَارِعُونَ فِـي الْخَيْـرَاتِ﴾ لـە ناویـان‌دا وەمُمكنـە بـۆ (زكریّـا) و (والـي) بـي! ﴿وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا﴾ ئەمە خۆیەتي! مُلائمي طَبعي بَشَره! حقّ و حقیقتـه! لە بەیني خوف و رجـاء، خواپـەرسـتن زۆر باشـە، بـیٚ تـَصلُّن و تـَصَوُّفـە! مـن خواي هەر بۆ خواي ئەپـەرستم! بـیٚ ئومێد و بیم! ئـەوەي ئومێـدي هـەبیٚ، ئومێـد ئـەپـەرستیٚ! (شـێخی إبنُ سینا)ش لـە (إشـارات) لـەو نوعـە قـسەي فەرمووە. یەكیٚ: (گەر مُخیّر بم لە بە یني جَنَّة و نار، نارم ئـەویٚ! جَنَّـة حَـضّي نَفسي تیایە!). خلافي مَسْلك و مَشربي رُسُله، خلافي حقّ و حقیقته، خلافي مەیلی بَشَره! بَشَرْ لە جِلبابي بَشَري ناچێتەدەر! ﴿وَكَانُوا لَنَـا﴾ بـەس! ﴿خَاشِعِينَ﴾ مُتَضرِّعن. ﴿وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَـا﴾ نـاوی نـامێنین، بـە نـەوعـیٚ كـە خـەیالّی زەواجی نەدەهـات، ﴿فَنَفَخْنَـا فِيهَـا﴾ لـەو كـەسـە كـە ﴿مِـن رُّوحِنَـا﴾ قـوەت و مەتانەت و عەزم و صەبر، ﴿وَجَعَلْنَاهَـا وَابْنَهَـا﴾ ئـەویش زكـر ناكـەیـن ئـەمـا مەعلومـە. ﴿آيَـةً لِّلْعَـالَمِينَ﴾ لـە پـاش تـەقـەروری تناسُـل چـی وەهـا نـەبووە، «رەحمە تی خوای لیٚ بیٚ»، رێژیٚ «یافَخْرَم» قورئـانی دەخوێنـد، زۆر مُواضِبْ بوو لەسەر قورئان خوێندن كەم كەمە غەلّەتی ئەكرد دەفعـەیـیٚ ئـەو ئایـەتـەی خوێندەوە، بەو نەوعە «« وَجَعَلناها وابناها»» ووتم، دەخیـل نـەكـەی! یـەكیٚ عقائدی ئەهلی تەوحیدی وا پیٚ تێك چوو! ئەگەر دوو با! بە جاریٚ دونیا لە ئـە هلی تـەوحید وێران دەبوو.. جار جار دەلّێم« خۆزی ئەویشی بە طریقي موعتـاد بوویا تا ئەو هذیاتانە نەگووترابا» بە عزاً ئەلّێم ئەمە نیهانی‌یە هەر ئەگـووترا بـە تەرزێكی‌تر بەیانی كوفر و ظلالیان ئەكرد. ﴿إِنَّ هَذِهِ﴾ أيّها الناسْ ﴿أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ هەموو رسول و أنبیـاء و دُعـاتی خـەیـر بـۆ ئیلاهـیٚ واحـد دەعوەتیـان كرد. لەبەر خوایـیٚ واحیدی خالقی كُل پاراپینەوە، تەفرەقەیان نـەبـووە. ﴿وَأَنَـا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ﴾ خاصةً بیٚ شرك ﴿وَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ﴾ پارچـە پارچـە یـان

کرد، مُختَلِفْ بوون، هەر کەس دوای هەوای خۆی کەوت. ذاتێکی کۆییا کردی (قدوة)، باقی هیچ، موخالیفە، ﴿كُلٌّ إِلَيْنَا رَاجِعُونَ﴾ بە جەزای خۆیان ئەگەن ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ﴾ بە گوێرەی خۆی. دیارە دەرجاتی بەشەر لە صلاح وشَر مُتفاوتە ﴿وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ ئیمانی دروست ﴿فَلَا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِ﴾ بزر ناکرێ ثەمەرەی سەعیی ی خۆی دەچنێ. ﴿وَإِنَّا لَهُ كَاتِبُونَ﴾ ئەوەندە بە سەیە بۆ إنسانی عاقل، کە سەعی لە صلاح بکات. خوا خۆی سەعی و کردەوەی بۆ دەنووسێ ثەبتی دەکات، عەمەلی صالح بێ ئیمان بۆ ئاخرەت وەجهێکی نییە دیارە کە ئەفراد و چاك بوون ئەهلی نزلیش چاك ئەبن، کە أهلی چاك بوون.. ئەهلی مدینەش چاك دەبن، سیاسەت باش بێ ئیدارە زەریف دەبێ، قەوم بێ سیئات دەبن، مُلك سلطنەتیان دەوام دەکات، ﴿وَحَرَامٌ عَلَى قَرْيَةٍ﴾ أهلی ﴿أَهْلَكْنَاهَا﴾ ئیرادەی مەحوو و نابوودی بکات، ممنوعە أنَّە، مُحالە، لە خراپە بگەڕێتەوە، ﴿أَنَّهُمْ لَا يَرْجِعُونَ﴾ لە سیئات ناگەڕێنەوە دائماً زیاد دەکەن، لە خراپە، مُسكِرات، فَحْشِيَّات، قُمار، دزی، حیزی، ئەنواعی فەساد. دەعوەتی رُسُل، نُصحی ناصح تأثیریان تێ ناکات، لە غەیر و ظلال تمادّی دەکەن، ﴿حَتَّى إِذَا فُتِحَتْ﴾ کرایەوە، بەرەڵابوون. ﴿يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ﴾ أهلی یاغی، سەر سەری، بەر بەری، ئەوجا ثۆرُ «ثأر» شەڕ و شۆڕی داخلی زۆر دەبێ. ﴿وَهُم﴾ ئەو ئەوباشانەی ئەهلی شرور و فتنە ﴿مِّن كُلِّ حَدَبٍ﴾ لە هەموو بلندایەتیان، ﴿يَنسِلُونَ﴾ بە سُرعەت دێن، هجوم دەکەن، بۆ رۆسای قەوم، مەرکەزی ئیدارە، ئەوانیش لە هەموو بلندایی دێنە خوار بە سُرعەت، ﴿وَاقْتَرَبَ الْوَعْدُ الْحَقُّ﴾ هیلاکی قەوم، أسارەتیان، محویان، کەوتنە ژێردەستی أجانب، ﴿فَإِذَا هِيَ﴾ قصەیێ غەریب ﴿شَاخِصَةٌ﴾ لە مۆلەق دەوەستێ ﴿أَبْصَارُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ کوفرانی نیعمەت بە دەوڵەت و ماڵ و منداڵ مەغرور بوون، بە سەفالەت و سەفاهەت إشتغالیان کرد، ئاگایان لە ئیدارەی موڵك و میللەت نەما، ﴿يَا وَيْلَنَا﴾ هاوار لە خۆیان ﴿قَدْ كُنَّا فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَذَا﴾ نەمزانی وامان بەسەردێ ﴿بَلْ كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ بە إتباعی شەهوات خۆمان گێژ وویژ کرد تا وان

بەسەرهات، ئێمە ئەو مەقامەمان وا تەفسیرکرد، نەقالان لەبەر یأجوج و مأجوج، خەیلێکە لە عالمی وەهم و خەیالٚ نەبیٚ جیٚیان نابێتەوە، فەهمی ئایاتیان لیٚ بەستراوە، دائما ئەوان تەماشای قیامەت ئەکەن، بۆیە لێرە زۆر مُضْطَرِبنْ. کوو «وَحَرام....الخ» لەگەلٚ «حتّی....الخ» رەبط دەن، تەکەلوفیان هەیە، با لە سورەتی کَهفْ ئەو یأجوج و مأجوجی دەیلێین بگونجیٚ لێرە ناگونجیٚ، قسە لە هیلاکی دونیایە بۆ ئەوانەی عەملی صالح ناکەن دوای هەوا دەکەون. با ألان خطابیان لەگەلٚ بکریٚ بۆ جزاو حرمانی قیامەت ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ کە ئومێدی نەجاتتان پیٚ یان بوو، ﴿حَصَبُ جَهَنَّمَ﴾ لە دونیا چۆن بەهاوارتان هاتن؟ لە قیامەتیش وا لەگەلٚ ئێوە دەکەونە جهنّم و سَلْ المَصیرَ. ئەلێین ئەو وەختە کە سلطان محمود دەوری بوو عادەت وابوو وەکذا سلطان محمد فاتح خەریکی فەتحی اسطنبول بوو أهالی بلدة و أرکان حکومەت و دین دەچوونە لای بوت و هیکل و تمثالی عذراء یسوعُ دەپاڕانەوە نەجاتیان بدەن، معالأسف ئەو سەفاهەتە هاتە ناو إسلامیان أولاً روحی حەیاتیان لەو نەوعە ئایەتە نەزع کرد، دوایی عەقلٚ دوایی قوەت و ئیرادە، تا ئەوەیان بەسەرهات کە دەی بینین، ﴿أَنتُمْ لَهَا﴾ لامیٚ جوانە ﴿وَارِدُونَ﴾ وەکذا إلاهیان ﴿لَوْ كَانَ هَٰؤُلَاءِ﴾ ئەو أصنامی کە دەی پەرستن ﴿آلِهَةً﴾ بەڕاستی خوایان ﴿مَّا وَرَدُوهَا﴾ خۆیان یا نەیان دەهێشت أتباع و عوبادیان بکەونە ناو جَهنمْ. ﴿وَكُلٌّ فِيهَا خَالِدُونَ﴾. موممکنە عەینی هیاکلُ (تەماثیل)یان إعادە بکرێت لەجەهەنم لایان داندرێت، بسووتێن، تا تأثرو تحسُریان زیادبیٚ، ﴿لَهُمْ﴾ بۆ عەبدە ﴿فِيهَا﴾ لە جەهەننەمدا ﴿زَفِيرٌ﴾ هەناسەیان دێتە دەریٚ بە دەنگ و غەمناکی ﴿وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ﴾ لە بەر زەفیری خۆیان گوێیان لە هیچ نییە نابیین، ئەو گرۆهە أهلی مەدەنیەتی فاجرەیە، خۆیان بەد، قانونیان بەدتر، تابعی نەفس وهەوا، مەغرور، بیٚ عاقیبەت ئەندیشی، حالٚی دونیا و قیامەتیان زۆر موناسیبە، ئەو زەفیرە موقابلی تغنّي و مۆسیقایانە.. ﴿إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَىٰ﴾ أهلی مدنیەتی فاضلة، خۆیان باش و قانون و شریعەتیان چاك،

به عدالەت و بیّ میل. ئەو قومه لە دونیا بەکمالي خۆشي ئەژين، بیّ جزع و فزع، ﴿أُوْلَٰئِكَ﴾ ئەوانه ﴿عَنْهَا﴾ له جهنّم، ﴿مُبْعَدُونَ﴾ له دونیا نسبەتیان لەگەلّ جهنّم نەبووه، له آخرەت طبیعي لیّی دوورن ﴿لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا﴾ دەنگ و چریکه چریك و حرکه و زَفیر و شَهیقي نابیّن، حتّا ئەگەر بە سەریشیا تیّ پەڕن، دەنگی نابیێن! ﴿وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَالِدُونَ﴾ عالەم له سایەي وان له إستراحەت دابوون، به حُریّتي خۆیان ژیاین، بۆیه بەو گوێره نائلي مَحْظوظات ئەبن ﴿لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ﴾ چونکي له دونیا دائماً ئاگادار بووين له أحوالي أمّة، گەوره و گچکه، غافلّ نەبووين، مەیدانیان به ثأر و فساد و جزَع و فزَع نەدایه، نەیان هیێشتیه ئاگري فتنه هەلّایسیّ، ڕۆژي جزاء له هَولي طامّه ي کُبری له أموري مُخیفي محزون نابن! ئەندیشه و هەراسەیان پیّ ناگەیێنیّ! ﴿وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ﴾ به إستقبالیانەوه دیّن. وا ظاهره کە له اوّلي هاتنه بۆ مەیداني حشر! ﴿هَٰذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ (فلَكُمْ البُشری بإنْجازِ وَعْده تَعالی!) ﴿يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ﴾ قەدي ئەکەین ئەیپێچینەوه ﴿كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ﴾ گەلیّ ڕاوەستام تەماشاي تفسیرەکانم کرد چي وام نەدیت به دەلّەوه نووسیّ وه بینوسم، دوایيّ مُراجعەی قاموسم کرد ئەلّیّ: (سجل) به معنا (کاتب)ه نەکاتبیّ مخصوص وەکي روایەت ئەکەن له (إبنُ عمر) له (إبنُ عباس) که (سجل) ناوي کاتبێکی (رسولُ الله) یه، چونکي ئەمه غلطه! له کُتّابي رسالەت پەناه کەس نەبوو، ناوي (سجل) بووبیّ! وکذا به ناوي (ملائکەت) نه بیستراوه! بنا قولي قاموس معناي آیةُ زۆر خۆشه! «جەنابی حەق ئاسمان طَيْ ئەکا به سووك و ئاساني بیّتکلّف و مَشَقّة، وەکي (کاتب) أوراق قەد ئەکا و لەسەر یەکیان دائەنیّ، ولَوْ بعضه حُکماي إلاهیونیش بلّێن: فلك قدیمه، زائل نابیّ، قَبولي خَرْق و الَتِیام ناکا!». حُکماء ئەلّێن: «قووەي جسمانیّه هەر چەند مُتناهیه، أمّا دەوامي حرکەي فلك که حافظي زەمانه، مبنیه لەسەر إمدادي جَوْهَري مُجرّد!». حکیم ئەلّیّ: «جِهة تي فوقي مُطْلق و

تَحْتي مُطلق، مُحدِّدي ئەوێ! سماء قبولي حركە ي مُستقيمە ناكات، كەوابێ قبولّی خَرق و القيام ناكات!».

قسەيان ئەبێ بە أهميّەت تلقي بكرێ، جوابي متيني بدرێتەوە! تسفيە و تَسخيفي عَقلي حكيم، لە مەلاي بە إنصاف ناوەشێتەوە! حُكماي ئێستا ئەڵێن: «جهە تي فَوْقي مُطلَق و تحتي مُطلَق، نيە! هەرچی هەيە هەر مَنْظومەيە فوق و تحتي خۆي هەيە! تحديدي، بە مَركَزي كوكب و مُنْتَهاي قووەي جاذبەيەتي! مُحَدِّدي گەرەك نيە! فَلَكْ بَسيط نيە، شموس و سيّارات و أقمار وەك أرض لە عَناصِري مُخْتَلفە مُركّبن! قووەتيان تەواو ئەبێ، نظم تێك ئەچێ، كُرات ئەبنە هباء، لە ناو أثير گوم ئەبن، إعادەي كُرات ئەبێتەوە؟ نابێتەوە؟ خلافيان هەيە!! مُمكنە لە تَموّجاتي أثير دووبارە ذرّات يەك بگرێتەوە! مُمكنە يَنْبُوعي قووەتي بە درجات، فوقي قووەتي حالي حاضرە، ظهور بكات!» كە مُحدّد نەما و بَساطَتي فلك منعكرا، نَسْجي حُكَماي پێشی تێك ئەچێ ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ﴾ ئەوەي لە عدمەوە بوويێ، لە عدم! ئەوەي مُركّب بوويێ، لە أصولي خۆی إعادە ئەكرێتەوە! ﴿وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ﴾ بێ شك پێی ئەكرێ، باباش نەزانين چۆنی ئەكا! عائدي خوايە! أمّا لازمە بزانين إعادەي مُعدومي صرف قابل نيە! چونكي إعادە لە قضا ئەخوازێ شتێ بمێنێ! ئەوەي لەكەرستەي أوَّلي دروست بكرێتەوە، إعادەيە! ئەوەي لە كَتمي عدم بێ، إعادەنيە، خلقێ سەر بە خۆيە، أوّليّە! ئەوە بديهيە! ديارە بَعْدَ التَّصوّر ئاشكرايە! ئەوەي إثباتي بكا بە دليل يا نفي بكا بە قياس و حُجَّة، بێ هودە خۆي ماندو ئەكا، بديهي قبولي إستدلال ناكا!. (إمامي رازي) هەرچەند سَعي ئەكا بۆ إثباتي إمكاني إعادەي معدومي صرف، إعتراف ئەكا وەكي (مەلا سەعدي تەفتازاني) لە (شَرحي مَقاصِد) نقلي ئەكا، كە إمْتناعي إعادەي معدوم بديهيە!!. ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ﴾ (زەبور)ي (داود)، حوكمداري وإلا تەبار، خليفەي مَعْدَلَة شعار ﴿مِن بَعْدِ الذِّكْرِ﴾ وعْظ و نصيحەت، ناوو (إعتبار)، لە (بيان)ی (أحوال)ی (أُمم)ی (سالفە) ﴿أَنَّ الْأَرْضَ﴾ (وهم) بۆ (أرض)ی

(جنەت) ناچێ، وە (لازم)یش نیە، (قوم)ێ (إستیلا)ی هەموو (أرض) بکات، هەر (قوم)ە مەرز و بوومی خۆی، وە (أراضي) (أقوام) (مُتجاور)ە ﴿يَرِثُهَا﴾ لە (أقوام)ی (غیر)ە (صالح)ە ﴿عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾ شایانی (إدارە)ی (ملك) و (ملّەت)، بە (عدالەت)، ئاگادار، (مُترقِب)، (مُترصِّد)ی. (مُستقبل) (مُحترس) و (مُحترز) (وَلَوْ مُؤمِن)یش نەبێ، چ (عرب) چ (فرس) چ(ڕۆم) چ (تورك) چ (کورد) هەر (قوم)ێ ببێ. دیارە لەم (صلاح)ە چی (مُراد)ە؟ جهانداری بە بەرماڵ و (تسبیح) و مەتتەشا وکەشکۆڵ و (وکاظ) و تەیلەسان ناکرێ. (وکَذَا) بە(همّەت)ی (أولیا)یان و (إنتساب) بۆ (رُسُل) (من حیث النَّسب) نابێتە (مداری) (تسخیر)ی (بلاد) و (إدامە)ی (مُلك) و (حکم)داری ﴿إِنَّ فِي هَذَا﴾ ئەوە ﴿لَبَلَاغًا﴾ (کفایەت)ە (نهایەت)ە ﴿لِّقَوْمٍ عَابِدِينَ﴾ بە نوێژ و ڕۆژوو (إنتساب) و (طریق) و (ختم)ەو (خلوە) هەڵ نەڵەخەتێن، ئاگاداری (مصالح)ی (دنیا) و (آخرەت)بن، بۆ (أهل)ی (مدنیەت)ی (فاجرة) (أوَّلاً) (حال)ی (دنیا) (بعدە) (حال)ی (آخرەت)ی (بیان) فەرموو، بۆ (مدنیەت)ی (فاضلە) (أوّلا) (حال)ی (قیامەت) (ثُمَّ) (حال)ی (دنیا)ی (ذکر)کرد_ سبحان‌الله_ لەو (نظم)ە، لەو (إرشاد) و (هدایەت)ە، (مشهور)ە، بەڵکو (مشهود)ە، (دوڵەت)ی (کُفر) بە (عدالەت) (دوام) ئەکات، (دوڵەت)ی (إیمان) بە (ظلم) (محو) ئەبێتەوە.

(حقّاً) ئەوەی (صاحب)ی ئەو (رسالەت)ە بێ، بەجێیە، شایانە، (جناب)ی (حق) دەر(حەق)ی بە (خطاب) بفەرموێ ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ ئەی (قوم)ی (نجیب)ی (عرب) ئێوە، لە هەموو کەس (أقرب)ترن، خۆتان لەو (ڕەحمەت)ە،(محروم) مەکەن، پە یڕەوی (هدایەت) ی ئەو(ڕەحمەت)ە بکەن، ئەبنە سەر (تاج)ی (أُمم). (رسالەت)ی (ڕەحمەت)ە بۆ (أنام) گەرچی گەلێ کەس خۆیان (محروم)کرد، لەو (ڕەحمەت)ە ! (حقّاً) (ڕەحمەت)ە بۆ (رسول)آن، (عُلوّ)ی (مقام)ی ئاشکرا فەرموون، لە ئالایشی (یهودی) (تنزیە)ی کردن، (ڕەحمەت)ە بۆ (رسالەت) (جلو)ە و (شعشعە)و (جلال)و (هیبەت)ی دا بە (رسالەت) (ڕەحمەت)ە بۆ (ملك) (درجات)یان،

(عصمت)يان (معلوم) بوو (ڕەحمەت)ە بۆ (شيطان)، (مقدار)ی (قوەّ)يی (كمٌ) و (كيف) و (وسوسە)ی دەرخست، لەگەڵیّ (تُهمات)ی (نجات)دا (ڕەحمەت)ە بۆ ژنان، لە (دركە)يی (ڕزالەت) و (ذلّەت)ی هينانە دەر، ڕیّ ی (هدايەت) و (ضلال)ی بۆ (أنام) بە (واضح)ی كردەوە، هەر كەس (حقّ)ی خۆی دايە، (عظمەت) و (قدرەت) و جاهو (جلال) و (تنزّه) و (تقدّس) بلّندی (مقام)ی (أُلوهيّەت)، وە (حقيقەت)ی (وحدانيەت)ی (كبريائی) (مُكمّل) دەرخست، جناب)ی (رسولي أكرم) (حق)ی لەسەر (عالم) هەيە، گەر بمويّرابا ئەم ووت: " (حق)ی لەسەر خواش هەيە ! " ئيتر نازانم چ بلّيّم؟ (بشر) (غدّار)ە_ (خصوص ئاورووپايي)_ (مَعَ أنَّهُ) لە (عُظما)ی (دين) و (دنيا) كەس نايەتە تەرازووی (خاتم‌الرُسل) ﴿قُـلْ إِنَّمَا يُوحَى إِلَـيَّ أَنَّمَـا إِلَٰهُكُـمْ إِلَـهٌ وَاحِـدٌ﴾ دوو (حصر)ی تيايە، يەكی لە (إنّما)_ بە(كسر)ی (ألف)_ يەكی لە (أنّما) بە (فتح)ی_ (وحدانيەت) (خاصّ)ی خودايە، (تعدُّد)نيە، (لا أصالةً) و (لا وَ كالةً)، (تفويض)ی (خلق) و (تربيە) بۆ كەسيّ‌تر؟ (ألعياذُ بالله) (خصوص) (عيسی) و (أمثال)ی (ضعيف) و بیّ دەسەلاّت!

(أمّا) وەك (عرض)كرا، (بشر) بیّ (إنصاف)ە، (حتّی) ئەگەر تەماشای (أساطير)ی (أوّلين)كەی (عادةً) (إلە) (موضوع)ی (حكايات)ی (حُروب) و (أُضحوكە) و (مسخر)ن ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ (مُنقاد)ن، (تسليم)ن، (قبول)ی ئەكەن؟ ﴿فَإِن تَوَلَّوْا﴾ لە (إنقياد)، وە (إلتفات)يان نەكرد، بۆ (توحيد) ﴿فَقُلْ آذَنتُكُمْ﴾ (إعلام)م كردن ﴿عَلَى سَوَاءٍ﴾ بیّ (تفرق)ە لە (بين)ی (خواص) و (عوام)، وەكی (كُهن)ەی (أُمم)ی (خالية)، دايان ناوە (إعتقاد)ی (وحدانيە)ت بۆ (أهل)ی (علم) و (عرفان)و (زكی)، بۆ (عدا)يش (تمثيل) و بت پەرستی! ﴿وَإِنْ أَدْرِي﴾ نازانم، ﴿أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٌ﴾ نيّزيّكە، دوورە؟ ﴿مَّا تُوعَدُونَ﴾ (أمّا) ئەبیّ (مُحقّق)، چ(غلبە)ی (إسلام)ە، چ (عذاب)ی (حشر)ە ﴿إِنَّهُ﴾ (سبحانهُ) ﴿يَعْلَمُ الْجَهْرَ مِنَ الْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ﴾ لە (أحقاد) و (إعتقاد) چی لیّ

بزربابێ (مجازات) بێ(شك)ە ﴿وَإِنْ أَدْرِي﴾ نازانم ﴿لَعَلَّهُ﴾ (تأخیر)ی ﴿فِتْنَةٌ لَكُمْ﴾ (إستدراج) یا (إمتحان) ﴿وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ﴾ کە (وقت)ی هات، دێ، (تعیین)ی (عائد)ی خوایە. (جناب)ی (رسالەت) ئەیزانی (وعد)ی خوای دێتە جێ، (حق)ە، (أمّا) ئارەزووی بوو، زۆر (تأخیر) نەبێ، بۆیە (دُعا)ی ئەکرد ﴿قَالَ رَبِّ احْكُم بِالْحَقِّ﴾ بە (عدل)، لەبەر (ظلم) و (طغیان) (منع)ی (خلق)ی لە (إهتدی) (عدالەت) لە (قضا)ی ئەخواست، (تعجیل)ی (عذاب)یان بکرێ، ئەو (عقبە) لەڕێ ی (نشر)ی (دین) لابدرێ ﴿وَرَبُّنَا الرَّحْمَنُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ﴾ (وعد)ەی دێتەجێ، ئێوە (ذلیل) ئەبن (رایەت)ی (نصر) و (عزّ)ی (إسلام)_ علیالدّوام_ بەرز ئەبێ.

(تفسیر)ی (سورە)ی (أنبیاء) تەواو بوو، (أمّا) زۆر (تأخیر) بوو، لە (أواخر)ی (جمادی أوّل) تا (أواسط)ی (شوّال) چمان نەنووسی، (مُدّە)یە (چنارۆك)، دووایە لەبەر غەم و ناساغی، بێ (إدارە)ی و گوزەران، وە (أشخاص)ی (حکومەت) (أحمد دیوّنی) معاون (شمعون) بە جاری (حکومەت)یان سارد و سڕکرد، دوو سێ ساڵە (أحمد بگ)ی (توفیق بگ) (متصرف)ی لیوای هەولێرە، بە جارێ لیوا زێر و زەبەر بوو، ئیتر خوا (ڕەحم)کا (رَبِّ احْكُمْ بِالْحَقِّ) (آمین) ڕۆژی چوارشەموو (أوّل)ی (کانونی ثانی) رومی (٢١) شوّال (١٢٥٧) هجری (١٩٢٨)ی میلادی.

## سورەی حەج

یەکێ ئەڵێ (مکیّە)، یەکێ ئەڵێ (مدینـە)، یـەکـێ ئـەڵـێ (مُختلطـە). قـسمي أعظمي (مدنیە)! سیێ یا چوار ئایەتي (مکّیە)! عددي آیاتي (٩٨) لـە (کوفي)، (٩٧) لـە (مکّـي)، (٩٥) لـە (بـصري)، (٩٤) لـە (شـامي)!. چـابوو ممـالکي إسلامیّەت ئەو وەقتي زۆر واسع نەبوو! وە إلاّ عَدَدي إخْتلاف تزایُـدي دەکـرد! أمّا نازانم باسي (مدني) و (مِصْري)نیە! ئـەوان لـە تقـسیماتي آیـات إشـتراکیان نەکردبێ. (زُمَخْشَري) ئەفەرموێ پاش سـورەي (نُـور) نـازل بـووە. سُـبحان الله لەگەلێ جێ فەرمایشێ هکذایي ئەفەرموي، أما گـوێ ناداتـە سـبب و مُناسـبةي نقلي لە مَوْقعي أصْلي. فيالحقیقة وەکي (سـیّدي آلوسـي) ئـەفـەرمـوێ مُناسـبی لەگەڵ ما قبلی ظاهِرە! دوو سجدەی تیایە لای شافعیان یەك، لای حنفیان یەك لەسەر روایە ناکەوێ خصوص لە (إبن عباسی) هەرچی هەیە.

﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ﴾ بە إمْهالي مَغرور مەبن! بـە عقابـە، بـە عَذابـە! إیمان بێنن بە ڕۆژي جزاء فَزَعي أکْبر طامّەي کُبری ڕۆژي لەرزین چەق و چۆق و دڵەکوتکە ﴿إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ﴾ زلزلـەي ڕۆژي واپـەسـین، ئـي عـەردي، ئـي بَـشَر ﴿شَيْءٌ عَظِيمٌ﴾ شتێ گەورەیە. (حَسَنْ) ئەفەرموێ زلزلەي پێشی قیامـة مُـرادە کە لە أشراطي سـاعتە. لام وایـە لـەبـەر ﴿يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ﴾ واي مُناسـب دیتیـە چـونکـي شـیردان و بـەرداري لـە ڕۆژي قیامـەت دانیە! ئەواني دي ئەیکەنە تمثیل، یَعْني ئـەگـەر بـوو بـا، وا ئـەبوو! واقعاً لـە

کوردیشی‌دا ئەڵێن: (بەردار بەری دەهاویشت، با بەرداریشی بالفعل نەبێ!).
(إمام) لە (قفّال) نقل ئەکا شیردەر بە شیردەری، حاملە بە حاملەی زیندوو ئەبێتەوە، مَقْصَد بکرێ بە حَقیقَة و بِالْفِعل! ﴿وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا﴾ فيالحقیقة ئەو دوو جُملەیە لە حقیقة نێزیکترە. ئێمە لەو ساڵەی ١٩٢٢ زایینی زَلْزَلە و شِدَّتی بومبەردومانمان دیت فيالواقع ئافرەتی شیردەر منداڵ بە باوەشەوە قصدی ئەکرد منداڵەکەی فرێداتە پەنای شاخێ نەوەك طَیّارەچی گوێی لە گریان بێ بە دوویان بکەوێ. بەڵێ ئەم جهل و ذُهولە کەوتە دڵی پیاوێ زۆر گەورە لە ئەشکەوتی خۆی إشارەی ئەکرد بۆرەفیقانی خۆی، قسە مەکەن! نەك طَیّارەچی گوێی لێبێ!. وەگەلێ ژنی بەردار بەریان فرێدا. ئەمە باوابێ.

بابم فەرمووی: «لە بەغدا بووم ساڵی ١٢٩٢ هجری جمعێ لە أشْراف إسرافیان کردبوو لای (والی) دەبارەی (سیّد سلمان نقیب الأشراف) زۆر دوا بوون، چەند مەصرەفی کردیە لە ژنێ هێناویەتی بە هەزار لیرە دوو جاریەی کریە، ماڵی أوقاف (أستانە)ی نەهێشت، لە هەوای نفسی خۆی‌خرج ئەکات. بالمُقابل والی ساعەتێ قیمەتدار هَدیَّةً ئەنێرێ بۆ (نقیب)، کاغەزەکی بۆ ئەنووسێ گلەیی ئەکا بۆ إشتراکی حَفْلەی (عِرسی) دەعوەتی نەکردیە؟ ئەوانی شکایەتیان کردبوو، زۆر پێی‌تێك چوو بوون. لەو هەنگامە ڕۆژێ لە خزمەت (مُفتی زە هاوی) چوونە خزمەت (نقیب) ئەو ماجرایە باسی لێکرا بیانی تأثُر و إنفعالی بەدخواهانی سیّدیان کرد، (مُفتی) بَدَاهَةً فەرمووی: (مِن ساعَةٍ أُعطيتَها زَلْزَلوا - زلزلة الساعةِ شیءٌ عَظيم-).

خطابی جمع بۆ ئەو جماعتەیە کە ندایان کراوەتێ، زَلْزَلەی ساعَةْ ئی خۆیان ئي أرضی ئەبینن، لێیان عیان ئەبێ. خطابی أفْرادی ﴿وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى﴾ ئەیانبینی بەسەرخۆش، وا ئەزانی کە مەستی شرابن ﴿وَمَا هُم بِسُكَارَى﴾ (حقیقةً) مەستی مدام نین! بنا لە تَفسیری (إبنُ جریر) بۆ حضرەتی رسالەت پەناهە، زۆر لطیفە! (ثُمَّ رَأيْتُ (النیسابوری) يقولُ: " أفْرَدَ بَعْدَ أنْ جَمَعَ، لِأنَّ

الزَّلْزَلَةَ یَراها النَّاسُ جَمیعاً وَ أَمّا السُّكْرُ الشّاملُ للنّاسِ فَإِنَّهُ یَراهُ مَنْ لَهُ أَهْلیَّةُ الخِطابِ بِالرُّؤْیَةِ وَتَتَنَدْ. وَلَعَلَّهُ لَیْسَ إِلاّ النَّبِیُّ (ﷺ)".

هەزار ئافەرین لە (نەیسابوری) ئەوانەی (مقصود)ی (بالخطاب)ن لە (أهل)ی (عناد) و (شقاق)، (إیمان) نایەنن، تا لە و (سکر)ە (محفوظ)بن، ئاگایان لە (حال)ی خەڵکی هەبێ تەماشایانکەن، مەست و (مدهوش) و (لایعقل) (شاخِصةُ الأبْصار)ن، کەوابی ڕام لە (جواب)ی (زمخشری)نیە، (وَلَوْ) لە من گەورەترەکان بەڵێ ی (راضی)بن.

ئەڵێن:" (أبونواس) ڕۆژێ تەماشای سەر خۆشێ ئەکات، لە (حرکات) و (نکات) و (إشارات) و (هزیان)ی پێ‌ئەکەنێ، (تعجُّب) ئەکا، ئەیلێنێ: " تۆ چۆن (تعجّب) ئەکەی؟ بەسەر خۆش پێ‌ئەکەنی!" ئەڵێ: " تا (حال) من سەرخۆشم نەدیتە" ئەڵێن: "کوو؟" ئەڵێ: " کە لەگەڵ یاران بادەگوساری ئەکەم، لە پێش هەموان مەست ئەبم، ئاگام لە خۆم نامێنێ، دوای هەموان بە ئاگا دێمەوە!" بەڵێ ئەوانە مەستی (شەراب)ین، مەست و (مدهوش)ی (عذاب)ن ﴿وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ﴾ ئەو (زلزلە) بە چ ئەبێ؟ (أسباب)ی (زلزلە) ئێستا (معلوم)ە چ گفت وگۆ نیە، (لکن) (زلزلە)ی (قیامەت) شتێ ترە، بەڕاستی خوا ئەزانێ چۆنی ئەکات وە بەچی ئەیکات؟ ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ﴾ (طبیعیّون) لە (أصل)ی (وجود)ی، (حکما)ی (إلهیوّن) لە (علم) بە (جُزئیّات)، (جهلە)ی (جاهلی) لە (علم) و (قدرەت)ی، (کرّامیە) و (أمثال) یان لە (حشر)ی (أجساد)، بە (شُبهات)ی (واهیە)، (کافر)ێ (مسلمان)ی بخوا، (نما)ی پێ بکات، ئەگەر (حشر)ی (أجساد) بێ، چۆن ئەبێ؟ (جسد)ی (مسلمان) ئەچێتە (جهنّم)، یائی(کافر) ئەچێتە بەهەشت، هیچ لای نابێ، کەوابێ (حشر)نیە. بەڵێ ئەو (نوع)ە (شُبهە)یە ئەبێتە (رد) لە (عینیّە)بێ (تأویل)، (أمّا) (سهل)ە، وەکی مەلایان ئەفەرموون:(زید) (مثلا) لە منداڵی تا مردنی هەزار (تغییّرات)ی دێتە سەر، (معَ أنّە) (زید) هەر (زید)ە، (عینیّەت)ی (أساسی) ناگۆڕە (نافەوتێ) (بەهای) (إیرانی)_ معَ إدّعاءِ الرِّسالةِ_ (إنکار)ی (حشر)ی (أجساد)

ئەکات (حتّی) (ناصر)ە، بۆ (مذهب)ی (داروین)، نازانم (معنا)ی (رسالەت)ی چیە؟ ئەو (جداله)یان ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ ئی (جُهلا)ی (عرب) (لاشك) قسەیان لە (علم)ە وەنیە، (طبیعیّون) و (حُکما)ی (إلهی) گەرچی قسەیان لە (علم)ەوەیە، (لکن) بێ (شائبه)ی (جهل)نیە، (أوّلا) (إتقان)ی (صُنع) بێ (علم) نابێ، (بداهەت)ی (عقل) (شاهد)ە، بێ (قیاس)ی (غائب) لەسەر (شاهد)ی. (ثانیا) (علم) بە (جُزئیات) (إلاّ) بە (طریق)ی (حواس) ئەبی، بێ (حس) (علی الإطلاق) (ممکن)نیە، (قول)ێ بێ (دلیل)ە، بەس تەماشای (حال)بێ (حیوانات) ئەکەن. ئەو (جزم)ە، بە (إمتناع)ی (مُطلق) بێ (جهل) نیە، ئەوانەی بەس لە (جهل)ە وە(جدال) ئەکەن بێ (قیمەت)ن، بێ (مبادیء) و (مسلك)ن، (حسب الهواء) (تقلید)ی ئەم و ئەو ئەکەن ﴿وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَانٍ﴾ لە خۆیان ﴿مَّرِيدٍ﴾ لووس و لۆس بووی لە (خباسەت) و (فساد) ڕووت لە هەموو (خێر)، ڕوو لە (إنسان)ی (مُصلح) ناکات ﴿كُتِبَ عَلَيْهِ﴾ لەسەر (شیطان)ی (متبوع) (أمر)ێکە (لازم) ﴿أَنَّهُ﴾ (شأن) وایە ﴿مَن تَوَلَّاهُ﴾ دۆستی لەگەڵ بکری بکات، (تابع)ی بێ، ﴿فَأَنَّهُ﴾ ئەو (شیطان)ە ﴿يُضِلُّهُ﴾ گومڕاهی ئەکا ﴿وَيَهْدِيهِ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ﴾ (سوق)ی ئەکا، بۆ (جهنّم)، (حقا) (سواد)ی (أعظم) لە (منکرین)ی (حشر)ی (أجساد) لە هیچ گوتاهی ناسڵەونەوە، وەبە (کمال)ی (لذّەت)، بێ (ألم)ی (وجدانی) (إرتکاب)ی ئەکەن، (حتّی) (بحاشان)ی (علم)ی گەلەکیان، بێ (میل)ی (سُوء)یەن ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ﴾ ئەوانەي غَیرە مُتّقي، مُجادل﴿إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ﴾ شكّ و تردید. ﴿مِّنَ الْبَعْثِ﴾ زیندوو بوونەوە بۆ حساب و جَزاء، أنّە بۆیە مُبالات ناکەن، چونکي لاتان وایە نابێ مُمکن نیە! پاش ئەمەي ئەم بەدەنە ڕزي، چۆن زیندو وئەبێتەوە؟ هەر چەند ئێوە إشتباهتان هەیە وە ئەیکەنە موجبي ریبْ لە قُرآن و رسول، أمّا حَقیقَةً جێی ریب نیە! ﴿فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم﴾ چ بە إعْتِباري مَبْدَءْ، چ نَظَر بە حالي حاضره، ڕاستە کە حضرەتی کبریائي ئێوەي خلق کردیە ﴿مِّن تُرَابٍ﴾ مَوادي عُنصُریّە کە لە أرض و مُحیطي دایە أوکسیجین و، هایدرۆجین و، نایترۆجین، پۆتاس و، لکس و سائري مَوادي دي کە إنساني

لىٚ خلق ئەكرىٚ، أساساً تُرابن، تۆزن، نوعە خۆلەكن، مع أنّهُ لازم نيە كە بدنئي خلق لە خۆلْ بىٚ، چيترى تيا نەبىٚ! بە مُناسبەي بُعد لە حيات، لێرە تُراب ئەفەرموىٚ! لە جێىٚ تر ئاو ئەفەرموىٚ!. ئەو موادە أوّلاً لە صُلبي نێرگرد ئەبێتەوە، ذەراتي حَيوي تيا پەيا ئەبىٚ! بۆيە ئەفەرموىٚ: ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ﴾ ئەو ذەرەي حيويّە لە ناو ئەوسيّالە ئەچێتە ڕەحم، سەر بەو لوولەي لێك بوەوە ئەنىٚ، موادە كە سوور هەڵئەگەڕىٚ، ئەبێتە خوون! ﴿ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ﴾ زياد ئەكا﴿ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ﴾ ئەبێتە پارچە گۆشت ئەو پارە گوشتە﴿مُّخَلَّقَةٍ﴾ تامُّ المادّة ﴿وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ﴾ ناقص ئەوي تامّ، وڵدي تامّي لىٚ پەيدا ئەبىٚ، ئەوي ناقص، ناقص! بۆيە ئەبينن إنسان بە صُوەري مُخْتَلفە خلق ئەكرىٚ. ﴿لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ﴾ بە عقْل و عمَل، كەسىٚ كەمىٚ هوشيار بىٚ بنوارێتە بَيني نَوعي خۆي ئەزانىٚ صانعي ئەو وصُنع و مَصنُعە، فارق لە بەيني كامل و ناقص لەو ظُلماتە، غَيْري عُنْصُر لە عُنْصُر بەو تێكەڵاويە، صانعێكە غايت عالم، بە عِلمي عَمَلي قادر و مُريد! بنۆڕە قوّاي مُدركەي عقلْ، لەگەڵ ئەو موادّە، چەند دوورن! كىٚ ئەتوانىٚ بڵىٚ ئەو نوعە صُنعە طَبيعَةٌ، طَبيعەتىٚ بىٚ إدراك ئەيكا؟! حاشا لە عقلْ و مَنْطِق دوورە! بەڵىٚ ديارە مُداخلەي طبيعەتيتيا هەيە، أمّا بەتسخيري علم وقُدرەت! تەماشاي علمي(تشريحُ الأبدان=فسيولوجي) بكە، حيرەت ئەتگرىٚ! حقّاً بە غَيْري عَليمي قدير بە كەسيتر ناكرىٚ! بە كَمالي تأسُّف بنۆڕە أثري عُلماي طَبيعة و كيميا و ميكانيكي، لە خَلقي بَشَري، چ أسراريان دەر خستيە؟!! علماً وَ عَمَلاً بۆ إنسان لە غايَتي فائدەدايە!. عُلَماي ئێمەش وەكي مُشركەكان ئەو خَلْقە ئەدەنە (مَلَكْ)، حاشا كاري مَلَكْ نيە! مَلَكْ دوێنىٚ بەسەر شۆڕي جهل سجدەي بۆ (آدەم) برد، ئەمڕۆ ئێمە خلق ئەكا؟ أساساً ئەو قسە لە (طَهْماروس)منقولە، ئەگەر لە عبارەتي نبوى واردبوو بىٚ، مُراد قووەتە بۆ ئەوعملەي طَبيعي كەقادر وقاهري مُطْلَق لەكارخانەي صُلب ورەحم دايمەزراندية، وە لەو ميانەدا تَشكلاتي مُخْتَلِفتي بەسەردا دێت، ئومێد ئەكەم لە

طبع دا إرائة بکرێت! (غزالی) حقًا هَظمي طعام ئەداتە (مَلَكْ)– لاحَوْلَ وَ لاقـوَّة الَّـا بالله–.

﴿وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاء إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ مُدّەي حمل، أقلّـي، أكْثـري، أقلّي شەش مـانگ و دوو لحظـەیە! .سُبحان الله (إبنُ الحجر) لەسـەر ئـەم دوو لحظة زۆر ئەدوێ! . أكْثَري لاي (حَنَفي) دوو سالە، لاي (شافعي) چوار، لام وایە آراي تریش هەن ئەوانەش أقلّن! أكْثَري مُعتـاد نـۆ مانگـە ﴿ثُـمَّ نُخْـرِجُكُمْ﴾ بـەو أصولي طَبيعي کە عُلماي تَوْليد بيـاني ئـەكـەن، لـە رەحـم ئـەتـان هێنینـە دەر ﴿طِفْلًا﴾ حاجەت نیيە ملائيكەت «مندالّدانی» لـە دەرکـەی لێـك کێشتەوە تـا منداڵەکە بێتە دەر، بەشەر ألان؟ ئالەتی وەهـای پـەیدا کردیيە، لـە وەخـتی عُسر و شدەّتُ و تەنگانی دە توانیٚ منداڵ و داکی قورتار بکات، مەگەر حەجمی وەلەد بالکل نامُساعد بێت، دکتور ریاض حلبی ووتی: أستاذێکمان هـەبـوو زۆر مُشفق بوو لە فەنی تەولید زۆر ماهر بوو، عادەتی بـوو پـاش دەرس لـە بـەعزیٚ مسائل دەدوا، هەم عیلم هەم حیکایەت، رۆژیٚ ووتی شەخسیٚ هات بە تەهلوکـە دەعوەتی کردم بۆ چارەی ئافرەتیٚ کەوتبـووە حـاڵیٚ نـاخۆش لـەوەخـتی زان، چووم موعایەنەم کرد! . ووتم قابل نیيە، ئـەم منداڵـە نایـەتـەدەر، زێـرا قطـری سەری لەگەڵ دائرەی مَخْرَجْ نسبەتی نهایە، زۆر گـەورەتـرە، ئـەو کەللەیـە بـەو دەرکـەدا بـە سـەلامـەتـی مُمکنی خروجی نـیيـە، و حسب القـانون ألان نـابیٚ دەستی لیٚدەم، لە مودّی ساعەتی دەمریٚ ئەمجا خەبرم بدەوە دێم، بـە ئالـەت دەری دەهێنم، چوومەوە لە مدّی معهود لە دوام نـەهـاتن، دڵـم کـەوتـە خـرت و پرت سەبەبی چیيە مراجعەیان نەکردەوە، نەختێکی پـیٚ چـوو ذاتـەکـە هـات. حق القدم لیرەکی بۆ هێنام، ووتی ئافرەتەکە بە سەلامـەتـی وەضـعی حـەملـی کرد، دەهشەت گرتمی مستەکم لە نێوچاوانی خۆم دا، ووتم! . ئەگـەر وابـیٚ مـن دکتور نیم، کابرا رۆیی، کە مەکـی پـیٚ چـوو بـە جـەزع و فَـزَع هاتـەوە دەخیـل وەرە عیلاجمان بکە، ووتم: تۆ فـەرمـووت بـە سـەلامـەتـی قورتـار بـوو، ئێستا ئەڵیٚی چی؟ ووتی: وەختی مُناقەشە نیيە، بـە نـاوی إنسانیەت موافقـەم کـرد

چووم. دکتۆرێ تر لە زگی بوو، ژنەکە فریادی دەچوو بۆ ئاسمان، کابرا چارەی پێ نەدەکرا، ئالەتەکانی بێ عەمل و کۆن، توومەز کەمن دەڕۆم ئەو دکتور دێنن، هەم بەسەلامەتی داك و منداڵ، هەم بە قیمەتی لە أجری من کەمتر عملیاتی تولید بکات، تَرَحُّم بە ژنەکە کرد، منداڵەکەمان بە مردی هێنادەر». ئایاتی قورئانی بۆ ئەو نوعە علومە مفتاحە، ئوممەت دەبا بۆ توسیع تعقیبی وەقائع بکەن، أسرار دەرخەن، بیکەنە دەستور و عەمەل، بۆ نەفعی بەشر تحریری کەن، بیکەنە تەفسیری قورئان، کەسێ ئارەزووی زێدە عیلمی هەیە، مطالعەی قانونی زواجی تأریخی طبیعی إنسان بکات، حقیقةً طنطاویش قصوری نەفەرمووە، تەفسیری طنطاوی بۆ إفادەی ئەو نوعە مطالبیة زۆر باشە. ﴿ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ﴾ خۆتان دەبینین چ أسبابەکی بۆ إحضار کردیینە، داك و باب، کیفیەتی بە خێو کردنی منداڵ، مەشهود تانە، بلوغی قوەت لە هەژدە تا سنی٢٠ ساڵ دەبێ، بلوغی قووەت إحتیاجی بە إعمال بەشەر هەیە، بۆیە شێوەی کوڕی، حقاً قورئان کتێبێ بدیعە. لە ترکیبی ئەم ئایەتە مُفَسِّرِینْ مُضْطَرِبِنْ، ئێمە إشارەمان بۆ تقدیری مُتَعَلَق لامکرد، هەوەست لێیە مُراجعەی تەفاسیر بکە (وأخترْ لنفسكَ مايَحْلو).

﴿وَمِنْكُمْ مَنْ يُتَوَفَّى﴾ (قبل البلوغ) ئەمرێ ﴿وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ﴾ (كَأَنَّهُ) بۆ منداڵی ئەگێڕدرێتەوە (أرْذَلْ) بە (أَرْدَأُ) و (أَدْنی) (تفسیر) ئەکەن ﴿لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ﴾ کەم، یا زۆر، بە (أشخاص) ئەگۆڕێ ﴿شَيْئًا﴾ هیچ؛ وەك (بَدْأ)ی منداڵی، وەك (حیوان)ی گێژو وێژ دیارە (إنسان) کە ئەبێ، زۆر (دُون)ە بێ (إدراك)ە لە (فرخ)ەی (حیوانات) کەمترە، لە هۆش و (قوەت) (إرادە)؛ دوایی یە (ترقّی) ئەکات؛ لە (بَدیهیّات) بۆ (نَظریّات) ئەچی. ئەگەر (مُربّی) هەبی، وە لە (نفس)ی خۆی (مَیل)ێ (قوی)و باشی تیا هەبی وە بێوو (مواهِب)و (مکاسِب) (توافق) بکا، ئەبێتە مەردێ، نایاب، (نابغ) (عَبقری). وە دیارە (إنسان) (جَوهر)ی (مُجرَّد) نیە، وە (إلّا) بێ (إدراك)ی نەدەهاتە سەر، وە بە (إختلال)ی (قُوای) (مادّیە) (خَلَلْ) بە (إدراك)ی نەدەگەیشت؛ کەوابێ لەو

بێ (علمی)یە، (فائدە)یەکی (علمیە)ی تیایە، بۆ ئێمە. (حقیقةً) لە (ئایات)ی (قورانی) دەرئەکەوێ، کە (روح) شتێکە (داخل)ی (بَدَن)؛ لام وایە بە (وجدانی)ش، وادەر ئەکەوێ (وَاللهُ أعْلَم).

تێ (فکر)ن، (أرباب)ی (عَقل)؛ (عقل)و (سائِری) (قُوا)ی (مُدرِکە) — (ظاهِر)ەو(باطن)ە— چ (ربط)ی لەگەلێ، ئەو (موادّ)ی (عُنصریە)و دەماغ و (نسج)و (ترکیب)ە هەیە؟ دیارە (مُدبِّر)ێ (فوق الطبیعی) ئەوێ، (رَبط)ی بخاتە (بَین)ی (قواو) (مَواد)؛ (ترکیب)ی (هیکل)ی کە تێك چوو، (أصل)ی (عناصِر) ئەمێنی، دووبارە گرد کردنەوەی لەسەر (أستاذ)ی (أعظم)و (أعلم)و (أقدس)و (أجلّ)و (أکمل)ی کیمیایی ومیکانیکی گران نیە. ئەگەر توو ناتوانی (تصوّر)ی بکەی، ئەو ئەتوانێ (تصوین)ی بکات.

(بعض)ێ زوو ئەمرێ، (بعض)ی درەنگ، (عُلما)ی (طبیعەت) تیای (حەیران)ن؛ (أسباب) و (عوامل)یان بۆ (تحلیل)و (ضبط) ناکرێ، (حقیقةً) (مُشکِل)ە! (عاقبەت) هەر ئەبێ (نسبەت) بدرێ بۆ خوا؛ (أمّا) (دقّەت)و تەوتیشیش (تفتیش) باشە. ئەگەر بە (مَقصد)یش ناگا، بێ (فائد)ە ناچێ ﴿وَتَرَى﴾ ئەی (رائی) یائەی (جاحِد)ی (مُنکِر) ﴿الأَرْضَ﴾ کە (مبدأ)ی (وجود) تە، (دائِم) لەبەر چاوتە، وەك (أحوالات)ی (تطوریە)ی (إنسانی) خۆت (خَفی) نیە، ئەوا ئەیبینی ﴿هَامِدَةً﴾ هیشکە، (حال)ی لێت (عَیان)ە ﴿فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا﴾ (أرض)ی (دێم)ەکار، بێ ئاوو (رطوبەت) ﴿الْمَاءَ﴾ باران ﴿اهْتَزَّتْ﴾ (حرکە) ئەکات ﴿وَرَبَتْ﴾ (زیاد) ئەبێ. ﴿وَأَنبَتَتْ﴾ شینی ئەکا، ئەی ڕوێنی ﴿مِنْ كُلِّ زَوْجٍ﴾ (صنف) یا نێرو مێ ﴿بَهِيجٍ﴾ جوان؛ (ناظِر) بە دیتنی شادو گوشاد ئەبێ ﴿ذَلِكَ﴾ ئەوە ﴿بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ﴾ (حَقّ الإنصاف) ئەو (صُنْع)ە، لە (عَلاّمُ الغُیُوب) )حَکیم)و (قَدیر)ی (مُطلق) نەبێ، نابێ. کاری (طبیعەت) نیە، وە(غَیر)ی (طبیعەت) چیتر نیە؛ ئێمە تەماشای کەین، ئە(صُلْح)ێ، بۆ ئەو (خَلق)ە یان نا؟ کە ئەو نە(صُلْح)ێ، (غَیر)ی خوا کەسی تر نیە ﴿وَأَنَّهُ يُحْيِ

الْمَوْتَى﴾ ئەوا بۆتان (معلوم) بوو، ئەو (عناصر)ی (مَیّت)ە، چۆن (حیات)ی پێ ئەدرێ! ﴿وَأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ﴾ كه (دائِر) بـه (خلـق)و (إیجاد)و لـه (شـؤون)ی (ألوهیـەت) بـێ ﴿قَـدِيرٌ﴾ (قـدرەت)ی (تـام) ئـەوەی لـه (دقـائق)ی (خلـق)و (إیجاد)ی (بَشر) بـ(فكر)ێ لـه ناوەنـدی دڵـی ئـەڵێ: (صـانع)ی ئـەو (صُـنع)ە؛ (قدرەت)ی (واسع)ە؛ لەسەر هەموو شت (إقتدار)ی هەیە ﴿وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَـةٌ لَاْ رَيْبَ فِيهَا﴾ خۆتان له (زلزله)ی بپارێزن، به (أوهام)ی (باطل)ە، خۆتان تـووش مەكـەن. (مـلا حـسین) (قـەرەناوی) –رەحمـەتی لێ بـێ– مەلایه بـاش بـوو، (مُجازی) بابم بوو، هاته زیارەتی (أستاد)ی، له (وەقت)ی (عَودەت) (نورالدین) (سـعات)ەكـەی تێـك چـوو بـوو، داێ بینێرێتـه (كركوك) بـۆی چاك كرێتـەوە؛ چـەندی پـێ چـوو، (تـأخیر) بـوو، (سـعات)ەكـە، نەهاتـەوە. (نورالـدین) بـۆی نووسی (إنَّ السَاعَةَ آتِيَةٌ لا رَيْبَ فيها) (لطیف) (واقعاً) به چاك كراوەیی، هاتەوە ﴿وَأَنَّ اللَّـهَ يَبْعَـثُ مَـنْ فِـي الْقُبُـورِ﴾ (یعنـی) (أجـساد) ـ (في الحقيقـة) ئەگـەر (حَشر)ی (أجساد) نەبێ، (خلق)ی ئێستا (عَبَث)ە لـەو خوایه لـەو (صـانع)ە ناوەشێتەوە؛ لام وایه (إنسان) بـه (روح) و (جـسد) (بعث)ئـەكرێت. (حَـشر)ی (أرواح)ی (مُجَـرَّد)ە لام (خیـاڵ)ە؛ وە(غـیر)ی (جنـابی) (كبریـائی) (هیـچتر) (مُجَرَّد) نیه. بـێ (تَحیّـن)و (وَضـع)و (نـسبەت)و (شَـكل)؛ (وُجـود)ی بـه (وَهـم) (تَصوُّر) ناكرێ، (فَضل) له (تَعَقُّل).

(تقـدّس) لـه (جهـەت)و (مكـان) وەكـی (طووسـی) ئـەڵێ: "لـه (خَـواصّ)ی (واجـب الوُجـود)ە" (یَعنـی) (لازم)ی (وجـوب)ی (وُجـود)ە (والله أعْلَمُ) ﴿وَمِـنْ النَّاسِ﴾ ئەواني پێشی مُقَلّدوأتْباع بوون، ئەوانه شَیاطین و رۆسایەكانن ﴿مَـنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ﴾ زاتی، (صِفاتي) ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ وەك أتْباعـەكانیـان ﴿وَلاَ هُـدًى﴾ زاتاً خۆی به رأیسی ئەزانێ، هدایەتی كەس قَبول ناكا. ﴿وَلاَ كِتَابٍ مُـنِيرٍ﴾ زاتـاً مُنْكِری وَحْی وكتابه ﴿ثَانِيَ عِطْفِـهِ﴾ بـه تَكَبُّـرو كـەپوو بڵنـدی، قبـوڵی هدایـەت وكِتابْ ناكات. مَقْصَدي لەو مُجادلەی (جَوْفاء) ﴿لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّـهِ﴾ وەكـي

باطنیەکان، شُبَهاتي واهيَە، ئەهاوێنە ذهْنی ضُعَفاء وکَمْ عَقْلان. بەڵکو أوّلاً سَعي ئەکەن عَقْليان لێ بستێنن، وەك مُبَشّرەکاني مَسيحی. ﴿لَهُ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ﴾ ذِلٌ وهَوان بۆ مَنسوبي دەوڵەتەکی وەکی (بَريطانيا)ي، حتّا لەبەر ذِلّ وهَواني نَفسي باطنیّە و ئەوانيش، ناوێرن بچنە جێگای عقل و ملاي چاکی تيا بێ! ئەزانن بە مُجادلەي بە حق ئابڕوويان ئەچێ بۆر ئەدرێن ﴿وَنُذِيقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَذَابَ الْحَرِيقِ﴾ يارَبّي لە دونياش ئەو نَوعە عَذابەيان پێ بچێژی!!! تاکو خَلق لە خَباثەتيان قورتارين! ئەوانەي زۆر دلّ گەرمن مَحزونن بۆ بَشَرْ حەز ئەکەن نَجاتيان بدەن لە عَذابي دنياو وآخِرەت وەقيوداتي ديني کەلايان مُنافي حُرّيَتە وەياخود پێويست نيە، لاشَكْ ئەوانە زۆر ظالمن، إنساني لە عَقل و هەموو شەرەف وفَضيلەتی إنساني مَحروم ئەکەن!! لام وايە بۆيە ئەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ﴾ بە صيغەی مُبالَغە ﴿لِلْعَبِيدِ﴾ فرقتن، أشاعرەو (مُعْتَزِلە)، مُتَفِقن، خوا ظُلم ناکا! (أشاعرەو) ئەڵێن، هەرچی بيکا ظُلم نيە، تَصَرّفات لە مُلکي، چی وانيە، ئەگەر خوا بيکا، بلّێن ظُلمە! (مُعْتَزِلی) ئەفەرمون: هەيە، ئەگەر بيکا، ظُلم بێ، أمّا نايکا. مَمنوعی بِالْغَيرە، صِفەتی مانعە! وَلَوْ بِالذّات هەرچی مُمْکن بێ مَقدوری إلٰهيە، امّا لازم نيە چی مَقدوري بِالذّات بێ، علی الأطلاق، مُمْكِنُ الوُقوع بێ! حَتّا لازم نيە مُمْکن بە هەر نَوعێ خَيالّی بکەی، مُمْکِن الوقوع بێ!.

نازانم، ئەوەندەی ئەزانم بَشَري بێ دەسەلات، مَظلومە! (مالِيَ لِسانٌ أقولُ انتَ ظَلَمْتني، واللهُ أعْلَمُ أنّني مَظْلُومٌ).

﴿وَمِنَ النَّاسِ﴾ ئەوانە نَوعێکن بێ مَبْدأو مَسْلَك خۆپەرست، أکْثَري سَفَلەی مُنتَسبي طُرُق، لەو نَوعَن! ﴿مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ﴾ لەسەر لایێ. ﴿فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ﴾ مالّ و ولَدو عِزّو إعْتِبارو حورمەت ﴿اطْمَأَنَّ بِهِ﴾ دڵی قەرار ئەگرێ، بە خوا پەرستن راضيە. ﴿وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ﴾ مُقابلی خێر ﴿انقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ﴾ لەسەر ڕوو وەرئەگەڕێ. لە ڕوو لە إيمان دەردەچێ بۆ کُفريّات. يەکێ هەبوو پێيان ئەگوت (شێخ مصطفی ی وەسماني کەپوو براي) بەد أصل

إنتِسابي طَريقي نەقشي بوو، زۆر مُحْتَرَم خصوص لە لاي موصل، رۆژێ هاتە کۆیێ درەنگ لە ماڵی جیرانی ئێمە میوان بوو، ئێوارە نیسکیان هەبوو، شێخ ئەیفەرموو: (دەبێ خوا نەمابێ دەنا ئەمن کوو نیسکی دەخۆم؟). ئەوانە ئەیانەوێ خوا لە أمْر إطاعەیان دابێ. ﴿خَسِرَ الدُّنْيَا وَالآخِرَةَ﴾ هەردووکی لە کیسی ئەچێ، حَقِيقَةً ئەو کابرایەش بێ حورمەت بوو بە کوشتن چوو. گەلێ جار ئەڵێم: ئەوانەي لە سەرەمەرگ إظاهري کُفر ئەکەن، با وجودي لە عَصْري ئێمە هیچی وانەبووە، أساساً نەبووە، کُفري مَکْتومیان بووە حَتّا خۆیان حِسّیان نەکردیە، بەڵکو ئي وا هەیە کە سەغڵەت بوو، کفریان ئەکا خۆی ناگرێ. ئەگەر إيمان مَحْکَمْ بوو، نە بە شَدائد نە لە سەرەمەرگ، وَهْني عارِضْ نابي! ﴿ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ﴾ ئاشکرا (يَدْعُوا) (بَعْدَ الإنْقِلاب) ﴿مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لاَ يَضُرُّهُ وَمَا لاَ يَنْفَعُهُ﴾ ئەم دارو بُت و (أصنام)و (إله)ی (شر)و (إله) (خَير) وپاشای جنۆکان و (جِمادات) و (موهومات) و (مُخَيّلات) ﴿ذَلِكَ هُوَ الضَّلاَلُ الْبَعِيدُ﴾ زۆر دوور؛ فەریاد ئەباتە، بەر هەموو هەرچی وبەرچی یەکی؛ وا دوور ئەکەوێتەوە؛ (قابلیَّەت)ی (هِدایەت) و هاتنەوەی سەر ڕێی (إيمان)ی نامینی ﴿يَدْعُوا﴾ با (صِنف)ی بن لەو (نَوع)ە ﴿لَمَنْ ضَرُّهُ أَقْرَبُ مِنْ نَفْعِهِ﴾ زۆر وابووە (تشبّث)یان بە دوژمنی قدیم ی کردیە (مع الممنونیَّەت) (إجابە) یان کردوونە، لەسەر (قوم)و (عشیرەت)ی خۆی، (معاونەت)یان داون؛ (عاقبەت) بووینە ژێر دەستی دوژمن، بەڵکوو (مَحو) بووینەوە، بە (تأکید) ئەیان زانی (خراپ)ە، (عاقبەت)ی (وَخیم)ە، لەبەر (طماع) لە (عقل)و (دین) دەرچوون ئەو (ل)ە، زۆر جوانە؛ لای (حقیر) چ کەشماکەش پێ ناوێ؛ لە عەرەبان بیستراوە (عِندی لَما غَيْرهُ خَيْرٌ مِنْهُ) (حاجەت) بە (قَلب) نیە؛ (يَدعوُ مَنْ لَضَرُّهُ) لام جوان نیە. (قطعی) لە (يَدْعُو) (رأساً) (لَمَنْ) (ضَرُّهُ أَقْرَبُ مِنْ نَفْعِهِ) ﴿لَبِئْسَ الْمَوْلَى﴾ (ناصِر) و (مُعين) ﴿وَلَبِئْسَ الْعَشِيرُ﴾ هەم دەم و هەم (صُحبەت)، (تِلاوەت)و (نظم)ی زۆر نا (مُنتظم)ە، من (تَشَبُّث) بەوانە ناکەم، بۆ (إصلاح)ی (آیەت)؛ (ضَرر)یان

نیزكترە، لە (نفع)یان؛ وەچەند (تَوجیهات)ێ نا (وەجیە)یان هەیە؛ (سیّدی آلوسی) (نقل)ی فەرمووە (مَعَ التَّزییف) ﴿إِنَّ اللَّهَ يُدْخِلُ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ (إیمان)ێ (خالص)ی (لا یَتزلزل) ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ بە گوێرەی (حال)و (مَقام) ﴿جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ ئەمە بۆ (قیامەت) ﴿إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ دیارە كوو (إدارە) ئەكا؛ هەرشتە، بە (مُناسب)ی (حال)ی خۆی. ئەگەر(كاتب)ی (إنسان) ئەو (أصناف)انەی (بَیان) كردبا؛ ئەی ووت (وَمِنَ الناسِ مَنْ یُؤمِنُ... وَهكذا) (أوصاف)ی (مُقابل)ی بۆ (ذكر) ئەكردن؛ (نهایەت) ئەی ووت: (أولئِكَ هُمُ المفلِحون، وَاللهُ مولاهُم، نِعْمَ المَولى، وَنِعْمَ النَصیر)(لكن) (دقّەت) لە (نظم)ی (جَلیل) كە زۆر پڕ (مەعنا)، تا (خیال) كەی بە (نكتە)یە؛ (حتّی) ئەمانە (مِن حیث العبارەت)یش نایەنە تەرازووی ئەوان.

(أمّا) بۆ (دنیا) (نصر)یان (مُحقق)ە، (طبعاً) (نصر)یان بە (نصر)ی سەرداره؛ (لاشك) خودا (نصرەت)ی ئەدا لە (دُنیا) و (قیامەت) ﴿مَنْ كَانَ يَظُنُّ أَنْ لَنْ يَنصُرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾ لە چِتاقیان، با خۆی بە پەتەوە كات ﴿فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ﴾ (حَبل)ێ ﴿إِلَى السَّمَاءِ﴾ بۆ لای بلندی، پەتێ هەلّخا؛ بە دیرەگەی خانی، یا داری قەنارە ﴿ثُمَّ لِيَقْطَعْ﴾ خۆی بخنكێنێ، (نفس)ی خۆی ببڕێ ﴿فَلْيَنظُرْ﴾ خۆی (فرض) كا، لەو (حال)ەدا؛ (الآن) تەماشاو (مُلاحظە) بكا ﴿هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُ﴾ (حیلە)ی وی ئەبا؟ ﴿مَا يَغِيظُ﴾ رِق و قینی، (مُوجِب)ی؛ بەچەند (وَجە)ێ تر ئەو (آیەت)ە (تفسیر) كرایتەوە، (أمّا) بێ (وَجْە)ن، بەلێ (عَود)ی (ضمیر) بۆ (مَن) كە (عبارەت) بێ لە (مَنْ انقَلَبَ)ە، جوانە. (أمّا) (عود)ی (ضمیر) بۆ (رسول) (تفسیر)ی (نَصر) بە (رِزق) با (لُغة) (ثابت) بی، (لكن) لێرە بە (مناسب)ی نازانم ﴿وَكَذَلِكَ﴾ وەك ئەو (إنزال)ی ئەو (آیات)ی (مذكورە)ی (واضح) (مُقَرّر)ی (بُرهان)و (مُزیل)ی (شُبهە)یی (سیَر)ی (أصناف) (نَظر) بە (إیمان) ﴿أَنزَلْنَاهُ﴾ (قرآن) (أي ما أنزل) گەر بی نۆڕی یە (بَعْدَ التَّدْوین) هەمووی ﴿آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ هەر (آیات)ە بە گوێرەی (موضوع)ی

(واضِح)ە، (كامِلُ الْبَيان)ە جێی (إشتباه) و (رَيب) نيە؛ ئەوی (إيمان)ی پێ نايەنێ، لە غَيظ و لە (رَيب)ە؛ (إنتباه) ی نيە ﴿وَأَنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يُرِيدُ﴾ خۆی ئەزانێ، كێ (قابل)ە؛ كێ نا (قابل)ە؟ لە (قرآن)و ڕەوشتی (بشر) وا دەرئەكەوێ؛ (مُتَكَبِّر)و (حَسود)و (مُحِبّ)ی (تَرَأُس)و (باغِظ) (محال)ە (إيمان) بێنن؛ گەرچی لە (ممكنات)ی (ذاتيە)بێ؛ (أمّا) (مُحال)ێ (إستعدادی)يە. (عالَم)ی (تَطَوّر) (مادّی)و (معنوی) (داخل)ی (إمكان)ی (إستعدادی)يە؛ وە (هدايەت)ی (ربّانی) (تكوينی)و (تشريعی) (خاص) نيە، (بِشَخْصٍ دُونَ شَخْصٍ) بە (قَوم)ێ (دُونَ قَوم)ێ؛ (نسبەت)ی بۆ هەموو (عَلَى السَّواء)ە، (إختلاف) لە (جِهەتی) (أشخاص)و (أقوام)ە ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بِمُحَمَّدٍ (ﷺ). ﴿وَالَّذِينَ هَادُوا﴾ جوو. ﴿وَالصَّابِئِينَ﴾ إدّعا ئەكەن لەسەر ديني (إبراهيم)ين، الآن كەمێ لە (بَغدا)و مِقداري لەلاي (شام) هەن، خۆيان بەهادي ئەزانن، تائەم زەمانە لەسەر دينی (تَوْرات) ماون، حَتّا لە قرابيني خۆشبوی خودا رِوونەكەنە مَوقِعي لە چياێ كە (إسحاق)ي تيا درێژ كرايە بۆ (ذَبْح)، موسلّمان و جوو ديانان بە كافر ئەزانن. قَومي مُتَعَصّبن زِواج لەغَيري خۆيان لەگەلّ كەسي تر ناكەن ، رِوولەكەمين! ﴿وَالنَّصَارَى﴾ ديان. ﴿وَالْمَجُوسَ﴾ ئاگرپەرست. ئەوانيش أساساً كتابيان هەبوو. كِتابي (زەردەشتي) لە تَأريخي (عمومي) ئەلّێ: إيراني ئەلّێن: (ئەسكەندەر) مەحووي كرديە. أمّا صَلابەتي أوروپايي قبولّ ناكا ئەلّێن: فاتِحيني عەرەب مەحوو نابووديان كرديە. قسمێ ماوە گۆيا دۆزراوەتەوە. گەلێ كەس لە عُلَماي گەورە تَصديقي رِسالەتی (زەردەشت)يان كرديە. غايەتی بَعْدَه أتْباعي وەكي جووان كِتابيان تَحريف كرديە، وەكي ديانان دينيان تێك داوە. ﴿وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا﴾ هەر قەوم مللەتێ بێ. ﴿إِنَّ اللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ ديارە ئەوانە هەر خۆيان لا هەيە، خۆيان لەسەر حەق ئەزانن، ئەواني دي بە كافر حِساب ئەكەن. هەر ئەوە بە ئومێدي كەسي تر مەبن، قَضايان لە

(بَعْدَ المَوت) فروع بە (إعتبار)ی (زمان)و (مکان)، (إختلاف)ی ئەبیّ ئەمەش (موجب)ی (تفرقە) نیە؛ زیّرا (نظر) بۆ (صلاح)ە ﴿وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ﴾ لە (موجِب)ی (تفرقە)؛ (حتّی) (کلمە)یە وانەلّیّن، (شَمّ)ەیە لە (شبهەی)ی (خلاف)ی (حقّ)و (حقیقەت)بدا.

ئەگەر لەو (طرف) خوا (أمّەت)یّ (متشابە) بیّ، (توفیق)یّ کەن، وەبفەرموون: بۆ کەسی تر نیە، بە (إدّعا)ی (وارث)و (إتّباع) قسەیە (مُوهِم)ی (کفر)و (ضلال) بکا؛ زیّرا (کلام)ی (مُتشابە) (حقّ)ی (خالِق)ی (متشابهات)ە ﴿فَتَقَطَّعُوا﴾ (جماعات)، (أُمَم) ﴿أَمْرَهُمْ﴾ (شأن)ی (دینیّ)و (دُنیوی) ﴿بَيْنَهُمْ زُبُرًا﴾ (قطعە) (قطعە)؛ پارچە، پارچە؛ هەر جەماتە، بەلایە. (کُتب)ی (مختلفە) وەك: (أناجیل) ئەنووسنەوە، هەریەك ئەلّیّ: "(کتیب)ی من" ﴿كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾ یەك (أمّەت) بە چەند (فِرقە)، (تفرّق) ئەکا؛ ئەوی دوایە دیّ، بە (عَین)و (هوا)و هەوەس، (إلتحاق)ی (فرقە)یە ئەکا، خەریکی ڕیّك کەوتن نابیّ؛ هەر (حزب)ە بە (أعمال)و (إعتقادیات)ی خۆیان (مسرور)ن؛ (حق) لە (طرف)ی خۆیان ئەزانن؛ (خاصّةً) ئەگەر (عقل) سست بوو، (خیالات)و (أوهام) (غلبە)ی کرد، (فیّل)ی (وحدەت) (بِالمرّة) نامینیّ؛ وەکی (حکماء) ئەفەرموون: "(توحید) (وظیفە)ی (عقل)ە، بۆیە لە (إفراد) و (جزئیات) (معنا)ی (واحد)ی (کلّی) وەرئەگریّ؛ (ماهیەت)و (حقیقەت) (کشف) ئەکا." ناشکری نەبیّ (أمّەت) دوای (صاحب الدعوة) وا (متفرق) بوون؛ هەر (حزب)ە هەر (فِرَق)ی، بە (قوم)یّ سەربەخۆ، (دین)ی جوایەز ئەچن. (أشاعرە) —بابلیّم (سُنّی)— ئەفەرموون: "لە (فِرَق)ی (عدیدە)ی (إسلام) هەر ئیّمە (ناجی)ن؛ ئەوانی تر (فی النّار)ن" (وهکذا) ئەویدیش وائەلّیّ. (زمخشری) (تعبیر)یان بە (أهل)ی (بِدَع) لیّ ئەداتەوە، بە (طعن)و (لوم)و (قدح)، (حشر)یان پیّ ئەکات. لە (مسائل)ی (إجتهادیە)و (إعتقادیە) گویا ئەبیّ (فرقە)یە لە (عمومی) (مصیب) بیّ؛ باقی هەموو لە هەموو بە (خطأ) چووبن.

(مشکله)یه له (صرف)ی (نظر)ی (علما)ی (مذاهب)، (مَعَ أنّه) به (إجمال) له (حق)ی (أئمه)ی (کرام) (وکُلّهُم عَلی هُدی من ربّهِم) ئەلێن: (أمّا)ن (تفصیل)ی ئەفەرموون؛ ئەبێ لات وابێ (أقوام)ی (إمام)ت -(مثلاً)، وەك (إمام)ی (شافعی) (صواب)ە، (إحتمال)ی (خطأ)ی هەیە؛ ئی ئەوانیدی (خطأ)ە، (إحتمال)ی (صواب)ی هەیە. خوایە من چۆن ئەو (حکم)ە بکەم؟ (مقابل)ی (إمام)ی (حنفی)و (إمام)ی (مالك)و (إمام) (أحمد)و (سائر)ی (مجتهدین)ی (کرام)، به چ زوبانی، به چ (علم)و (کمال)ی بڵێم: (أحکام)ی (إجتهادیه)ی ئێوه (خطأ)ن، (إحتمال)ی (صواب)ی هەیە؟ (مع أنّه) ئەوەی ئەو (تلقین)ەمان دەکا ئەگەر کەسێ (إعتراض)ەکی لێ بگرێ، به (فتوا)ی (راضی) نەبێ ئاسمان بەسەر عاردا، دەڕووخێنی؛ ئەگەر له (ما في الضمیر) له (فَرق) (فکر)ی، وە(إلاّ) له مەیانا، گوێت له قسەیان بێ، (کُلّ)ی (فرقه)یه بەوانیتر ئەلێ: "لَستم علی شيء" وەك جوو به دیان ودیان به جوویان ئەووت. وە(حتّی) لەبەر (کُتب)ی (معتقدات)و (عملیات)ی خۆیان ڕێیان گرتوە، بووینە (حائل)، له (بین)ی ئێمەو (کتاب)ی (إله)ی و (أحادیث)ی (رسالەت) پەناهی. (سبحان الله) ئەبێ (وجدان)و (مشاهدات) و (حواسّ)ی خۆت و (عالَم) (تکذیب) کەی لەبەر (قول)ی ملایە، که (مقام)ی (رئاسەت)ی (فرقه)یەکی (إحراز) کردیە.

کووا (حریەت)ی (فکریه)؟ کووا له (نظر) له (کتاب)ی خوای؟ کووا (تأمّل) له (آیات)ی کونیّە؟ کووا (وثوق) به (عقل)و به (مشاهده)و به (تجریبات)؟ ﴿فَذَرْهُمْ فِي غَمْرَتِهِمْ حَتَّى حِينٍ﴾ وادیارە موسوڵمانان له گێژاوی جەهالەت دا نقووم بووین دەرناچن ئەخنکێن، بەو حاله له کەتێی داین، ألآن کانَ کما کان، إختلاف به شدّەت ترە! -زاد في الطّنبورِ نغمەي مُشاجَرات ومُناظَماتي دُعاتي دینی (قادیاني) و (بابي). وا دیارە له سایەی حُریّتي ئەفرەنجی، رِسالەت دەکەنە مَلْعَبه ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُمْ بِهِ﴾ ماوەیەکە ﴿مِنْ مَالٍ وَبَنِينَ﴾ پارە و أرضي و أملاك ومُشْتَقّات و حورمەت. سُبحانَ الله زیدە لەهەمو خائِنان ئەو

مەلای صالح و أمین بێ لەگەڵ مَذهَب و دین و قەومی خۆی، بێ ماڵە، بێ حورمەتە، حَتّا کم ولدیشە! ئەوانە وا ئەزانن وا حِساب ئەکەن ﴿نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ﴾ ئێمە لە خَیْرات دا بۆ وان مُسارَعە ئەکەین، نەیەڵین خێرێ بڕوا! بڕوا، بۆیان ئەگێڕینەوە وە ئەینێرینەوە! یَعْني لێیان راضین، بۆیە ئەو ئەفسانانەیان لە حەق ئەکەین؟ حاشا!! ﴿بَل لاَ يَشْعُرُونَ﴾ تێ ناگەن! ئەوە بۆوان مایەی خُسْرانە! شَقاوەتە! چونکی ئەوەی لەو ئایەتێ آتي دایە، لێی عارین! ﴿إِنَّ الَّذِينَ هُمْ مِنْ خَشْيَةِ رَبِّهِمْ مُشْفِقُونَ﴾ فەرقی خَشْیة و شَفَقَة لە سورەی (أنبیاء) تێپەڕی! وَجْهي جَمعي زاندرا! ﴿وَالَّذِينَ هُمْ بِآيَاتِ رَبِّهِمْ﴾ (قال)ي و (حال)ي و (أنفسي) و (آفاق)ی. ﴿يُؤْمِنُونَ﴾ إیمانێ کامل بێ غش ﴿وَالَّذِينَ هُمْ بِرَبِّهِمْ لاَ يُشْرِكُونَ﴾ نە لە إعْتِقاد، نە لە عَمَل ئانزیادە مُؤمن دقة لە شرك بکا حَقاً گەلێ شرك هەیە، بە إیمان، بە خلوصي دین، عَد ئەکرێ! ﴿وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا﴾ ئەوەی پێیان کَرَم کرایە لە طَرَف خوای، ئەوانیش عَطای ئەکەن، ئەیبەخشن، مُساعدەی فَقیران بێ نەوایان ئەکەن، پێی مَغرور نابن، إدِّخاری ناکەن، خَزینە دانانین ﴿وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ﴾دڵیان ئەترسێ، خۆیان بە مُقَصِّرْ ئەزانن، نە بە ماڵ مَغرور ئەبن، نەبە جُود وحَسَنات أمین ئەبن. نابێ! إلاّ ئەبێ خوامان لێ راضي بێ! من جوُد بکەم، ئەو نایکا؟ بەو نَوعە دَسایسەی دَقیقە خۆیان ناخەڵەتێنن؟ ﴿أَنَّهُمْ إِلَى رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ﴾ لە ڕووی ڕاوەستینی، لەبەر قُصور، شەرمە زارین! وەك (خَیّام) ئەڵێ:

با نَفس هَمیشه دَر نَبَرْدَم چِ کُنَمْ؟

وَز کَرْدەی خوێشتن بە دەردەم چِ کُنَمْ ؟

گیرم کی مَرا فرۆ گوزاری بەکَرَم

زان شَرم کی دیدەی چِ کَرْدَم چِ کُنَمْ ؟

﴿أُولَئِكَ﴾ ئەوانە ئەوانن ﴿يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ﴾ خێر دەورەیان ئەدا، لە دونیا لەناو خێران دا ئەژین، لە قیامەت لەناو خێران دەوام ئەکەن. لە دونیا خێر ئەکەن لە قیامەت خێر وەرئەگرن. ﴿وَهُمْ لَهَا﴾ بۆ خَیْرات ﴿سَابِقُونَ﴾

سَبْقي بۆ خێريان، بۆ خێره! بۆ شُهرەت و ناو نيه! ناشكُري نەبێ روأساي دين لەو خێرانە مَحرومن، مُتَشَيِّخەكان غايَه مَغرورن! ﴿وَلاَ نُكَلِّفُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ مادام له وُسع دابێ، بۆ نايكەن؟ دياره مَقْصَد له (وُسع) بەس إمكاني زاتي نيه! بۆيه ئەفەرموێ (وُسْعَها)! مَعْذَرَتتان له نەكردني أعْمالي خَيْرِيّه چيه؟ ﴿وَلَدَيْنَا كِتَابٌ يَنطِقُ بِالْحَقِّ﴾ ئەوى كردبيان ئاشكراى ئەكا، هيچى له خواى بزر نابێ! ﴿وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ نه به تَكليف، نه به جَزا. ﴿بَلْ قُلُوبُهُمْ فِي غَمْرَةٍ مِنْ هَذَا﴾ چ بەهانەيان نيه، دڵيان له گەردواى غفلەت و جَهالەت دايه! غافلن لەوەى ذكر كرا له چاكه، أنَّهُ هەر به دڵيشيان دانايێ ئەو أعْمالي خَيْرِيّه بكەن! ﴿وَلَهُمْ أَعْمَالٌ﴾ سَيِّئه. ﴿مِنْ دُونِ ذَلِكَ هُمْ لَهَا عَامِلُونَ﴾ يُسارِعُونَ في الشُّرور.

چُن به خلوەت ميرَسند آن كارێ ديگر ميكنند

دەوام دەكەن لەسەر ئەم حاڵه ﴿حَتَّى إِذَا أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِمْ﴾ دەوڵەمەندو صاحب نازو نِعْمَة ﴿بِالْعَذَابِ﴾ به نَقْصي ماڵ و ذَهابي حَشْمَة. ﴿إِذَا هُمْ يَجْأَرُونَ﴾ هاوار ئەكەن ئێمه بۆ وامان لێ هات؟! هەي واى دادو فغان و رۆ رۆ، وەكى گا بۆرِه بۆرِ ئەكەن! حَقيقَةً ئەو نَوعه مُتَرَفِّيهانه كه شتێكيان هاته سەر، هاوار ئەكەن به جَزع و قَلَق و إضْطِراب ئەبن! ﴿لاَ تَجْأَرُوا﴾ بۆرِه بۆرِ مەكەن! ﴿الْيَوْمَ﴾ ئەورۆ رۆژي لێ قەومانه، رۆژي زيان و خُسرانه، بانگ و رۆرۆتان بێ فائدەيه! ﴿إِنَّكُمْ مِنَّا لاَ تُنصَرُونَ﴾ له طَرَف ئێمه نَصرەت نادرێن! وە كەسى تريش نيه نَصْرەتان بدا! ﴿قَدْ كَانَتْ آيَاتِي﴾ قُرآني! ﴿تُتْلَى عَلَيْكُمْ﴾ لەو رۆژەى ئەترساندن ﴿فَكُنتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ﴾ لەسەر پاژنه. ﴿تَنكِصُونَ﴾ ئەگەڕانەوە، پاشەو پاش ئەكشانەوە، نەوەك گوێتان لێ بێ! حاڵتان وايه ﴿مُسْتَكْبِرِينَ بِهِ﴾ بەو گەڕانەوە. يَعنى دەعيەتان نەدێنا ڕاوەستن، گوێ له آياتي خوا ڕاگرن، لەبەر ئەوەى ئەترسان تَأثيرتان تێ بكا، ئەوە كه له ضَميرى (بِهِ) عائِدى مَصْدَرى مُسْتَفاد له (تَنْكِصُونَ)ە بێ، وەكى (صاحِبى (بَحر) ئەفەرموێ، ئەبێ وەلاي حَقير جوانه! أمَّا رجوعي ضَمير بۆ بَيْتُ الحرام، حَقيقَةً

نا مَفهومە! گەرچی إفتخاریان لە خارجەوە مَشهورە! أمّا رجوعي ضَمیر بۆ (رَسول) یا بۆ (قُرآن) ئەگەرچی نَوْعاً فَهم ئەكرێ، أمّا تَوْجیهی سَبَبِیّەم لا خۆش نیە! ئەگەر (بِه) مُتَعَلِّق بێ بە ﴿سَامِرًا﴾ رجوعی ضَمیر بۆ قُرآن بێ، زۆر جوانە! يَعْني مُسامَرەو گفتوگۆی خۆیان لە مَجْلسی خلوەتي بە قُرآن ئەكەن ﴿تَهْجُرُونَ﴾ وەك نەخۆشان لەگەڵ خۆ ئەڵێن: شعره، سحره، أساطیره! ﴿أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا الْقَوْلَ﴾ (قورآن) یا قسەی خۆیان؛ ئەوی دەیلێن، لەبەر چی دەیلێن؟ (طعن)یان، (عَدَم)ە (إعتبار)یان بە (قورآن)؛ بۆ چ؟ (عناد)ە (تكبّر)ە ﴿أَمْ جَاءَهُمْ مَا لَمْ يَأْتِ آبَاءَهُمُ الْأَوَّلِينَ﴾ كەسیتر لەوان، (إدّعا)ی (رسالەت)ی نەكردیە، (أحكام)و (كتاب)ی (إلهی) (تبلیغ) نەكردینە، ئەوە (أمر)ێ (بدعەت)ە، (حادث)ە، (قبول)ی ناكەن، لەسەر (دین)ی (آباء)ی خۆیان ئەمێنن؛ ئەمەش (وجه)ی نیە، بەڵكو لە (نظر) (أرباب)ی (عقول) ئەمە (وَجه) بۆ هاتنی (حكم)ی (إله)ی ﴿أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا رَسُولَهُمْ﴾ نایناسن كێیە، (أخلاق)ی چیە؟(أعدی الأعدا)ی پێ ئەگوت:" (أمین)"؟ ﴿فَهُمْ لَهُ مُنكِرُونَ﴾ ئەزانن چ (ذات)ێ پاكە، (مقدّس)ە (میل)ی (شهوات)و (نفسانی)و (حُبّ)ی (رئاسەت)ی نیە؛ (شهرەت)ی (محمدی) لە (خطبەی) مامی، (وەقت)ێ داخوازی (حضرەت)ی (خدیجه)، (مُغْنی)یە لە (تعریف)ی ﴿أَمْ يَقُولُونَ بِهِ جِنَّةٌ﴾ شێتی، ئەڵێن: "شێتە" (بعض)ێ لە (رجال)ی (أوروپایی) بە (أمثال)ی (أسكندر)و (ناپلیون) (حتی) ئەمڕۆ (هتلر)و (موسولونی) (یعنی) (عبقری)یەكانی لە (نوابغ)آن؛ (حاصل)ی (ذوات)ی (شاذّ الوجود) كە كارێ وا ئەكەن، لە (عقل) بە دەر (حسب النظر) (خارج)ی (حوصله)ی (بشر)، پێیان ئەڵێن: "(مجنون)".

لە مەیانە (حضرەت)ی (رسول)ی (أكرم) بەو (نوع)ە (جنّەت)ە (ذكر)ئەكەن؛ بەڵێ (جنّەت)ی ئەوانە (فوق العقل)ە، (جنّەت)ی (خلق)ی (تحت العقل)ە؛ ئەوان لێ ی تێ دەپەڕن، ئەمان نایگەنێ؛ (حتّی) لە (لسان)ی كوردی دەربارەی كەسێ، كارێ زۆر گەورە، دوور لە (وقوع)، دوور لە (تدبیر)ی (عقل)

بکا، ئەڵێن: "ئـەوە کـاری خـرد نیـە" ئەوانـەی ناشـارەزا لـە ئێمە، ئەگـەر لـە (عیبارەت)ی ئاوروپایی یان بینن، (نسبەت)ی (جنّەت) بۆ (رسـول)ی (مُجتبـا) وانـەزانن، (جنّــەت) (دون العقــل)یــان مــرادە، (جنّــەت)ی (فــوق العقــل)یــان (مقــصود)ە. بـە (جهـل)ی خۆیـان هەڵنەخەڵـەتێن ﴿بَـلْ جَـاءَهُمْ بِـالْحَقِّ﴾ (رسـالەت)ی (مـا بِـهِ الرسـالة)ی؛ (حـقّ)ە (ثابـت)ە، (إرشـاد)ی (هدایـەت)ی، (تنظیم)ی (قوانین)و (شرائع)و (تدبیر)ی، دوورە لـە (جنّـەت)ی وان ﴿وَأَكْثَـرُهُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ﴾ ئەوە (جنّەت)و (حماقەت)ە؛ کەمیش (تابع)ی (أکثر)ە. ئەوانـە (کیف)یان بە (حق) نایە، (تابع)ی نابن، ئەیانەوێ (حـق) (تـابع)ی (هَـوا)ی وان بێ ﴿وَلَوْ اتَّبَعَ الْحَقُّ﴾ (قورآن) (وحی)، (رسـول)، (جنـابی) (حـق) ﴿أَهْـوَاءَهُمْ﴾ بە (هـوا)و هەوەسـی وان بـن ﴿لَفَـسَدَتْ الـسَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ وَمَـنْ فِـیهِنَّ﴾ ئـەوان (کیف)یان بە (حق)و (خیر)و چاکە، بۆ (عباد)ی خـوای، (غـیر)ی خۆیـان نایـە؛ ئەوی (فساد)ە، (فحش)ە؛ (قبـائح)ە؛ ئـەوی ئـارەزوو ئەکـەن؛ بـە (مُوافـقَ)ەی وان (نظام)ی (کائنـات) تیـك ئەچێ ﴿بَـلْ أَتَیْنَـاهُمْ بِـذِكْرِهِمْ﴾ (قـورآن) (فخـر)و (شرف)ە، (إرسال)ی (رسول) لەوان (موجب)ی سەر أفرازی یە، پێی ئـەبن بـە (سیّد)ی (أنام)، ئـەوانی (إیمـان)یان هێنـا، بـوون ﴿فَهُـمْ﴾ لەبـەر (جهـل)و بـێ مایەی و بـوت پەرسـتی ﴿عَـنْ ذِكْـرِهِمْ مُعْرِضُـونَ﴾ زەهـی (ملامـەت)، (زەهـی) (دەنائەت).

لام وایە لە (مقالـە)یـە. تریشم وتیـە؛ بـۆ (قـوم) لـەوە زێـتر نـابێ، (تـصوّر) ناکرێ؛ (رسول)یان لە خۆ، (کتاب)یان لەخۆ (شرع)و (قانون)یان لـەخۆ (قلـم)و (کتابـەت)یـان لـەخۆ، (یعنـی) (صـاحب)ی (خـطّ)ی (خـاص)ن؛ (سـبحان الله) ئـەمڕۆش (عـەرەب) (تقـدیر)ی ئـەو (شـرف)ە ناکـەن؛ لـە جیـاتی (تـنظم)ی (قـانون)ی (شـریعەت)، (قـانون)ی (دُوَل)ی (أجنبـی) وەرئـەگرن؛ دوای ی (هەوا)ی (مسیحی) ئەکەون؛ (حتّی) (أُدبا)یـان ئـارەزووی (حـرف)ی (لاتینـی) ئەکـەن وە(فکـر)ی (لادینـی)یـان هەیـە؛ بـەڵێ بەدبەختیـە، ئاوروپـا دوورن لـە

(عیسی) (عبادەت)ی ئەکەن، هەموو شتیان بە ناوی (مسحی)یە. (قوم)ی (محمد) (یعنی) (عرب)، خۆیان دوور ئەخەنەوە، (مع أنّه) کەسێ (إنصاف) کا، ئەزانێ (نسبەت) نیە؛ (محمد) (حقّاً) (فخر)ی (کائنات)ە؛ سەروەری (عالَم)ە، پێغەمبەرێ (ذی شان)ە ﴿أَمْ تَسْأَلُهُمْ خَرْجًا﴾ بۆیە (ایمان) نایەنن، ناتوانن (خَرج)ت دەنێ؟ ﴿فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيْرٌ﴾ (رزق)ی (دنیا)و (آخرەت)ی ئەو (خێر)ە ﴿وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ بێ (مِنّەت)و (لا ینقطع) ﴿وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ بێ خوارەکەو پێچەکەو (حیلە)و تەڵەکە ﴿وَإِنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ﴾ (قریش)و (غیر)ە (قریش) ﴿عَنِ الصِّرَاطِ﴾ لە ڕێی ڕاست ﴿لَنَاكِبُونَ﴾ لا ئەدەن، بۆیە نایەنە سەر (دین)ی (مُبین)؛ (مدار)ی ناڕاستی، (حُبّ الشهوات)و (إنکار)ی (آخرەت)ە ﴿وَلَوْ رَحِمْنَاهُمْ﴾ (مُترَقّە)کانی گیرۆڕە ﴿وَكَشَفْنَا مَا بِهِمْ﴾ (بعد الجأر) ﴿مِنْ﴾ لە ﴿ضُرٍّ﴾ (سوء)ی (حاڵ)، نابنە پیاوی باش، (تَوبە) ناکەن؛ (بالعکس) ﴿لَلَجُّوا فِي طُغْيَانِهِمْ﴾ (تجاوز)و (إستکبار) ئەکەن ﴿يَعْمَهُونَ﴾ بە جاری بێ (بصیرەت) ئەبن، ڕوو لە (مصالح) ناکەن. (واقعاً) ئێمە دیمان پاش ساڵی گرانی (١٣٣٦)، ئەوانەی بە (حاڵ)ە (حاڵ) قورتار بوون، خوا (حاڵ)و باڵەکی پێ (کرم) کردن، گەلێ خراپ تر بوون، لە (إنهماک)ی (في الّذائذ) بە (دعیە)و (أنانیەت) بە کۆڵانان دادەڕۆن، گوێ یا لە (عومر)ی خۆیان، بۆ پارچە نانێ، لەبەر دوکان ڕانەوەستاین، نەنووزاینەوە! ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَاهُمْ بِالْعَذَابِ﴾ بۆڕاندیان بۆ (کشف)ی، هاواریان ئەکرد، (أمّا) شتێ سطحی) بوو لە (حقیقە)دا ﴿فَمَا اسْتَكَانُوا لِرَبِّهِمْ﴾ (خضوع)یان نەبوو، (إطاعە)یان نەکرد ﴿وَمَا يَتَضَرَّعُونَ﴾ (عن صمیم القلب) ناپاڕێنەوە، شتێ، لوورەیە بوو؛ وەك لوورەی گورگەکی کە بە تەڵەوە ئەبێ. پاڕانەوەی (خلاص)ی یە، ئی (إخلاص) نیە، ئەوانە ناگەڕێنەوە لە (غیّ)و (طغیان) ﴿حَتَّى إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾ دەرگایە (عظیم) لە (آخرەت) ﴿إِذَا هُمْ فِيهِ﴾ لە (عذاب)دا ﴿مُبْلِسُونَ﴾ (مُتحیّر)و (مأیوس) ئەبن، ڕێی (تلبیس)یان ئەبڕێ دەرگای (عفو)یان، لێ پێوە ئەدرێ. (تفسیر)ی

(باب)ی (ذا عذابٍ) به (فتح)ی (مكّه)، (نظر) به وان كه به (عذاب)یّ زۆر (شديد)ی ئەزانن، جوانه؛ گەرچی (حقيقةً) (رەحمەت)ە، (رەحمەت)ی (عُظما). ئەو (وەقت)ە بیّ دەسەلاّت ئەبن، ڕیّی (تجبّر)و (تكبّر)یان ناميّنیّ؛ (إيمان)يشيان له ڕووی (إنشراح)ی (صدر)ەوە نيه ﴿وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَ لَكُمُ السَّمْعَ﴾ له قرآن دا به جَمع وارد نەبووە. آذان، جَمْعي أُذن هاتيه! لا شَك بیّ علّة نيه ﴿وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ﴾ به مُفرَديش وارِد بوينه! ﴿قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ﴾ كەم شُكرن، وا نا مُكافات بكا! ﴿وَهُوَ الَّذِي ذَرَأَكُمْ﴾ بلاّوی كردينەوە، زۆری كردينه! ﴿وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ مِنْهُ المَبْدأُ وَإليْهِ المُنتَهى! ﴿وَهُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ طَبيعَة دخلي نيه! وەغَيری طَبيعَة له نَظَری ئێمه، هەر قسەی لیّ ناكریّ! ﴿وَلَهُ اخْتِلاَفُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ به أنواعي إختلاف، به وَضعي وييه! له كَثافةی أرض ونَيّری شمسي وَضْعيان ئەبیّ! ئەمەش خاصّي وييه! مَصالحيان دياره! ئەوان له حَوادثات تأثيريان نيه! ﴿أَفَلاَ تَعْقِلُونَ﴾ تیّ ناگەن؟ دَركي ناكەن؟ زەمان چيه؟ تأثيری چ بیّ؟ ئەدي إعْتباري نيه؟ ﴿بَلْ قَالُوا مِثْلَ مَا قَالَ الأَوَّلُونَ﴾ كُفرەی مُنْكِري (بَعث) ﴿قَالُوا أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا﴾ رِزين. ﴿أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ﴾ زيندی ئەبينەوە؟ نا! چۆن ئەبیّ؟ ﴿لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا هَذَا﴾ (بَعث). ﴿مِنْ قَبْلُ﴾ رُسُلي پيّشی خَبَري زيندوو بوونەوەيان داوە بۆ عمومي بَشَر، مَعلوم زيندي بوونەوە خاص نيه به أُمّتی دوُنَ أُمّتیّ! ﴿إِنْ هَذَا﴾ نيه ئەوە ﴿إِلاَّ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾ أُكْذوبه يه، سَطر كرايه، نوسرايه! ﴿قُلْ لِمَنِ الأَرْضُ وَمَنْ فِيهَا﴾ له كائنات. ﴿إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر علْمتان هەيه؟ جوابدەنەوە به جەوابیّ مَعْقول! ﴿سَيَقُولُونَ لِلَّهِ﴾ مُؤكّداً! وانەلێن ئەلێن چی؟ ئەلێن بِلادي ڕۆم وإيران إمپراطوري شاهَنشاهی خوسرەوي، اي(لات)و (عُزّا)يه؟ قسمي (أعظَم) له عەرەبان، تابعي ئەو دوو حكومەته بوون! ﴿قُلْ أَفَلاَ تَذَكَّرُونَ﴾ وەكی ئەفەرموون: مادام ئەزانن، مالكي أرض ومَنْ فيها خَلْقي كردينه! ئەتوانیّ إنسانان زيندی كاتەوە! بۆ ئەتوانیّ خَلْقيان بكا؟ بۆ ناتوانیّ زينديان كاتەوە؟ ﴿قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ عَرش بەو

نوعەی نَقْله تَعْريفی ئەکەن، ئەبێ وایان زانیبێ؟ ﴿سَيَقُولُونَ﴾ (إبنُ جَرير) ئەفەرموێ: عامَّەی قُرّاي (حجاز)و (عیراق)و (شام) لە جوابدا ﴿الله﴾یان خوێندیتەوە ئەمە ڕاحەتە! ! و(أُبيَّه) مخالفەی کردینە (لِلَّه) خوێندیتەوە أما ئەمە بِنا لە (مَعْنا)یە، كَأنَّهُ سؤالیان لێ ئەکرێ (لِمَنْ مُلْكُ السَموات...ألخ؟) ئەڵێن: (لله)! أمّا من تێی ناگەم نوکتەی ئەم تَفَننە چیە؟ ﴿قُلْ أفَلاَ تَتَّقُونَ﴾ خۆتان ناپارێزن لە عِقابي رَبّي عَرشي عَظیم؟ ﴿قُلْ مَنْ بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ تَدبیرو تَدْویری هەموو شت بە دەست کێیە؟ ﴿وَهُوَ يُجِيرُ﴾ ئەوی پەنای بۆ ببا، مَنْعي خُصْمي لێ پێ ئەکرێ! هەر کەسێ بە طَرزێ! خەیاڵی کەن! وتَصَرُّفي خِلافي هەواي ئێوەیە! تَأمُّل! ! ! ﴿وَلاَ يُجَارُ عَلَيْهِ﴾ لە عَلَيْهِ خوا کەسێ، کەس لە پەنای خۆی ئەگرێ؟ کەس نیە! ﴿إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ اَلْجَواب ﴿سَيَقُولُونَ لِلَّهِ﴾ مَلَكوتُ كلِّ شَيءٍ بِيَدِهِ! مَلاذو مَلْجَأ وپشت و پەناهي نیاز مەندان بێ کەسان بێ هێزو دەسەڵاتان، هەرئەوە! . بَعضە سؤال هەیە ناتوانم إبرازی بکەم چونکي لەبەر دڵ تەنگی، لە جوابي عاجزم! ﴿قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ﴾ کوو؟ لە کوێ؟ فێلتان لێ ئەکرێ؟ لە حەق وەرئەگێڕدرێن؟ ﴿بَلْ أَتَيْنَاهُمْ بِالْحَقِّ﴾ حاشا اَساطیر نیە! هەموی حَقايقە، عِلْم وحِکَمە، آیات و عِبَرَە، مَفاتِحُ العُلومە! ﴿وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ خۆشیان ئەزانن درۆ ئەکەن، درۆزنن! . (سَيِّدی آلوسي) بَعضە نُکاتي بَلاغَتي إيرادْ کردیە، بۆ تَعَلُّمي بَلاغَةْ باشە مُوافِقە! ﴿مَا اتَّخَذَ اللَّهُ﴾ سُبْحانَهُ. ﴿مِنْ وَلَدٍ﴾ نە مَبْدَئي تَوالُدە، نە داخِلیتي! کەسێ حَسْبَ الظاهِر بابي دیار نەبێ، بڵێن ئەمە کوڕی خوایە، بێ مُلازَمەیە! . قُدَماي مصرو ئەوروپاو هندو سائری دي، وَلَدو براو ژن بۆ إلاه إتِّخاذ ئەکەن! (نَصْراني) خاصَّةً ئەوروپی لە نَسْلي ئەزانن، عَلی نَهْجِهِمْ گوتیان: (عیسی) إبنُ الله یە، وَزادُوا ووتیان: خوایە! لە بَطْني (مَريم)ە دا تَحَوّلاتي جَنيني بەسەردا هاتوە! ئایا ئەبێ ئەو أشکالي بەسەر جَنین إنسانان دادیت بەسەر ما في بَطْنِ (مَريَم)ە هاتبێ؟ لە (داروین)ی سؤال بکە! ! ! . ﴿وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ﴾ لە (ألوهیەت)و (ربوبیەت) (واحد)ە، (شریك)ی چی؟! (إلە)ی لەگەڵ نەبوە، لە (خلق)و

(تدبیر)؛ وەچیدی نیە، ببێ بە (علّەت)ی (إحتیاجی) ﴿إِذًا﴾ ئەگەر وابا، بێ (تأخیر)و (توقّف) ﴿لَذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ﴾ چەندی هەبا ﴿بِمَا خَلَقَ﴾ سەریەخۆ (إدارە)ی ئەکرد، بە (نوع)ێ کە دیار بێ، بزاندرێ، ئەو (مخلوق)ە ئی ئەو (إله)یە. ئەو (تدبیر)و (إرادە)و (تصرّف)ە، لەو (إله)ە، بۆ ئەو (قوم)ە یە. (وحدة)ی (أثر) بێ (شك)، (دلالەت) لە (وحدەت)ی (مؤثر) ئەکا، (على الأقل)، لێرە، (دلالەت)ی (أثر) لە (تعدّد)و (تعیّن) (بعض)ی هەیە (بعض)ی نیە. بەچی بزانین، ئەوکارە، کاری (إله)ی (قریش)ە، ئی (ثقیف)ە؛ وە(كذا) (سائر)ی (شُعب)ی (عرب)و (أقوام)ی دی؟ (بناءً علیە) (إتّفاق)ی دوو (إله)آن (قابل) نیە؛ نواندنی (أثر) (والحالة هذه) بی (معارضە)و (مبارزە) نابێ.

وادەرئەکەوێ (ذهبَ)ەی (متعدی) بە (ب)ێ، دلالەت لە (إفنا)و (إبادە)و (هلاك) ناکا؛ بە (مدخول) ئەگۆرێ؛ ئەگەر (قُوا) بێ، بردنی بە (معنی) (فَوت)آندنە. ﴿وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ بە (مُقتضی)ی (إظهار)ی (ألوهیەت)ی خۆی، بۆ (مخلوق)ی خۆی؛ دیارە (كَما هُوَ عادةُ الملوك) نیە؛ (ملوك) خۆیان و (رعایا)یان و (مملكەت)یان، (ممتاز)ە. ئەگەر (إتفاق)یان ببی، لە (بعض)ە (أعمال)، (دلالەت) لە دۆستی و (أُلفەت)، یا (تبادل)ی (مصلحەت) ئەکا. (تعدّد)و (إمتیاز) (محسوس)ە (مع أنّە) (إتفاق)یان لە (أمور)ی (داخلی)و (خارجی) (ممكن) نیە. (إدارە) لە (إدارە)ی (ملكیەت)ی (آشوری) ئەبێتە (إدارە)یە (قنصلی)؛ وەکی (رۆمایی) (قدیم)، (قول) بە (ربّ النّوع) لە (أفلاطون) (نقل) ئەکەن؛ (عجایب) (نوع)ی زۆر بێ دەسەلآت، (نوع)ی (آخر) (إنقراض)ی پێ ئەدا؛ ئەدی نەیکا، چ ئەکا؟! (حقّاً) (قول) بە (تعدّد)ی (إله) لە (خیال)و (وَهم)و ترس و (ضعف)و (حوصلە) تەنگیە. (قول) بە (إبن) (سیاسەت)ە. وادەرئەکەوێ لە (عادات)ی (قدماء) بۆ (أرباب)ی (هِمَم)و (إقدام) —حسب الأهمّیەت— (درجات)یان بۆ داناون؛ (بعض)ە (نوابغ) (إلحاق) ئەکەن

بە (زُمرە)ی (إله)ە؛ (بعض)ی ئەكەنـە (إبـن إلالـه) (بعـض)ی (هيكـل)يـان بـۆ ئەكەن؛ (بعض)ی ناگەيننە ئەو (درجە)، (علامەت)ێ نەويتريان بۆ دائەنێن.

لە (تأريخ)ی ئێمە كە پێی ئەڵێن: "(عصر)ی (نور)" ئەو (ظلمـات)ە، وەكـی خۆيـەتی؛ (حتّـی) پـاپ ئەگـەر (تـشريف)ی (قداسـەت)ی بەجێيـە (عبـور) بفەرموێ، ئەوی ببينی، تا تێ ئەپەڕی، ئەيەوی بكەوێتە (ركوع)؛ ئايا (قابل)ە ئەو (ذات)ە (مُسلّمان) ببی؟ وەك (ملا)يە وەكی مـن، بـە (ذلّـەت) و (علّـەت)و (حقارەت)و (منكوبی) و (مغلوبی) (راضی) بیّ؛ وە خەريكی (خدمەت)ی (ديـن) بیّ؟! ﴿سُبْحَانَ اللَّهِ﴾ (مُنزّە)ە، دوورە، پاكە، (مُتعالی)يە ﴿عَمَّا يَصِفُونَ﴾ لـە (شـرك)و (ولـد)و (زوج)و (سـائر)ی (أحـوالات)ی دیّ، كـە (لايـق)ی (مقـام)ی (أُلوهيەت)ی نەبیّ، كەسێ ئاگای لە (إعتقاديات)ی (قُدما)ی (بشر) بی، ئـەزانێ (إلـه)و (إلـه)ە، (ملعـب)ەی (خيـالات)و (موضـوع)ی (حكايـات)و (خرافـات)ن ﴿عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ (محـسوس)ونـا (محـسوس) ﴿فَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ ديارە ئەوەی بڵـێ: "كەسـی (علـم)ی وەكـی (علـم)ی خـوا، (قـدرەت)ی وەكـی (قُدرەت)ی ئەبیّ" (مُشرِك)ە. ئەگەر بڵێی: (علم)و (قدرەت)ی (شامل) بۆ خـوا (ذاتی)يە" بۆ ئەو كەسە لە (طـرف) خـوا پـێی ئـەدرێ؟ (مـادام) ئـەو (نـوع)ە (علـم)ە لـە (مقتـضی)ی (ذات)ە، كـوو ئەدرێتـە (غـير)؟ خـوا لـە (صـفاتی) (ذاتيـە)ی (إختيـار)ی بـۆ خـۆی نيـە؛ تـا بـە (إختيـار)ی خـۆی بيبەخـشێ؛ (شـؤون)ی (إلـه)ی هەرچـی بـێ، بـۆ (غـير)ی ئـەو (مُحـال)ە. بنـۆڕە (بقايـا)ی ئەوانە، پاش ئەو (إقرار)و (إعتراف)ە، لەسەر (شِرك)و (كُفر) هەرماون. (لاشـك) ئەخوازێ (تهيّج)ی (بحر)ی (غضب)ی (إله)ی بـە (نـوع)ی (عـذاب)يـان بەسـەرا بنێری، هێشك و تەڕ؛ وێكڕا بـسووتێنی؛ (حتّـی) (مُـسلّمان) و پێغەمبـەريش لـە (شەڕاڕە)ی (أمين) نەبن؛ ئەوانيش بگرێتەوە. بۆيە خوا ئەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ (يـا محمّد) ﴿رَبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي﴾ ئەگەر نيشانم بدەی ﴿مَا يُوعَدُونَ﴾ لـە (عـذاب) ﴿رَبِّ فَلاَ تَجْعَلْنِي فِي الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ لەناو واندا نەبم، (حفظ)م كەی لـەو (عـذاب)ە؛

﴿ (حقّ)ی وایه، (کُرَه)ی (أرض) هەلا هەلاکا ﴿وَإِنَّا عَلَى أَنْ نُرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَادِرُونَ﴾ بە (نوع)ی وات، نیشان ئەدەین، خۆت و (دین)و (أتباع)ت، (مَصون)و (محفوظ) بن. (عذاب)ی (سماوی) هەرچەند بۆ (کافر)آن دێ، (أمّا) (مؤمن)ەکانیش (متضرر) ئەبن؛ (هود)و (صالح) و (لوط) (أمثال)ی وانە؛ کُوا (دین)یان، (کتاب)یان، (قوم)یان، ئی (مؤمن)؟ ئەوانیش (محو) بوونەوە ! (للہ الحمد والشکر) (عذاب)ی (کفر)ە ی(قوم)ی (رسالەت) پەناە، بەو (نوع)ە نەبوە ﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ (أحسن) (فوق) ی (حسن)ە (معنا)ی وانیە، (حسن) لە (سیّئە)یە، تا (إحتیاج)ی ببی، بە (تأویل)، (مثلا) هەنگوین شیرینترە، لە سماق (یعنی) (حلاوەت)ی بە (قوەت) ترە، لە ترشی (سماق)ی؛ هاوین گەرمترە لە زستان، زستان ساردترە لە هاوین؛ بە (وجە)ێ (أحسن) (دفع) ﴿السَّيِّئَةَ﴾ بکە؛ وەکی خوای (مدافعە)ی بە (وجە)ی (أحسن) ئەکا، بۆ هەر دوولا، وە (معلوم)ە ئەو (عبارەت)ە (أبلغ)ە لە (إدفع بالحسنة السیّئة). (أمّا) لە (حدیث) ئەفەرموێ: (أتْبِع الْحسنةَ السّیّئة، تَمحُها) بۆ کەسێ (سیّيء)ی لێ (صادر) بێ؛ (لِکُلِّ مَقامٍ مَقالٌ) ﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ﴾ ئی تو، ئی خوای ﴿وَقُلْ رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ﴾(أولاً): (إنس)؛ (ثم الْجِن)؛ ئەوانەی داویانەتەبەر (مهون)، لێ یان ئەخورن، بۆ(إتّباع)ی (شهوات)، (نفرەت) لە (حَق) ﴿وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونِ﴾ وەك (دەورە)یان لەوان داوە. ئەم (إستعاذ)ە، وەك (إستعاذ)ەی (عذاب)ەکەیە؛ دیارە (علەت) (وسوسە)ی (شیاطین)ە؛ (دەورە)یان لێ داون، نایەڵن ڕووکەنە (خێر)؛ ﴿حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ﴾ ئەو (وقت)ە (تمنّا) و ئارەزووی (إیمان) و (عمل)ی (صالح) ئەکات؛ (لکن فات)! ﴿قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ﴾ (جمع) بۆ (تعظیم)ە، یا لەگەڵ (ملائکەت)آنە، بمگێڕەوە ﴿لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ﴾ لە (ماڵ)؛ دیارە چی پێ کردیە؛ (بُخل) و (شُحّ)ی پێ کردیە ﴿كَلَّا﴾ گێڕانەوە، گەڕانەوە؛ نیە ﴿إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا﴾ (تکرار)ی ئەکاتەوە ﴿وَمِنْ وَرَائِهِمْ﴾ لە دوایان؛ چونکی ئەوان؛ (زمانا)

(مُتَقَدِّم)ن؛ یا لە پێشیان؛ چونکی بۆی ئەچن ﴿بَرْزَخٌ﴾ (حائل)ی هەیە، (مانع)ی (رجعەت)ە ﴿إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ ئەوێ ڕۆژێ زیندی ئەبنەوە؛ بۆ (حساب)؛ ئەوەش (رجعەت)ی (دُنیا) نیە ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ﴾ وەك جَمْعی بۆ رئیسی تورکان! روح هاتنەوە بەر بەدەن ﴿فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ﴾ ئەوانەی بە قووەتی قوم و أولادیان مَغرور بووین بە نَسَبْ، نَسَبْ نامێنێ، فائدەی نادا ئەوێ ڕۆژێ ﴿وَلَا يَتَسَاءَلُونَ﴾ لێك پرسیني، تعاوني، ناکەن! أمَّا لێك سؤال کردني تَأثُر، ئەبێ، بۆ زێدەیی ألَم! کەوابێ حاجَت نیە دوو نَفْخەی لێدەین، ڕۆژ درێژکەین، لەوەقتێ نابێ، لەوەقتێ ئەبێ! ئەوانە کەس بە فریادیان نایێ، نە إلاه، نە شَیاطین! إنسان خۆو عَمَلي! نَسَبْ بۆ رَسول یا غَیري رَسول، إمتیازي فِطری نادا! لام وایە لە آخرەتیش وایە! حورمەت جوایەزە! بەڵێ ئەوەی نِسبەتی ببێ لەگەڵ (خاتم الرُّسل) ئەبێ حِفْظي کا، نەیکاتە سببي هەتکی شَرع و دیني! لە إبتداي سورەت مَعلوم بوو فَلاحي مؤمِن بە چیە! بَدْءي خَلْقي إنسان لە چیە! بنۆڕە أثري فِعلي، نە قَولي! تَقَوّلیان لا سَهْلَە! ﴿فَمَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ﴾ مَوزونات. أعمالي چاکەی گران بەها قیمەتدار دەهاتە وَزن و إعتبار، ﴿فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ئەمە خۆیەتي! صَدري سورەت بخوێنەوە! ﴿وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ﴾ بێ قیمەت سوك و چروك، ئەگەر وَزنیش کرێ، بۆ بێ وَزْني هەڵئەکێشرێ! ﴿فَأُولَٰئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ﴾ خۆیان بە ضایع یان دا، بێ قەدریان کرد لاي خودا! ﴿فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ﴾ حقاً خُسْرانێ عَظیمە، مَحرومیە لە هەمو نَعْت. ﴿تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ النَّارُ﴾ بڵێسەی بەڕوویان ئەکەوێ. ﴿وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ﴾ گرژو عَبوس، دەم و لێو ناشیرین، لچ هەرزە پەتای وەرگەڕای، وەکی سەلکی حَیْوانی کە بە ئاگری سووری ئەکەنەوە! ئەمە، ثَمَرەی لچ بادانە، لچ گەزینە، لە رَسول و موسوڵمانان! ﴿أَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ﴾ لەو حاڵەیان ئەترساندن ﴿فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾ زیندی بونەوەی چی؟ چ جەهَنَّم کوو؟ عَذاب چۆن؟ گوێ مەدەرێ!! ﴿قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا﴾ نُحوسَة و بەدبەختی، أسبابي

شَقاوَت و گوناە، غَلَبەی لەسەرکردین، ئاگامان لە خۆبڕا، فَهْمي آياتمان نەکرد، بۆیە ﴿وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ﴾ گومراە. ﴿رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا﴾ لە ئاگري. ﴿فَإِنْ عُدْنَا﴾ گەڕاینەوە سەر کُفرو مُعاصي ﴿فَإِنَّا ظَالِمُونَ﴾ بە تحقيق مُتَجاوِزي بَعْدَ الْعَيان ئەبین، بەلام بێ فائدەیە! ئەگەر گەڕابانەوەش، ئەچوونە سەر عَمَلي سابق، لە فکریان ئەکرد، هەر کوڕی جارانن! ﴿قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا﴾ بخنکێن ﴿وَلاَ تُكَلِّمُونِ﴾ ووس بن! ئەگەر سؤالتان لێ نەکرێ، سەریەخود، مِنْ بَعد، قسە مەکەن! ﴿إِنَّهُ كَانَ فَرِيقٌ مِنْ عِبَادِي﴾ ئەوانی إیماندار ﴿يَقُولُونَ﴾ لەبەر خوای ئەپاڕێنەوە ﴿رَبَّنَا آمَنَّا﴾ بە تەواوی (بِما أَرْسَلْتَ بِهِ رَسولَكَ). ﴿فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ﴾ حَتّا لە دایك و باب مُربّي و مُشْفِق تری! ﴿فَاتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا﴾ کردبوتاننە قەشمەرجاری خۆتان ﴿حَتَّى أَنسَوْكُمْ ذِكْرِي﴾ لەبەر گەمە پێ کردنیان، خواتان لە فکر کرد. ﴿وَكُنتُمْ مِنْهُمْ تَضْحَكُونَ﴾ بەوان پێ ئەکەنین، زیدە بە ناخانەدانەکاني فَقيرو بێ دەسەلات و دەست و پێ، ئەوانەی بێ حَسَب و بێ نَسَبْ! ئەمڕۆش بَعضە خانەداني ذي شأْن، با وجودي كَنّاس و كَنّاف وفَرّاش بَلَديّە وغَرَقي موظّفين حكومەتن، گەمە بە رَعيّە ئەکەن! ﴿إِنِّي﴾ ئەمن بِالذات! ﴿جَزَيْتُهُمُ الْيَوْمَ﴾ ڕۆژي جَزا. ﴿بِمَا صَبَرُوا﴾ لەسەر إيذاو سُخْريّەی ئێوە. أوّل وآخر صَبر بە کاردێ!

گرچی تَلْخَست ولێکن بَرێ شیرین دارَدْ

﴿أَنَّهُمْ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ نائلي مُرادن لە دونیاو آخرەت. ﴿قَالَ﴾ جەنابی حەق، یا ملائکە، تَبْليغيان ئەکەن ﴿كَمْ لَبِثْتُمْ فِي الأَرْضِ﴾ چەند لە أرضي تیاي بوون، إمراری حَیاتیان کرد ﴿عَدَدَ سِنِينَ﴾ چەند سالان بقاي شَخْصي یا نَوعي قابله! ﴿قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ لەبەر دەهشەت ئەوەندەشیان پێ تَعین ناکرێ! ئەلێن: ﴿فَاسْأَلِ الْعَادِّينَ﴾ لە حساب گران سؤال بکە. مُمْکنە لەبەر خۆشی و إظهاري تأثُر، أيامی عُمريان، ولَوْ زۆر بوویێ، بەکەمی بزانن! وەك لە دونیا أیامی سرور نَظر بە وَقتی أحْزان، کورت و کەم ئەنوێنێ! ﴿قَالَ﴾ خوا، یا ملائکە! ﴿إِنْ﴾ نَفیە. ﴿لَبِثْتُمْ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ مُتَناهی، هەرچەند بێ کەمە!

أمّا بابی تَفَكّر وتَذَكّر، هەبوو! ﴿لَوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ بزانن، یا شتێ بزانن. قسە کردنی وانە پاش أمري (إخسئوا) مُخالَفەی تیا نیە، سابقاً إشارەمان بۆ کرد! ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا﴾ بێ فائدە هەر وا نَموتُ ونَحیی! ﴿وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لاَ تُرْجَعُونَ﴾ حقاً حَیاتي دونیا ئەگەر (بَعث) نەبێ، عَبَثە! شتێکە وەك لَعْبي (سینەما)! ﴿فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ﴾ لە عَبَثْ کردن، شرك لە شائبەی ملوکی دونیا ﴿لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾ لە کَرَمە، یا لە کَرامەتە، مَعَ أَنَّهُ کَرامەتي عَرش، بە کَرامەتـي ذي الْعَرشە، وَفیضْ وإنْعامێ لە جهەت أریکەی حوکومراني و جهانیانی بێ، إیی خاوەنیەتي! ﴿وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لاَ بُرْهَانَ لَهُ بِهِ﴾ حَتا کەسێ مَعاذَ الله إنکاري خوا بکات نِسبەتی أمور بۆ طَبیعەت بۆ زەمان بدا، هەر نەئیسە (توجیه ما) یەکی بۆ ئەکرێ! أمّا ئەوەی قَول بە وجودي خوداوەندی سَماوات وأرض وعَرش بکا، إیمانی بە شتێ تر هەبێ، بە إلاه ومَعبودی بزانێ، حَقیقَةً هیچ وَجْهی نیە! ﴿فَإِنَّمَا حِسَابُهُ﴾ إیی ئەو (مَن)ە. ﴿عِنْدَ رَبِّهِ﴾ ربّی حَقیقی. ﴿إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ﴾ تقدیر ناکرێن ﴿وَقُلْ﴾ یا أیها الرَسول! ﴿رَبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ﴾ دەوام کە لەسەر ئەو دوعایە، با ئەوانە إستِهزا بکەن، وە بخەنن، خوایان لە بیر بچێ!! إلاهي ڕەحمێ بە ئێمەو بە أمّة! نَرجاة و حِمایَةً لە شری فَجَرَ! آمین.

بزانە برادەر ئەمن (کیف)م لەگەڵ (معانی) (مختلفە)و (إحتمالات)ی (نحویە)و (روایات)ی نا (مُناسبە)، (قرائات)ی (شاذە)ە نیە؛ (عبارەت)ی خاوێن، (معنای) (دقیق)و (لطیف)؛ (معقول)و (مقبول)، (حاجەت) بە چیتر ئەمینێ؟ (حاشا). وەلەکەم جێ جێی (سبب)ی نزول ئەبێتەوە، وە(حتّی) لە گەڵێ جێ (ربط) نادرێ، بۆیە کەم (رعایەت)ی (سبب) ئەکەم؛ ئیتر (عذر)و (قصور)م زۆرە (مدار)ی (أعظم) (زمان)ی تەنگ و دڵتەنگی یە؛ هاوار (یا أرحمَ الراحمین)، تەواو بوو (تفسیر)ی (سورە)ي (مؤمن) (سورە)یی (فلاح) لە (١٣٥٧هـ ق) (١٩٣٩م) خوا (توفیق)مان دا بە (ڕەحمەت). لە سبەینێی

(خمیس) (٥) ماهی ذی الحجة؛ (٢٦)ی (کانونی ثانی) (أفرنجی) وە لە ڕۆژی جمعە (بعد الصلاة) دەست پێ کرا بە (تفسیر)ی (سورەت)ی (اَلنُّور) ناوێ زۆر (لایق)ە، گەلێ (موافق)ە، ئەو(نور)ە، وەکی (ڕۆنتکین) (نفوذ) لە (ظاهر)ی ئەکا، هەندێ (غشّ)و (موادی) (أجنبیە)ی پێ (درك) ئەکرێ؛ تا(مؤمن) (فائز)ی (سعادەت) مەندو (نائل)ی (فلاح)و (مسارع)و (مسابِق)ی (إلی الخیرات) وە(للخیرات) بن؛ خۆیان بپارێزن ڕێ بە (أمور)و (أقوال)ی (لغو)؛ (فضل) لە (وقائع) و (فحشیّات) نەدەن. (زمخشری) ئەلێ: "(آیات)ی (٦٤)ە، پاش (سورە)ی (حشر) (نازل) بوە؛ بەلێ (حادثە) سوای (حادثە) (واقع) ئەبێ، (أمّا) (مناسبە)ی لەگەلێ نیە. (نظم)ی (جلیل) وا (إیجاب) ئەکا، لە (مکان)ی (مناسب) (إیراد) کرێ؛ دیارە (مدینە)؛ (قرطبی) (آیەت)ی (یا أیّها الذین آمنوا لیستأذنکم...ألخ) (إستثنا) ئەکا؛ (کیف)ی خۆیەتی، لەسەر ئەم فەرمایشە (معطل) نین؛ لە (مجاهد) (نقل) ئەکەن (نور) وبینی (هدایەت) فەرموویەتی: "(سورە)ی (مائدە)ی فێری پیاوتان کەن؛ (سورە)ی (نور) فێری ژنتان کەن" بەلێ (سورە)ی (مائدە) شایانی (رجال)ی (کَیاسَە)و (سیاسەت) و (قواد)ی (حرب)ە؛ (سورە)ی (نور) بۆ هەربوولا (نور)ە؛ (لکن) (بِنا) لەسەر (جامع الصغیر) ئەو (حدیث)ە (مُرسَل)و (ضعیف)ە؛ (إنسان) هەرچەندێ چاوتیژ بێ؛ شتی وورد ببینی، (إحتیاج)ی بە (نور) هەر زۆرە. چەند (آیات)ی هەیە، لە (سورە)ی (نور) (کأنّە) (إشارە) ئەکەن، بۆ (قبول)ی (دوعا)ی (رسالەت) پەناە، کە لە (آخر)ی (سورە)یی (سابقە)، (عرض)ی بارەگاهی (کبریائی) کرد؛ ئەو (رابطە)مان لە (نەیسابوری) وەرگرت، (ڕەحمەتی لێ بی)؛ (فی الحقیقة) ئەگەر (کمال)ی (ڕەحمەت)ی (إلە)ی نەبا، (سبب) بە (قول)ی (خبیث)ی (أفّاك)ی (أثیم)ی (زنیم) ئەبا وەکی (برائەت) ئەو (سورەت)ەش بێ (بسم الله الرحمن الرحیم) (تصدیر) کرابا؛ (حقّاً) (إفك)ی ئەو (أفّاك)انە، لە

(نقض)ی (عهد)ی (مشرك)آن بەدترە، وەزیاتر (موجب)ی (غضب)ی (إلە)ی یە.

## سورەتی نور

﴿بسم الله الرحمن الرحیم﴾

﴿سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا﴾ (سورەت)ی گەورەیە ناردومانە؛ (فرض) بە (مفروض) لە (فرض)ی (مصطلح)ی (شرع)ی (تفسیر) کەین، (یعنی) ئەو (أحکام)ەی تیایەتی (فرض)مان کرد، لەسەر هەمووتان؛ (حتّی) (رسول)؛ ئەمە (نکتە)یە جوانە، لەبەر (أمر) بە (حَد) یا بە (بیان)، وەکی لە (إبن عباس) (نقل) کرایە یا بە (قطع)و (حَز) کە (معنا)ی (لغوی)یە، (تفسیر)ی کەمەوە. (سورت)ێکە لە (طرف) خوای (بیان) کراوە ﴿وَأَنزَلْنَا فِيهَا﴾ لەو (سورەت)ە دا ﴿آيَاتٍ﴾ (مُتعدِّد) ﴿بَيِّنَاتٍ﴾ ئاشکران؛ (أنَّهُ) (بدیه)ین (بیان)ی (نظریات)یان پێ ئەکرێ، ئەبنە (بُرهان) ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ تێ(فکرین)و (تأمّل) لە (قرآن) لە (مُنَزِّل القرآن) لە(مَنْ أنْزِلَ عَلَيْهِ القرآن) لە (لما أُنْزِلَ فيهِ القُرآن) لە (لما أُنزِلَ لَهُ القُرآن) لە (إیمان)آ، لە (مقتضی)ی (إیمان)آ؛ (مع الأسف) لە (شوم)ی (إفك)، پاش (إیمان)ی (مُوجِب)ی (فوز)و (فَلاح) کەوتینە (باب)ی (لَعَلّ). ﴿الزَّانِيَةُ﴾ هەر ژنی بێ، (ولَوْ العیاذُ بِالله) (سیّدە)ی (سیّدات) بێ ﴿وَالزَّانِي﴾ (کذلكَ) (وجە)ی (تقدیم)ی (زانیە) وابزانم (معلوم) بوو. ﴿فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾ (أَلْ) بۆ (إستغراق) ئەبێ، (وکذا عهد) و (کذا) (تعریف)ی (جنس)، بە (مقام) ئەگۆڕێ. (شربتُ الماءَ) دیارە بۆ (إستغراق) نیە، (وکذا) (لَبِستُ الثَّوْبَ). ئەوی (صِدق)ی (عنوان)ی (زانی) لێ هات – چ مێ، چ نێر– هەریەکە سەد داریان لێدەن. وە(ضروری)یە (قضیه) کە (عام) بوو لە (إفراد)، (شمول)ی (زمان)و (مکان)ی دێ؛ یاخود بلێنن:ــ ((مستلزم)یەتی)؛ (عام) (صیغه)یی

(خاص)ی هەیە؛ (صیغە)یی (عموم)ی هەیە؛ چەندن، وەچی و چین؟ لە (أصول) (بیان) كراوە، بە (طول)و (تفصیل). لە (كُتب)ی (تفسیر) لام وایە، زۆر بە كەڵك نیە. ئێستا (حدّ)ی (زانی) نەماوە –(خصوص)– ئەگەر بە (رضا)ی (طرفین) بێ، (حكومات)ی (متمدّن)ە –علی كیفهم– (مسامحە) ئەفەرموون لە (قانون)یان، (جزا)یان دانایە؛ ئەگەر (وَلِی) یا (زوج) (مراجعە) نەكات، هیچ كەس (حقّ)ی نیە. (بناءاً علیە) ئەمڕۆ (مجادلە)ی (مجتهدین)آن لەسەر زێدەیی (نَفی) ساڵەكی (نفیاً وإثباتاً) زۆر بە (مُحتاج إلیە) نابینم؛ آیا زێدەیە لەسەر (نصّ) یان نا؟ زێدەیی (عَلی النّصْ) (نسخ)ە؟ (نسخ) بە (خبر)ی (أحاد)ی بە (قطع)ی (قبولَ) ناكرێ؛ (بالطول والعرض) لە (كتب)ی (أصول)ی (ذكر) كرایە؛ (لواط)ە وەكی (زنا) (حدّ)ی هەیە، یان نا؟ وە(حدّ)ی چیە؟ (فیه خِلافٌ). (فی الحقیقة) گەر من دەسەلاّتم هەبا، چ بە (قَول) چ بە (فِعل)، (شدّەت)م بۆ (منع) لە (لواط)ە زێتر ئەدا؛ (أوّلا) (قطع)ی (سبیل)ە، لە (إختلاط)ی (أنساب) (فاسِد) ترە؛ (ثانیاً): (إمحا)ی (بشریەت)ە بەو (حال)ە (معاذ الله) نێر، نێری نامینێ، كەڵكی (هیئەت)ی (إجتماع)ی ناگری، (مُحقَّر)ە، نەرمە، لە (أنوثەت) نەرمتر ئەبێ، بۆ هیچ دەست نادا؛ (دین)ی (إسلام)و (قومیەت) ئەیەوێ (رجال) پێ بگەیەندرێ ﴿وَلاَ تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا﴾ (زانیە)و (زانی) ﴿رَأْفَةٌ﴾ (رقّەت) و (مرحمەت) ﴿فِي دِينِ اللَّـهِ﴾ كە ببێتە (باعث)ی (رفع)ی (حَدّ) یا (تهوین)و (تخفیف)ی؛ (ڕەحم)یان پێ مەكەن، (رأفەت)و (رقّەت) بەوان ئێوە نەگرێ ﴿إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّـهِ﴾ (وَإنّهُ خیر الراحمین) ﴿وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ (إیمان) لە (قضا) ئەخوازی، (مؤمن) پاك بێ، ئەگەر خۆی (ملوّث) كرد، خێرا پاكی كەنەوە؛ بۆ (حفظ)ی (نظام) و (عیش)ی (عموم)ی، (إیجاب) ئەكا (إیفا)ی (حدود) بكرێ، ڕێی (سیّئات) ببەسترێ. ئەمڕۆ تەماشای (أنام) كە (فحشیّات)ی (دنیا)ی داگرتیە، (عمومخانە) (تعمّم)ی كردیە ﴿وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەمە لە (حدّ)ەكە (قوی) ترە، بۆ (منع)و (سدّ)ی

(فحشيّات)؛ مەگەر لە هەموو (حيا) (تجريد) كرابێ. (حضور)ى (طائفه)يە لە (مؤمن)، (موجب)ى (خجالەت)و (إنكسار)و شەرمازارێى گەورەيە. (أمّا) دووسێيە، (موجب)ى (خجالەت)ى (هكذا)يى نيە؛ مەگەر (إعتبار)ى كەن لە (رجال)ى (عظام). (طائفه) ـوَلَوْ (إطلاق)ى لەسەر (شخص)ى (واحد) بكرى، بە (إعتبار)ى (معنا)ى (طواف)و (دوران) (لكن) وەك (شافعى) ئەفەرموێ، بە (مواقع) ئەگورێ (مقام) (شاهد)ە لە(بعض)ى (مواضع)، بە يەك و دوو (إكتفا) ناكرێ. ئەمە (جزا)ى (بِكْر)ە لە (طرفين)؛ (أمّا) (جزا)ى (غير)ە (بِكْر)ە لە (حديث)و (سنّەت) (رجم)ە؛ (رجم) (حتّى) بۆ (بَهيمه) لە (تورات) دا هەيە. نازانم (أمر) بە (رجم)ى (بهيمه)و (فاعل)ى چۆن لە (رسول) وەرگيرايە؟! ئەبێ (دخل)يكى (إسرائيلى) تيا نەبێ؟ ﴿الزَّانِي﴾ (حدّ)ى (إجرا) كرابێ، يان نا ﴿لاَيَنكِحُ إلاَ زَانِيَةً أوْ مُشْرِكَةً﴾ (أنّە) (ميل)و (طبع)ى وايە، (كيف)ى بە (زوجە)ى (طاهره)ى(مؤمنە) نايە؛ (زانيە)و (مشركه) (نكاح) ئەكا؛ يا بە (عقد)ى (مُتعەيى)، يا قەپاتمە ﴿وَالزَّانِيَةُ﴾ نافەرموێ: (لا تنكحوا إلاّ زانياً أو مشركاً) بەڵكو ئەفەرموى: ﴿لاَ يَنكِحُهَا إلاَّ زَانٍ أوْ مُشْرِكٌ﴾ (إشاره) بۆ ئەمە، ئەو (مَيل)ى (نكاح)ى نيە؛ وەكى قەحپەيى ئێستا، بە (مقدار)ى پارە، لەگەڵ هەر كەسێ بێ، هەلاوتيكى بكا ﴿وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ (الذينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حافِظُونَ إلاّ عَلى أزْواجِهِم)، بۆيە لەوێندەر (طاهرات)مان نووسي! دەبا أخَسّي جَزا عَلاوه بكري بۆ زاني وزانيه، حيرميان كەن، مُزاوَجەيان لەگەڵ نەكەن. هەر مەلايان لێرە بە إضْطرابن، أمّا هيچ جێى إضْطِراب نيە، هەرچەند موسوڵمانان عَمَليان پێ نەكرديە، أمّا مَنسوخيش نيە! وەلە ضَرب و شُهود أبْلَغ ترە بۆ سَدّي فَحْشيّات! قيمەتى ئەو آيَتە ئەمرۆ ئەزاندرێ! بێ مبالاتي دونياى سەراسەر كردە كارخانەچى! لە مَدايني بە حَضارەت، زواجي مَشروع كەم بووە! نەنێر نەمێ، خۆيان ناهاوێنە شەڕى بارو تَكاليفي ژن و مێردايەتى، مُقيَّد نابن بە حقوقي يەك، زواج بە مُنافي حوريەت ئەزانن! حَتّا بَعضە دووەل

ئەترسیٚ، نفوسي له تَناقُض دايه. حَقّاً مؤْمن ئەبیٚ بە غیرەت و بە شەرەف بیٚت، بە گویٚرەی تعديلاتي شَرع، مُقتَضای طَبعي بیٚنیٚتەجیٚ! حُريّەتی حَسَن، بیٚ ضَررو بیٚ وَقاحَەو سوءِي آدَب وأخلاق و مُعاشَره، حەقی مؤْمنه ! ئەوی تابِعي هەوا ئەبیٚ، خۆی بە مُطْلَق ئەزانیٚ، نا ! نا ! ئەسیره ! ئەسیریٚ حالٚ ناخۆش! مواردي وايه هەوای خۆي نەشكێنیٚ له مَصالح و مَعاليدا ! (حەزرەتی شیٚخ قادری طالَباني رەحمەتی لیٚ بیٚ له غەزەلەكی توركی خۆي ئەفەرموی:

(هَواو حِرْصي نَفسه، أكلە، شُربه، فاكِذا قُلْنَ أوتان بنْجه إيش تله ديمه حُرّيَتم واردر).

ئەمرۆ مَعَ الأسف مەیلی أجْنَبِيّات لەناو شُبّانی إسلام زۆر بووه، وەمؤْمِنەش واي لیٚ دیٚ! بەلاّم أجْنَبيەكان مەيليان ناكەن!. ناشُكری نەبیٚ كەچی رَسولەكانی عَصر، خصوص رَسولي سَلام، چيان نەكرد! حُروب و شَقاوەت و سَفاهَەو دَناءَةو رَزالَةْ، خُلاصه بەدي بە جَميعي مَعْنا، له سايەی (بابي) و (قادياني) له زيادي و طُغيان دايه ! سَماحَتي مَسيحی قيوداتی شكاند، شەرەفی بَشَری پامالٚ كرد، غیرەت و ناموس مەحو! نازانم (سَيّدی آلوسي) بۆچی هەر ئەتۆرێتە كُتُبی قَديمه؟ تەماشاي صَفَحاتي آيامي نەكرديه؟ لەو زەمانيش سَفاهَة له ظُهوردا بووه! گەرچی ئێستا شَعْشَعەی ئەندازي آفاقه !.

پێغەمبەریٚ ئەوه كِتاب و حُكمي بیٚ، تَصَوّر ئەكریٚ بە شَخْصي عَرضي بكا، ژنی دەستی كەس دەرناكا، يَعْني ئەوەی إرادەي فُجور بكا لەگەلي، مَنْعي ناكا، بفەرمویٚ: لای خۆت إمساكی كە! طَلاقی مەدە!.وَتَوجيهي ئەكەن، مەبادا خۆی لەگەلّی تووشي زنابیٚ! — توخوا ئەمه قسەيه؟!— زاتیٚ وەكي (إبنُ حَجَر) له (تُحْفه) ئەو حكايەته بكا مَعَ التَّوجيه، خەلّكی بلیٚ چی؟ مَعَ أنَّهُ لەگەلٚ آيَتي قَذْفِ زَوجه، آبَداً رێك ناكەویٚ! ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ﴾ دەسەلاتم هەبا ئەمووت عامَّه له مؤْمِنه وكافِره، ئەوانيش گەلێكیان بە ناموسن! خاصَّةً ئەوانەی له قەلادان، قەلای دین! قەلای شەرەف! قەلای خانەدانی وأصلی ونَبيلي، قەلای مَحفوظي ومَعَصومي! الله أكبر له جَسارەتی بَشَر، في (الحَقيقه

سَريعاً بۆ سوٕي ظَن، بۆ إفترا، قسەى ناشيرين باوێن، بۆ صَوٚبي ئەمانەى كە لە هەمو جِهەت بە صەد هەزار دەرەجە لەوان فائقت! لەبەر ئەو جسارەت و سوٕي أدَب وظَنّ و خَلاعَتە نيە، جەنابي حەق بۆ إثباتی زِنا، إعتبار بە كەمتر لە چوار شاهدْ ناكا!!! ﴿ثُمَّ﴾ بَعْدَ الرَّمي. ﴿لَمْ يَأْتُوا﴾ ئەو حرف ئەندازانە! ﴿بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ﴾ مَقبول الشَّهادە. ﴿فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً﴾ فەرقى لەگەلْ حَدّي زِنا بە خُمسە! (إمامي رازي) و (نيسابوري) و (سَيِّدى آلوسي) لەو چەند آياتە زۆر تفصيلات ومُخالَفاتي مُجْتَهيدينيان تَحرير و تَقرير كرديە! لام وايە لە خَيْطي تَفسير دەرچووين! وەكەس شُبهەى لە إحاطەى عِلميان نيە! بەلّام مَقامي تَفسير جوايەزە! ئەو مُخالَفات و مُشاجَرات و مُناطَحاتە، جێی فقە و أصول وجَدَلە! ﴿وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً﴾ حَتّا فيما يَقْبَلوُن فيە النِّساء! ﴿أَبَدًا﴾ غَيْرَ مُقَيَّدٌ بِوَقتٍ أو حُكْمٍ! مُقابلەى لەگەلْ ( وَلْيَشهد عذابهما طائفة من المؤمنين) چەند لَطيفە! ئايا لازمە ئەوە بَعْدَ الْحَد بیٚ؟ گەرچی ئەلّێن لای (إمامی أبو حَنيفە) وايە، أمّا ظاهري قَولي (شافعيّە) كە قَذف إثبات بوو لە شاهدي ئەكەون! ﴿وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ قبولْ نەبوونی شهادەت مَعَ التَّنصيص عَلى الفِسق، بۆ أربابي خۆي، رادِعى قَويە!! سُبْحانَ الله لەو عَصرە كە فِسق تَعَمُّمى كرديە، حَيا كەم بووە، فاسِق كە تَصَوُر بكا شايەدي قُبول نابیٚ، شەرم ئەكا وە مُتَأثّر ئەبیٚ، إظهاري شايەدي خۆی ناكات! (قَذْف) حَرامە؟ كَبيرەيە؟ مَعَ تَفصيلٍ فيە لە جێی خۆی گوتراوە! أمّا هەندیٚ قَذف كُفرە- العياذُ بالله- ﴿إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَٰلِكَ﴾ دواي ئەو أمرە شنيعەو إقامەى حَدّ! ﴿وَأَصْلَحُوا﴾ ظاهِر و باطِن. ﴿فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ تَوبەى قُبول ئەكات، ئێوەش بَعْدَ ذلك شايەدى قُبول كەن! أمّا حَدّ، فَلايُرَد! إستِثناء پاش جُمَلي مُتَعاطفە ظاهِرە لە عَوْدي إلى الكُلْ، يا ظاهِرە إلى العَود إلى الأخير؟ (إمامی شافعی) ئەفەرموێ: إلى الكُل ظاهِرە! (إمامي حَنَفي) ئەفەرموێ: إلى الأخير. ئەگەر قَرينە بوو لە عَوْدي إلى الكُلْ، يا لە عَوْدي إلى الأخير، گەلەكيان موافقن! قسە لەوەيە مانِع و مُرَجّحْ نەبیٚ! خُلاصەى ئەمەيە (إمام) و (سَيِّد) بە طُول وتَفْصيلي زۆر مَشغول بووين!

(بَيضاوى) بە رەحمەت بێ چاكترى كرديە، خۆى خەريك نەكرديە، ئەگەر نُبْذەىٚ ذكر بكرىٚ، باشە! أمّا لە تَفسير دەرچوون خۆى نيە! لە مَوْقعي خۆى ذكر كرايە، يەكى مَعْناى آيتي لە سەر نەكردوە. ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ﴾ ژنى خۆيان، ئەوىٚ پێشى (مُحصنات)ى (غير)ە، ئەوە ئى خۆيانە لە (حديث)ى (سعد بن عُبادە) وادەر ئەكەوىٚ؛ (أصحاب) لە (محصنات) (عموم) يان (فهم) كرديە. (سعد) (عرض)ى (رسالەت پەناه)ى كرد، "ئەوها (نازل)بوە؟" (جناب)ى (نبوى) فەرمووى:"(يا معشرَ الأنصار) گوێتان لىٚ يە. (سيد)ى ئێوە ئەلێ چى؟" (أنَّهُ) (شُبهە)ى هەبى لە (حكم). (عرض)يان كرد: (يا رسول الله) (لۆمە)ى مەكە "دوايە (سعد) فەرمووى:" (واللهِ يا رسول الله) ئەزانم (حق)ە وە لە (طرف) خوايە؛ (لكن) (تعجب)م كرد. ئەگەر ببينم (لَكّاع)ى پياوىٚ، لەناو رانيەتى، بۆم نەبى (تهيج)ى كەم، (تحريك)ى بدەم، تا چوار (شاهد)ان ئێنم؛ (والله) ناگەم بيان هێنم، ئەو لە خۆ ئەبێتەوە!" زۆر نەچوو (هِلال بنى أمية)ە هات؛ وتى:" (يا رسول)، هاتمەوە مالێ؛ پياوەكم ديت، لە كن ژنم بوو؛ وام ديت" (أنصار) وتيان:"ئەوا تووشى (مقالە)ى (سعد)ى بووين؛ (ألان) پيغەمبەر لە (هلال)ى ئەدا، (شاهد)ى (إبطال) ئەبىٚ لەناو (مسلمان)آن." (هلال) ئەلێ:"وتم، ئومێد وايە، خوا چارەكم بكا" كەمىٚ پىٚ چوو (وحى) (نازِل) بوو، ئەو (آيەت)ەهات؛ ووتيان:"ئەمە باشە"؛ بە ئەم (آيەت)ە زۆر (مسرور) بوون.

لە (كشّاف) دەلێ:" پێغەمبەر كە (آيەت)ى (قذف)ى بۆ (نازل) بوو، لەسەر(منبر)ى خوێنديەوە (عاصم بن عدى أنصارى) گوتى:" خوايە قوربانت بم، ئەگەر پياوى لەگەلٚ ژنى خۆى پياوەكى ديت، ئەگەر (خبر) ئەدات، دارى لىٚ ئەدەن، (شاهد)ى (رد) ئەكرىٚ، بە (أبد)ى، وە (تفسيق) ئەكرىٚ؛ ئەگەر بە شير لىٚ ى ئەدا؛ ئەى كوژنەوە؛ ئەگەر (ساكت) ئەبىٚ، لەسەر خەفەت ئەمێنى؛ وە تا ئەچىٚ، چوار شاهدان ئێنى، كابرا لە ئيشى خۆى بوويتەوە؛ (اللَّهُمَّ افتَحْ)."

(حاصل)ی ئەوانەی (نسبەت)ی (زنا) بۆ ژنی خۆیان ئەدەن ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُسُهُمْ﴾ هەر خۆیان ئاگایان لێ بوە، کەسی تر نـا ﴿فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللهِ﴾ (كأنَّهُ) چوار (شاهد) ئەڵێن: (أشهدُ بالله) ئەمـە وایـە ﴿إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ﴾ لە ڕاست گۆیانـە. بـەڵێ (أشهد بالله إنّی لَمِنَ الصادقین) لـە ڕاست گۆیانم ﴿وَالْخَامِسَةُ﴾ (شهادە)ی پێنجەم ﴿أَنَّ لَعْنَةَ اللهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾ (لعنەت)ی خوای لێ بێ، ئەگەر لە درۆزنان بێ ﴿وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ﴾ (دفع) ئـەکا لـە ژنەکـە (عذاب)ی ئـەو (عذاب)ە چیە؟ (ظاهر)ی دارە؛ چیدی (ذکر) نەکرایە چ (دفع)ی (عذاب)ی لێ ئەکا؟ ﴿أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّـهِ إِنَّـهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ﴾ "(أشهد بالله) لە درۆزنانە، درۆی ئـەکا؛ من پـاکم، (بَری)م لـەو تۆمەتـە" ﴿وَالْخَامِـسَةَ أَنَّ غَـضَبَ اللَّـهِ عَلَيْهَـا إِنْ كَـانَ﴾ مێردەکـەی ﴿مِـنَ الـصَّادِقِينَ﴾ خـوا لـە (کاتـب)ی (روح المعـانی) خـۆش بـێ، (سـهواً) ؛ (مـن الکـاذبین)ی (طبـع) کردیـە. دیـارە لـە (خطـأ)ی (کاتـب)ە، (حاشـا) (خطـأ)ی (سـیِّد) نیـە. لێـرەش (إمـام) و (سـید) (خلافیّـات)ی دوورو درێـژ (إیـراد) ئەفەرموون،(وَمَنْ شاءَ فَالْیُراجِعْها) ﴿وَلَوْلاَ فَضْلُ اللهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ﴾ (فضل) و (رحمـەت)ێ (شـامل) و (کامـل) ﴿وَأَنَّ اللَّـهَ تَـوَّابٌ حَكِـيمٌ﴾ (جـواب)ی (لَـوْلا) (مَـتروك)ە؛ ئەوەنـدە (أمـر)ێ (عظـیم)ە، زوبـان نـای هێنـێ. (زمخـشری) ئەفەرموێ:" (وربَّ مَسْكوتٍ عَنْـهُ أبلَـغُ مِـنَ الْمنطـوقِ بِـهِ) (واقعـاً) وایـە، (أمّـا) ئەوەی (تقدیر) ئـەکرێ، ئـەبێ (مناسـب)ی (مـدخول)ی (لَـولا) بـێ ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالإِفْكِ﴾ (إفك) (أصلاً) بە (معنا) (قَلب)ە (حقیقـةً) وایـە، ئـەوی (إفـك)ی ئـەکا، (مقلـوب)ە خـۆی وایـە؛ لـە (جهـەت) لای ئـەدا، وەری ئـەگێڕێ؛ ئـەوە (فـوق)ی (رَمـی) (مُحـصنات)ە؛ (فـوق)ی هـەموو (قبـایح) و (وقـایح)ە؛ درۆ و (إفترا)یە. (إلهی) وە (سیِّدی)، چ بڵێم؟ وە چ بنووسـم؟ (قلـم) (موافقـە) ناکـا، دەستم ناڕوا، دڵم تەنگ ئەبێ، سینەم وێك دێ، فکرم تێـك ئەچـێ، تـەزووم بـە (بدن)ی دادایێ، مووچڕك لەسـەر مووچڕك، وەك بروسـکە بـە (أعـضا)م دادێ و

ئـەڕوا؛ کـە (خیـالّ) لـە (مخزونـی)و (مغمـومی) و (مکـدّری) و دڵـسەختی، (حـضرەت)ی (رسـول) (مُجتبـا) ئەکـەم؛ مـەدهۆش ئـەبم، لـە خـۆ ئەچـم! کـە ئەتۆرمە (صدّیق)ی (أکبر) و (حرم)ی (محترم)ی، له چ (ماتەم)ێ دان؛ (دنیـا)م له (نظر) تاریك ئـەبێ، بـە (قـدر) نـووکی دەرزی رووناکی لـە دڵـم دا، نـامینێ؛ ناتوانم گوێ له (تغرید)ی (صدیقه) راگرم، کـەتك تکی فرمێسکی دێتـه گـوێم، ئەگریم، فرمێسکان ئەرێژم. دوێت و کاغـەز و (کتـاب) نـابینم؛ کـە (تـصوّر)ی (برودەت)ی (مسلّمان)ان ئەکەم وەختە ببم بە شەختە، هەناسەم سـارد ئـەبی، له (عالم)ی (بشریّەت) (مـأیوس) دەبم؛ ئەچـم بـۆ مزگـەوت ئـەبینم (رسـول)ی (أکرم) لەسـەر (منـبر) (شـکوا)ی حـاڵی خـۆی لای (مـسلّمان)ە (صـادق)ەکـان ئەکا، (سعدی بن عبادە) گوێیا (غیرەت)ی (قوم)ی ئەی گرێ، لەسەر (ملعون) (کذّاب)ی (أفاك)ی، (خائن)، (مارق) (مُنافق) دێتـه (غـیرەت) و (مُـدافع)ە؛ لـەو (وەقت)ە (مسلّمان)آن، تێك هەڵئەقرژێن (رسـول الله) لەسـەر ئـەو (مـأیوس)یـە، لێکیان ئەکاتەوە، (تسکین)ی (هیجان)یان ئەکا، جا بۆ بێ کەسی بێ (ظهـیری) و بێ (نصیری) پێغەمبەر؛ هاوارو داىو فغان ئەکـەم؛ لـە چۆکی خـۆم ئـەدەم. (إلهی) و (سیّدی): وابزانم ئەگەر ئەوانە (مثقـال)ە (ذرّە)یـە، خانـەدانیان بوویـا دەر (حـق)ی ئـەو (ذات)ە (أقـدس)ە، ئـەو خانەدانـە (عـالی)یـە، ئـەو (بیـت)ە (رفیع)ە، ئەو (حِـصن)ە (حـصین)ە، ئـەو (دُرّە) (مکنـون)ە، (مـصون)ە، ئـەو (هَذیان)آنەی نەدەکرد. ئەوەی نەختێ (إیمان)ی بە پێغەمبەری هەبێ؛ چ جایـە خێزانـی، خۆشەویـستی، هـەمخوابی، هەمـدەم و هەمنۆشـی، (رەفیـق)ی (خلـوەت)و (حیـات)ی شوشـەیی (نـاموس)ی؛ دەربـارەی (جاریـە)یـە، نـە (جاریە)یە، آفرەتی (دون)، کـە گـەهگاه بێتـە ئـەو (بیـت)ە، سـایەی خـانوویی (محمد)ی بکەوێتە سەر، قسەیە سووك ئـەکا؟! کەسـێ هەنـدەك (إخـلاص)ی ببێ، چ جایە (إنسان)ێ، کە بەبـەر ئـەو دەرگایـەیا، بڕوایـی؛ سـەگی ئـەو بـەر دەرگایەی لا بە حورمەت ئەبێ،

(پایی سەگ بوسید مجنون خلق گفتندرا إین چی بود؟
گفت: این سەگ گاه گاهی کوّي (لیلی) رفته بود)

(ألحق) ئەوەی دەربارەیی (زوجات)ی (محمد)، (بنات)ی (محمد)، (خدم)و (حواشی) (محمد)؛ زوبان بە سووکی ببزێوی، بێ ناموسە، بێ (شرف)ە، سوك و چروکە، (جلف)ە (سفیل)ە، (لئیم)ە، فرۆمایە یە، بەد (أصل)ە، بەد گەوهەرە، پوشتە، (مخنّث)ە، لە سەگی گرویّ کەمترو گلاّوترە. وای چەند دوور بوو، لە (عالەم)ی (إسلامیەت)؟! ئەگەر دەسەلاّتم هەبا، ئەو (حکایەت)ەم لە هەموو (کتب)ی (دونیا) (مەحو) ئەکردەوە؛ وە(تفسیر)ی ئەو (آیەت)ەم بە (فرض)و (تقدیر) ئەکرد، وە(موضوع)یّ (خیال)م بۆ ئەدۆزیەوە.

ئەوانەی ئەو بوختانەیان هینا ﴿عُصْبَةٌ مِنْكُمْ﴾ عُصْبَة بە جَماعتێ دەلّێن لە (١٠–٤٠) دە–چل، لە (١٠) دە کەمتر، لە (٤٠) چل زێتر، عُصْبەی پێ نالّێن. ئەوانە بِنا لە کشّاف، (عبدالله بن أُبَیّه) رأس النِفاق، (زَید بنِ رُفاعە)، (حَسّان بن ثابِت) ئەوەی سابقاً ئەیفەرموو: (فَاِنَّ أبي ووَالدَتي وعُرضي لِعُرْضِ مُحَمَّدٍ مِنْكُم وِقاءٌ)، (حَمْنَةُ بِنْتِ جَحْش) تێی ناگات ئەو خوشکي هەوێی صدّیقە بووە! بۆ خاطری إکمالي عَصَبەی ئەلّێن: (وَمَنْ ساعَدَهُمْ!). بِنا لە تَقریری (روحُ المَعاني) عَصَبە بە کەمتریش ئەبێ، وە(زَیدی بن رُفاعە) لەو عَصَبەش نەبووە –یاخوا وا بێ!– خۆزي هەرچی شایەدی بە مُحَمَّدي هێنایە، داخلي ئەو عَصَبە نەبووبێ ونەبێ! زاتاً مَسأَلە لە عَصَبەیی تێپەڕی، تَشکیلی دەولّەتی (أموي) کرا، گۆییا أولادي علي وزَهْراء إحْیای عَدواەتیان کردەوە، بوونە باعِثي شکستي إسلام وتَفَرقەیێ کلّی! هەر کەس بە نَوعێ دواي طَماع ئەکەوێ! موسلماني صاغي بێ غَلّ و غەش لە دونیادا لە هەموو عَصران زۆر کەمن، وەتأثیری دین غایَة ضَعیفە، پێنج و دوو ڕۆژێ لەبەر بَعضە أسباب قووەتێ ئەنوێنێ، زۆر ناچێ زائل ئەبێ، هەرکەسە ئەچێتەوە سەر عادات وعَنْعَنات وتَقالید وأحوالاتي نَفسیَّەی قَوْي خۆی. خِطابي (مِنْكُمْ) بِنا بە إختیاری (سَیِّدی آلوسي) لەگەلّ ئەو مؤمنانە یە کە مُتَألِّمْ ومُتَأثر بووین. منیش لام وایە خِطابە

بۆ قَوم، بێ رِعایەتی عِنوانی إیمان، نَفیاً أو إثْباتاً! ﴿لاَ تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَكُمْ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ تَسلْیه، بۆ بێ دەسەلاّتان! یا ربِّي زۆر شُكُر راضیم بە رَضات، راضیم بە قَضات، هەرچی ئەتوو بیکەي خێرە، ئەوەی لە طَرَف خوایەوە بێ، چاکە! مُمْکنە بلێین جەنابی حەق تأمیني ئەوانەی مُداخَلەیان نەکردیە، ئەکا لە عَذاب. وە بۆ ئەوانەی مُدافَعە ئەکەن مایەی سَعادتە. ﴿لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ﴾ لە عُصْبە. ﴿مَا اكْتَسَبَ مِنَ الإِثْمِ﴾ شوومي سِرایەت بۆ ئێوە ناکا. واقعاً إفکي ئەوەندە گەورە بوو، ئەوەندە لای خوا گران وناخۆش بوو، لایەق بوو (مَدینە)ی غوْرکا. ﴿وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ﴾ لە عُصْبە، أکْثَری قُرّاء بە کَسْرِي کافیان خوێندیتەوە! حَتّا (إبنُ جَریر) قِرائَتي ضَمّي کاف، بەس بۆ (حُمَیْدی أعْرَجْ) ئەدا، وەفَرقي مأْخَذیان ئەکات (کُبْر) بە ضَمّی کاف بۆ وَلاو أنسابە.(نیسابوري) نِسبەتی بۆ (یَعقوب)ئەدا. لە (روحُ المَعاني) نِسبەتی ئەدا بۆ جَماتي عُصْبەیێ فَوْقَ العَشَرە، (حَسَن)، (زُهْري)، (أبورَجاء)، (مُجاهِدْ)، (أعْمَش)، (أبو البَرهَم)، (حُمَیْد)، (إبْن أبي عَبْلَةْ)، (سُفیاني ثَوري)، (یَزید بنِ قُطب)، (یَعقوب)، (زَعْفران بن مُقَسِمْ)، (عَمْرَةِ بِنتِ عَبْدالرَحمن)، (سورە) روایەت لە (کِسّائي) مَحْبوب لە (أبي عَمرو)ي بِنا لە دوو ڕوایەتە لە قُرّائی سَبْعة سێ وایان خوێندیتەوە (یعقوب)و (کِسّائي) و (أبی عَمرو)، ئەو قسە لەگەڵ قَوْلی (إبن جَرير) لێك دوورن، وە(إبنُ جَرير) لە قراءات شارەزا بووە، لە عُلَمای قَرْنی ثالثە! ئەو زاتە کێیە؟ خِلافیە! أظْهَر (إبنُ أُبَیّەی سَلولە) سەرداری مُنافِقان مُخْتَرِعي ئەو إفْکە خَبیثەیە. ﴿لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ خوا إنتقامیان لێ ئەستێنێ. لاشَك خوا لەسەر عِبادي خۆی بە جواب دێ! (مەلا خالِد)ی (کونە فلوس)ی حِکایەتێ مُجْمَل ئەکا لە حەق باپیرە گەورەم (مەلا عبدالرحمن جَلي) إفْترایان پێ کردیە گۆییا (شیعە)یە، حَتّا قَصْدی کوشتنیان کردیە، إخْتِفای فەرمووە، زۆر نەچووە إفْتِرای أعْدایەکاني ظاهِر بووە، خوا إنْتِقامي لێ ساندینە، خصوص یەکێ لەوانە کە تِلمیذي خۆی بووە بە دەردێ خراپ چووە! أمّا ناڵێ کێیە وەکێن! حَقیقةً ئەو إفْکە، مُصیبەتێ عَظیمي بۆ إسْلامەتی، شەڕێ گەورەی بۆ

أُمَّة بوو. باوەڕم ناکەم هیچ پێغەمبەری ئەو ترەزە جَفایەی لە چنگ أُمَّتي خۆي دیتبێ! ئەتوانم بڵێم (عُيَيْنه) (وَليد بن مُغَيْرة) (أبو جَهل) سائِری صَنادیدی قُرَیش، هەزار هێندە لەگەڵ حَضرەتي مُحَمَّدی دوشمن بان، دائِر بە عَرْض و ناموسي، هَذيانيان نە ئەکرد. (أبو سُفيان) کە خَبَریان داێ مُحَمَّد (أُمُّ حبيبە)ی مارە کردیە، لەسەر ئەو عَداوَەتە فخری پێ کرد. ﴿لَوْلاَ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ﴾ خِطابە لەگەڵ مُخاطبە کاتی پێش، ئەوانە داخِلي عُصْبە نەبووین، لە أهْلي إيمان. أمّا خطاب بۆ مؤمنەکانی تابعي رأْسُ المُنافقين، لام مُوَجّە نیە! ﴿ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا﴾ تەماشای نَفسي خۆیان کردبا وەکی (أبو أيوبي أنصاري)و حەرەمي -رِضواني خوايان لێ بێ- یَعني نەدەبا ئەوەی موسوڵمان بێ، تَوَقّف کا؟ دەرحاڵ کە بیستي بیستیان، ڕێ بە إشاعە نەدەن! ﴿وَقَالُوا﴾ تێکرا بِالإتفاق ﴿هَذَا إِفْكٌ مُبِينٌ﴾ حَقّاً لەو وجهەتەش بَعْضێ مُقَصِّرْ بوون. ئەبایە تردیدو دَغدَغە بە خاطِر نەدەن.

(قوم)ێ هەن، ژن ئەپەرستن؛ (أمّا) کێ ■ کچی بە (حسن)و (جمال)و (منتخب)و (ممتازە)؛ ئەڵێن: ئەوە (إله)ی (حُسن) بۆ خۆی (خلق) کردیە" بەو (ظن)و (تخمين)ە (هەیبەت)ی ئەو ئافرەتە، و(إقرار) گیر ئەبێ، لە دڵی (قوم)ەکە کەس بە (خیاڵ)ی دانایە، بە گۆشەی چاوی (خیانەت) تەماشای کا بەڵکوو (عبادەت)ی ئەکەن، وە خۆشی بە دڵیانایە، بۆ (بشر)ێ (تنزّل) بکا، خۆی بە دەستگیرانی خوای (حسن)و (جمال) (حساب) ئەکا؛ (أحد)ێکی لە (بشر) نایەتە بەر (نظر)؛ ئایا (حرمەت)ی (رسول الله) و (عائلە)ی (رسول الله) ئەوەندە لە دڵان جاگیر نەبوو؟ کە (مسارعە) بکەن، بۆ (مدافعە).

(حجاب)ی هەیە لە (بین)ی نێرومێ، (ولو) لە (طبقات)ی (عالیە)ش نەبن. (إنسان) (حتّی) لە (عائلە)ی خۆی شەرم ئەکا؛ بێ (مقدّمات) هەڵی کوتێتە سەر. لەگەڵ یەکی (أجنبی) (خاصّةً) (صاحب)ی (سطوەت)و (هیبەت)و (عظمەت) -(مادّی)و (معنوی)- چۆن جسارەت ئەکا؟ چۆن بە (وهم)و

(خیاڵ)ی دادێ؟ (الله) ئەمە چی بوو؟! خوایە خۆت ئەزانی؛ ئەو (عُصبە) لە هەموو (مزایا) رووتن؛ چ جایە (إیمان)؛ (أثر)ێکیان لە (نجابەت)و (شهامەت)و (بشری) نەبوە؛ تف لە (إنسان)ی نا (نجیب).

(یوسف) (علیه السلام)، خانەدان بوو؛ لەو (موقع)ە لەو (خلاعەتە) کە (إمرأة العزیز) نواندی؛ وتی: "(معاذ الله) (إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ)" چۆن (شرف)ی (سید)ی خۆی (صاحب)ی چاکەی (محافظە) کرد؟ (سیادەت)ی (رسول) (نعمەت)و چاکەی (رسول الله) لەسەر (مؤمن)آن بە هەزار (درجە) لە (فوق)ی (سیادەت)و چاکەی (عزیز) بوو. (رعایەت)ی ئەو (سیادەت)و (نعمەت)ەیان کرد. بە بوختانی وا (عظیم)و ناشیرین وبی (معنا)، ئەو (رزیل)و (دنّی)و (سفیل)آنە (مقابلە)یان کرد. جا (إنسان) چۆن ئومێدی بە (إصلاح)ی (بشر) ئەبێ؟! بنۆڕە ئەمە: لە فەرموودەی (صدّیقە) وادەرئەکەوێ پاش (سورە)ی (أحزاب)و (آیەت)ی (تربیە)یی (عائلە)یی و (حجاب): بەو (حُجّە)یە بووە" لەو (تربیە) لەو (حجاب)ە، ئەو (عُصبە) وەریان گرت. ﴿لَوْلاَ جَاءُوا عَلَيْهِ﴾ لەسەر (ما بە الافك) ﴿بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ﴾ (تعلّق)ی (زنا) بە دووانە، وە (جزا)ش بۆ دوانە؛ بۆیە چار (شاهد)ی پێ ئەوێ. (أنّە) دوو بۆ لای نێر، دوو بۆ لای مێ؛ جوانە! ﴿فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ﴾ نیە، نەیەك نە دوو، شتی (غیر)ە (واقع)ی گوێیا (شاهد)ی لەسەر ئەدرێ؟ ﴿فَأُولَئِكَ عِنْدَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾ ئەبێ لای ئێوەش وابن ﴿وَلَوْلاَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ﴾ بە سایەی (رحمةً للعالمین) ﴿فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾ بە (صنوف)ی (نعم)و (قبول)ی (توبە) ﴿لَمَسَّكُمْ﴾ هەمووتان: (برّ)و (فاجر) ﴿فِي مَا أَفَضْتُمْ فِيهِ﴾ بە سبب ئەوەی زوبان ناتوانی (تصریح)ی پێ کات ﴿عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (مُدمّر)، (مُدمْدَم)؛ ئەوە لەوە (مُصارعە) بۆ (أخذ)ی (فدیە)ی (أُساری)ی (بدر) گەلێ گەورەتر بوو، لە (سوء)ی وە(شوم)ی ﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ﴾ ئەو زوبان لە زوبانی بێ (محاکمە) وەری ئەگرێ. ﴿وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُمْ﴾ بە زاری، یا پڕ بە زاری ﴿مَا لَيْسَ لَكُمْ بِهِ

عِلْمٌ﴾ چ جایە علم؛ (ظنّ)و (وهم)و (شك)و گومـان نیـە؛ ﴿وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا﴾ سووك، بێ (أهیمەت)؛ (أنَّه) قسەیە (عادی) لەسەر زوبان لـە (بَین)آ، (جریـان) ئەكا ﴿وَهُوَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيمٌ﴾ خوایـە كـە (كائنـات) بـە (نظـر) ئـەو لـە (ذرّە)یـە كەمتر بی، ئەو (أمر)ە بە گەورە بزانـی؛ لای گـەورە بـی، ئـەبا لای (مـؤمن)آن، چۆن بی؟! كە (رسول الله)یان لا، لە (كائنات) گەورەترە؛ (أوّل): خوا؛ دووەم: ئـەو. ﴿وَلَوْلاَ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ﴾ لـەو وەقتـی كـە بیـستان ﴿قُلْتُمْ﴾ (إسـتبعاداً) ﴿مَايَكُونُ لَنَا أَنْ نَتَكَلَّمَ بِهَذَا﴾ بۆمە، نابێ، بەسەر زوبانیا بێنین، (تَلَفظ)ی پـێ بكەین؛ ئەو (أحوال)و (مقتضیات)ەی كە من (إشارە)م بۆ كرد، (موجب) بـوون كە (موسڵمان)، (أبداً) ڕێی ئەو (تۆمەتە) نەدەن، وەبەسەر زوبانیـان دا نەیـە؛ (سواءً) ئەو (نوع)ە (مُنَفِّرات)ە (إنتفـا)ی لـە (شـرائط)ی (نبـوّەت)و (رسـالەت) بی، یان نا.

هەرچـی بـوە لـە (غفلـەت)ی (حمـق)ی (جهـل)ی بەسـەر دڵیانـدا هاتیـە (محروم)ی كردینە، لە (نظر)و (فكر)و (إعتبار)؛ (تـذكّر)ی هیـچیان نەكردیە؛ وە(إلاّ) (مسارعە)یان نەكرد، ئەیان ووت ﴿سُبْحَانَكَ﴾ پـاك و (مُنَـزّە)ی بـۆ تـوە (تقـدّس)ی خـوا (مُستلزِم)ە، بـۆ (تقـدّس)ی (صـدّیقە)یـی (بنـت الـصدّیق)، (رفیق)ی (حیات)ی (سیّد الصدّیقین) (عائلە)یە واپاك، (مُنزّە) لەو (وقاحـەت)ە ﴿هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ﴾ (أهـل)ی (نظـر) –(بعـد التّأمـل)– (دەهـشەت) ئـەیگرێ؛ (ساكت)و (مَبهوت) ڕائەوەستی! ﴿يَعِظُكُمُ اللَّهُ﴾ (وعـظ)ی (زاجـر)آنە؛ نەكـەن ﴿أَنْ تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَدًا﴾ ئەوجارە (إغماض)ی كرد، جارێتر نای كات ﴿إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ ئەوانـەی ئـەو (إفـك)ەیـان هەڵایـساندووە، دیـارە (مـؤمن) نـین. وە(حقیقةً) ئەوەی (ذرّە)یە (إیمان)ی هەبێ، (تَفَوّە)ی وا ناكات؛ ئەدی ئەوانـەی (آیـات) (صـرف) دەكـەن؟ (شُبهە) نیـە، (أساسـاً) دوژمنـی (دیـن)ن؛ نهانیـان پیسە، (فكر)یان لە (حق) (إسلام) بەدە؛ (طینەت)یان (خبیـث)ە ﴿وَيُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الآيَاتِ﴾ (دائـر) بـە (محاسِـن)ی (أخـلاق)و (تربیـە) ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾

ئەیەوی ئێوەش لە (علم)و (حکمەت) بەهرەدار بن ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَنْ تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ﴾ أموری قَبیح و ناشیرین و نالایق. ﴿فِي الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بەدرۆ إشاعە ئەدەن، وەیاخود خۆیان إشاعە ناکەن أمّا کەیفیان پێ دێ. ﴿لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا﴾ بە عِصمەتی أهلي إیمان و حِفظی إلاهی، وەتشریع حدودو إفْتضاح، إمکانە! ﴿وَالآخِرَةِ﴾ خۆي ئەزانێ بە چی یە. لاشَك ئەو قِسمە هەن! ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ﴾ أسرار. ﴿وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ هەر ظَواهِر ئەزانن. وەقِسمێ هەن عمومي ئەوروپایی وان، خۆیان سیّئات وفَحِشیّات ئەکەن، تا موسولّمانان چاویان لێ کەن. اَلْآن مُجادَلە دەوام ئەکا لە بینی مەلاو وأُدَبای موسولّمانان لەسەر إخْفای ژنان وسُفور. بەلّێ سُفور وتێکەلاوی نێرو مێ، حتّا تَعلیمی مُخْتلَط زۆرە! مَعَ أنّهُ سَیّئاتي سُفور، بەو وَجْهە، مَشهودی أنامە!! حَقیقَةً إشاعەی سَیِّئات لە طَرَف ژنان زۆر ئاسانە، زوو تَعَمُّمْ ئەکات! حتّا ماتەمي (حُسَیْن) سَبَب بە تَأثیر لە ژنان، بوویتە سَبَبي تَعَمُّمی تَشَیُّعْ. لاقەیدی مَسیحیان دونیای کردە مُتَمَسِّحْ. ﴿وَلَوْلاَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ﴾ أيّها المؤمنون الخالصون ﴿وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ﴾ لە حَدّی زاتي خۆي. ﴿رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ شُیُوعي ئەبەست. أمّا حدّو زَجر، إظهاري أسرار ولَوْم و تَوْبیخ، إظهاري غَضَبي إلاهي، ئەوانەی طَمس کرد! وەإلاّ وەك ئەو عَصرە کە لە ناودان، شُیُوعي بوویا، بۆ ئێوەش وەلەو ئێواش ئێواش، سرایەتی ئەکرد شُیُوعي ئەبەست! ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ﴾ دوای مەکەون. شەقاو بەجێی شەقاوي ویدا مەهاوێن! ئەو دەست هەڵناگرێ، بە أنواعي حِیَلْ دێتە بەرایتان! ﴿وَمَنْ يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ﴾ ئەستکوردی دەشکێ بەرێی راست دا ناڕوا ﴿فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ﴾ طَبْعي ـ عَقْلي، شَرْعي. ئەوی دوای کەوێ مَشغول ئەبێ بە فَحْشاو مُنْکَر، وەبەڵکو داعي ئەبێ لە وکالەتی مَتْبوعي. ﴿وَلَوْلاَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ﴾ بە إرسالی رُسُل وإنْزالي کُتُب وبەیانی حَسَنات وسَیِّئات. ﴿مَا زَكَا مِنْكُمْ﴾ أيّها المؤْمِنون، بَلْ أيُّها البَشَرْ! تاکو خاوێن نەدەبوو لە ئێوە. ﴿مِنْ أَحَدٍ أَبَدًا﴾ (مِنْ)ی زێدە، تَنصیصە لەسەر تَعْمیم. هەرچەند عَقل رێ ئەبا بە چاکە، أمّا

حاكمیەتـي زۆر ضَعیفة، ناتوانـێ صـاحِبی بگێڕێتـەوە، خـصوص کـە مَیـل بـە قووەت و عام بوو! بَعضیێ عَقل ئەکەن بە حاکمي مُطلَق، أمّا صَواب نیە! عَقلي قَوي بێ مَیل ومُحاباة لەگەڵ صَلاحي قووەي بَهیمَی وتَربیەی دینی باشە! ئەوەی بە تَعلیم نەیزانێ، خۆی رێی پێ ئەبا ئەتوانێ إسْتِنباطی بکات! أمّا لەگەڵ مُیول لە ما بەینی نا أهل، چی پێ ناکرێ! بەڵکو خۆی وەرئەگێرێ، دوای مَیْلی فاسدْ ئەکەوێ! أخْلاقي حَیْواني لە ناو هەیکەلي إنسانی زوو جێ ئەگرێ مەحکەم ئەبێ! عَقل درەنگ دێ، جێی نیە، ئەبێ قەرە پەستێ بکات، زۆر ئەبێ أساساً جێی نابێتەوە، واش ئەبێ دوایێ دەر ئەکرێ! ﴿وَلَكِنَّ اللَّهَ﴾ سُبْحانە. ﴿يُزَكِّي مَنْ يَشَاءُ﴾ بە إمدادي فطري وشَرعي، دیارە هەموی نابێ! زاتاً نقیضي سالِبەی کُلیّە، موجبەی جُزئیّەیە! ﴿وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ئاگادارە لەسەر کُلّي وجُزءی ظاهِرو وخَفي. بو طالِبي حەق ئەو آیتە زۆر نافعە! إحْتِراسْ بکە حَتّا لە حەق مامۆستات، حُکمْ بە تَزکیەی مەکە! بە مَحبّەو تَقلید خۆت کۆر مەکە! ئەوی تَعلیمت ئەکا، تێی فکرە چی تیایە! وەك (برناردشو)ی کاتبی شهیر ئەڵێ: (ئاگات لە خۆت بێ گەڵ مُعَلِّم ئارەزو ئەکات عَقلی خۆت لێ سَلب بکات، عَقْلي خۆی باوێتە دەماغت). من زۆر دَفعە بە فَقیي خۆم ئەڵێم: (مُقَیّد نەبن! بە حُسْني ظَن غافِلْ مەبن لە مُغالَطە).

مەلاي زۆر گەورە بۆ رەواج فِکری مُغالَطەی ورد وردي هەیە، تەواو دِقّةْ نەکەن، تێئەکەون! خاصّةً بە ناوي إعْتِقادی دیني. حقاً لەبەر ترخیصی دیني یا مذهَبي یا طَریقی، هەرچەند إنسان مەلا بێ، کەم وایە تَزکّيِّ نَفسي ببێ! خصوص مەلای أحْزاب و فِرَقي سیاسیّە ئەیەوێ حەق وحَقیقەت تابِعی فکری خۆی بکات، خواهِش تَقویەی حزبة! ئەگەر عُلَماي أُمّة آیەتی: (تلكَ أمّةٌ قَد خَلَتْ... الخ)یان کردبا مِثْقَلي مشتومالّی نَفس، نَفس تَزْکیە ئەبوو! أمّا بە طَریقي رِیاضەت زۆر کەم و نادِرە، أکثَر صِفاتي ذَمیمە یان زیاد ئەکا بە قووەت ئەبێ! گەلەکیان تووشي کُفر ئەبن. حاصِلي تَأثیري إیمان لە دڵان رُسوخي بە نوعێ بێ غَلَبە بەسەر قُواي حَیواني دا بکا، نایابە! ﴿وَلَا يَأْتَلِ﴾ با سوێند

نەخوا، بۆ (حث)ى (عَلى المَنْع)؛ (أبو عبيده) ئـەڵێ: "لـە (أَلْـو)ە، بـە (معنـى) (قـصّره)يـە، (بعـض)ى (يَتَـالِ)يـان خوێنديتـەوە؛ لـە (تـالى)يـە بـە (معنـى): (حلَفَ)يە. (كيف)ى خۆيانە؛ وادياره، وابزانم له (طبـق)ەى (فُقـرا)ى (مهـاجر)و (أقارب)ى (عائله)ى (مقدّس)ە، لەو (إفك)ە (إشتراك)يان كرديە؛ بۆيـە ئەوانـەى بە (قُوّە)ى (إيمان)و (إخلاص) له دەوڵەمەنـدانى (أصـحاب)، (منـع) بـووين؛ بـا سوێنديان خواردبى، كـە (إنفـاق)ى ئـەو (طبـق)ە نـادەين، بـەخێويان ناكـەين؛ دڵيـان لـەو (طبـق)ە، هـەلێ ئەنگوتيـە ئەمـە لام وايـە (أمـر)ێ (وجـدانى)يـە، (بشرى)يە. (جناب)ى (حق) (نَهى)يان ئەكات؛ ئەفەرموێ: "(مَنع) نەبى ﴿أُوْلُوا الْفَـضْلِ مِـنْكُمْ وَالـسَّعَةِ﴾ (زێـده) (إيمـان)و (مـروّەت) و (إنـصاف)و (إخـلاص)و (مجد)و (شرف)و (مالّ) ﴿أَنْ يُؤْتُوا أُوْلِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ﴾ به نان و كەوڵى وانە؛ نەكەن ئەوانە، به كردەى ئەوانيـدى بـەگرن. (إتيـان)ێكـى ﴿فـِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ بێ (غـرض)و (عِـوض). بـەڵێ (مـشهور)ە، يـەكى لـە (أقـارب)آنـى (صدّيق) (أكثر) ئەڵێن: "پورزاى دايكى بوه" (بعض)ى ئەڵێن: "خوارزاى بوه" (مهاجر)و (فقير)و پەروەردەيى نان و (نعمـەت)ى (صـدّيق) بـوه؛ لـە (زمـره)ى (أفّاك)آن بوه؛ (على الأقل) (كيـف)ى پـێ هـاتوه؛ (حـين الخـوض) پێكـەنيوه؛ لەبەر ئەوه (صدّيق) سوێندى خوارديه: (نفقه)ى نـەداتێ. پـاش (نـزول)ى ئـەم (آيـەت)ە، بـە (مُقتـضى)ى (قـوەت)ى (إيمـان)ى (إعـاده)ى (نفقـه)ى كـردەوە ﴿وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا﴾ ئـەو (أولـو الفـضل)آنـە.وادەرئەكـەوێ (جمـع)ێ بـووين. (پاش) (عفو)، (صفح)، خوا (إلتفات)يان بـەلا ئـەكا، بـە (خطـاب) لەگـەڵ وان، ئەفەرموێ: ﴿أَلاَ تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ﴾ (إسم)ى (جلاله) لـە جـێى (مـتكلّم) زۆر به (موقع)ە؛ ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئێـوەش (تخلّـق)ى (بِخُلـقِ الله)، (رحـم) كەن لێ يان خۆش بن، با ئەمانەش داخل بن.

(روايەت)ە له (إبن عبّاس)و (ضحاك)، (جماعـەت)ى لـە (صـحابان) –(مـنهم الـصدّيق)– (قطـع)ى (صـله)يـان لێ كردبـوون؛ ئـەبێ وابـى؟ (أمّـا) (رأيـى):

(أوفـق)ە بـە (وجـدان). (فی الحقیقـة) (إتفـاق) لەوانـە، (صـرف) لـە (زکـا)ی (نفس)ە، (قوەت)ی (إیمان)و (إطاعە)یە.

(أی أولو الفضل) (علما)ی (سُنّی)و (شیعی) بۆ (خاطر)ی خوای بەسیە؛ (آیەت) دەلالەت ئەکا، لە (أفضلیّەت)ی (أبو بکر)، نەخێر (دەلالەت) ناکا؟ ئەم جارو (مجرور) و کەشمەکەشمە جێی ئێرە نیە. (روح)ی(آیەت) بە (منازعات) مەبەن؛ (صاحب)ی (فضل) بن؛ (علم)ی خۆتان لە ڕێی ﷻ خوا (صرف) کەن؛ (منازعات) (باعث)ی (إفك)و (إفترا)یە (أبو بکر) (أفضل)ە، (علی) (أفضل)ە؛ بە تو چی؟ کە خۆت بە (فضل) نەبی، (فی سبیل الله) (سعی) نەکەی!

بەسیە (تلك أمّةٌ قد خلت) ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ﴾ وەکی لە عصری (ذهبی)دا بن، شتی وایان بە خیاڵ دا نایە ﴿الْمُؤْمِنَاتِ﴾ لە (أم المؤمنین) کێوە؟! ﴿لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾ یا (ربّی) ئەوەی (تفوّە) ئەکا، بە (خیاڵ)یش؛ (سُوء)ی (أدب) لە (حق) (عائلە)ی (نبوی) چ (حَرم)انی (محترم)ی چ (أولاد)ی (أعزّا)، چ (جواری) چ (خزم) و (أقارب)ی بەلێویا (عُبور) کا،(لعنەت)ی خوای لێ بی، لە (دنیا)و (آخرەت).

من (إخلاص)ی ئەوانەم هەیە، لەبەر (نسبەت)ی (رسول الله) خوا ئەزانی قسەیە ناشیرن، لە (حق) (أبو جهل)ی ئەکەن (مُحقق)مە؛ (إفترا)یە؛ وەزۆرم لە (قلبی) گرانە، دەرحەق (نواتی) گەورە، ئەو (نوع)ە (تَفوّە)ە. ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ وادەرئەکەوێ جێی (ترحّم) نین؛ (شامل)ە بۆ (هەموو) (مؤمنات)ی (غافلات)؛ (زوجات)و (بنات)؛ (طاهِرات) (فوق الجمیع)؛ (لَعن)ی (رامی)یان و (عذاب)یان (أشدّ)و (أعظم)!

گەلی کەس هەن بە (تَفأُل)ن، تەماشای (جمال)و (حسن)ی (طبیعەت) ئەکەن؛ هەرچی لە (دنیا) (واقع) بی، (ملاحظە)ی (جهەت)ەکی (خَیر) ئەکەن؛ (حتّی) بۆی ئەدۆزنەوە؛ وە(جمع)ی (مُتشأِم)ن؛ بە (غیر)ی (قبایح)و (وقایح)و (شرور) چیتر لە (کائنات) نابینن؛ حتی بۆ (أمر)ی زۆر چاك، جهەتی بەدی بۆ

ئەدۆزنەوە، یاخود هەڵی ئەبەستن. دەربارەی (أسلاف) (عین)ی (فرقتین) (موجود)ن. (حال)ی (أمّەت) گەیشتە دەرەجەیە؛ (نوات)ی گەورە گەورە لەسەر (منبر)آن (لعنت)یان لێ ئەکرا؛ ئایا (منابر)ی (إسلامیە) بۆیە دروست کران، ئەو (نوع)ە (لعنە)ی لەسەر بگوترێ؟ ئای، وای!

ئێمە بە (مفاد)ی (آیەت)ی (تلك أمّة قد خلت) تەماشای خراپە ناکەین؛ (سعی) لە چاکە، چاکەیی (موافق)ی زەمین و (زمان) ئەکەین. ئامۆزاری پێغەمبەری لەگەڵ (حرم)ی پێغەمبەری (نزاع)یان بوو؛ من لەبەر (نسبەت)ی (رسول الله) هەردووکم خۆش ئەوێن؛ بۆ (خاطر)ی چناقیان نابمە دوژمنی ئەویدی. (الحمد لله) (خیال)ی سوکیان بە دڵم دانایە؛ زورم لا گەورەو گرانن. لە جیاتی (عداوەت)ی ئەوانە لایەق وایە، (عداوەت)ی (موسۆلینی)و ستایلی بەدخواهانی (دین)و (دنیا)مان بکەین (موسولینی) چی بە (مسڵمان)آنی (طرابلس) ئەکات؟ ملای (شیعە) بە گژ (أبو هُریرە)دا دەچێ! دەك هەناوت کەوێ مەلا؛ لەگەڵ (غیرەت)و (قوەت)ی (إیمان)ت ﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ﴾ زوبان بێ (إختیار)ی وان دێتە (نُطق) ﴿وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ﴾ دەست و لاقیانیش وەکی وان، (شاهد)ی ئەدەن، ئەوێ ڕۆژێ ﴿بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ هەرچی بی. (لسان)ی (جِنائي)؛ (جوارح)ی (ظاهری)و (باطنی)؛ (مُحرِّك)ی (جوارح)ی (میولی) (قلبیە) شەهادەت ئەدەن ﴿يَوْمَئِذٍ﴾ ڕۆژی قیامەت، ڕۆژی شَهادەتی أعْضاء ﴿يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ﴾ جَزای لایق و ثابت ومُطابِق ومُوافِقْ و شایانیان! ﴿وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ﴾ خَفایا ئاشکرا ئەکا، إظهاري أمور عَلی ما هو علیە چۆنە ئەکات! وادەرئەکەوێ جنابي حق ئەو إفکەی وادەرخستیە کە جێی مَعْذَرَەت بۆ تَفَوُّه نەمێنێ! ﴿الْخَبِيثَاتُ﴾ لە ژن، لە أقوال، لە أعمال، ئەگەر بوێرم لە أتْباع، أما (إمامی عَلي)و (شێخی گەیلانی)و (نەقشبەندي) لێم ناگەڕێن! وەإلاّ بە إطْلاق جَزْمم پێدا دێنا! أمّا خَبائثي ئەوانە لەو زەواتانە نیە، لە وُسَطایەکانە! کەوابێ قسەم حەقە

﴿لِلْخَبِيثِينَ﴾ە. ﴿وَالْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَاتِ﴾ لێك ئەوەشێنەوە، مەیلی خَبیثْ، بۆ خبیثەیە! مَنْشَأی لە دەروونە! ﴿وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ وَالطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ﴾ شَبیهُ الشَّيء مُنْجَذِبٌ أليهِ. الجِنْسُ إلى الجِنْسِ يَميلُ. إنَّ الطيورَ عَلى أشباهِها تَقَعُ. قەل با قەل، کۆتر با کۆتر. زاتي أقْدَسي رِسالەت پەناهي، لە هەموو خَبائِث مُنزَّهە! لە هەموو جهەت خاوێنە پاکە بۆنی خۆشە!.

(محمد أمين آغای پیران) پیاوێ زیرەك بوو، بە مناسبەیێ عَرْضی بابمي کرد، (قوریان سَبَبی چیە ئێمە دین و ئاین و وآداب وأخلاق لە عُلمایان وەرئەگرین، کەچی ڕوومان لە شێخانە مەیلی وان ئەکەین؟). فەرمووی: (ئەوە لەبەر مُنَاسَبەیە. ئەسپێ أصیلی نژدي راگرن، کەرێ ببەستنەوە، گاڕانە کەرێ بەرەڵلا کەن ڕوو لە کیهەیان ئەکەن؟). ووتی: (ئەڵبەتە لە کەرەکە ئەوە مَعلومە!).

ئەوەندە بۆ برا َتي أهل وعائلەی أطْيَبُ الأنام، کافیە! ﴿أُوْلَئِكَ﴾ ئەو طَيِّبون وطَيِّباتە ﴿مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ﴾ لە إفترای خَبیثون وخَبیثات. ﴿لَهُمْ مَغْفِرَةٌ﴾ عَيْنُ الله ناظِرَةٌ إليْهِمْ وسِتْرُ الْعَرْشِ سُيُولٌ عَلَيْهِمْ، لە ژێر پەردەی عِصْمَتي إلاهي! ﴿وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ أزواجي طاهِرات لە خزمەت أبو الطَّيِّب ألطاهِرْ الزَّكي المُقَدَّس الرسولُ الْقَهير، دان، لە دونیاو قیامەت!! چ رزقێ هەیە وەك ئەم رزقە خۆش و بە قیمەت؟! لەو ئایاتە خیالٚ کە، بَحْرێ سیاهي عَظیمي غَضَبتْ دێتە بەر نظر، بە أمواجي عَظیمە وهائلە هجوم ئەکاتە سەریان، بە جارێ وەك خَس وخاشاك، بیانبا مەحوو نابودیان کات! دوایێ نَسَماتی لُطْف ومَرحَمەت و رَۆفیەتی وَعْدي إلاهي دێتە پێش، أمواجی مُتَلاطمە ئەگێڕێتەوە! عَجایب مَدّو جَزرێکە، مُجادَلەی رحمەت و غَضَب!! (ولَولا فضلُ الله وَرَحْمَتُهُ، خوا دەزانێ چی پێ دەکردن! برادەر تۆ تەماشای فَضیلەت وأفْضَلِيەت مەکە، بنۆڕە تَأْثیري إیمان لە دڵی خۆت، أدَب وإخْلاص لە حەق رَسولُ الله! بنۆڕە گەورەي ئەو پیاوە ئەو خانەدانە، ئەتواني بێ حورمەتی بنوێنی لە ڕوویا؟ نَظَر بە حورمەتی شەرەف وناموسي رِسالەت پەناه، ئەو إفکە لە قَتلي عُثمان لە

قَتلي عَلي لـه قَتلـی حُسین گـەورەترە! وەبَعـضە قـسەیێ (رافـضیان) یـاخود قسەی بَعضي (رافضیان)، له قـسەی رئـیس المُنـافقین دەرحـەق بـە نـاموسـي هومایۆني سَیِّدی عالەم پیسترە! حاجەت نیە ئێمە مُناظَرە بکەین ئایـا صـدِّیقه أفضله یا زَهْراء! سُبْحان الله ئەمە چیە؟! مەلایەتی وا إیجاب ئـەکا؟ حاشـا!! ئەو هەم ئاغۆشی رَسولي کِبریاء، ئەم کریمەی سَیِّد الأنـام، سـۆلی هـەردووکیان بـۆ خـاطری پێغەمبـەر لەسـەر سـەر!! خـاکي قَـدَمیـان کُحْلُ البَـصَر!! دائـی تَفْضیل موسولْمانانی گرتیه، ظاهِر أسهْله، أمّـا بـووه مَـداري تَـضْلیل، حتّـا لـه بەیني شەو ڕۆژ، أرض و ئاسمان شیرو هەنگوین، له تَفضیلدا مُـسابَقه ئەکـەن! لا إلاهَ إلا الله، کەسێ إنصافی هەبێ ئەوەندە بەسیه، أمّـا بُـولهـەوەس قـسەیان لەگەڵ ناکرێ!

﴿یَاأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا﴾ به إیمانێ صَحیح به تَأْثیرِ له قُلُوب ﴿لاَ تَدْخُلُوا بُیُوتًـا غَیْرَ بُیُوتِکُمْ﴾ وَلَوْ ئی داك و باتان بێ! ﴿حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا﴾ به نَوْعێ أوحّه أدحّ، دقّ الباب، بـێ تَـوَحُّشْ، نـەڕە نـەڕ مەکـەن: ئـەڵێ کـێ لەوێیـە؟ تـەپ تـەپ لـه دەرکەی مەدەن! کـه جوابیـان دانـەوە: کـێ یـە؟! ئەوەیـە! ﴿وَتُـسَلِّمُوا عَلَـى أَهْلِهَا﴾ سَلامٌ عَلَیْکُم إذنه بێمه ژوور؟ یاخود به معنا إسْتِئذانه، وەکی له قـامُوس مَعلوم ئەبێ! مَعَ أنَّهُ ئەبێ رِعایەتەکي أُنس وألفي تێدا بکرێ! مَعَ الأسَـف (إبـنُ جَریر) بەچەند طُـرُق لـه (إبـنُ عَبـاس) نقـل ئـەکا (تَسْتَأْنِـسوُا) سَـقطەی کاتِبـە، خَطَأیەتی، وَهْمي کُتّابه!

(زُمَخْشَري) با وجودي زۆر مـل کەچـە بـۆ نَقلـي جَـنُّ القَلَـم ئەفـەرموێ: (ولا یُعَوَّلُ عَلی هذه الرِّوایَة)، إعتباري پـێ نیـە! لکِـن جَمـاتي خـریکن تَـوجیهـی بـۆ ئەکەن، ئەمه حَقّاً تَوجیهي پێ ناوێ، وەتوجیه هـەڵناگرێ! مـن عَرضـي ئەوانـە ئەکەم (لَوْلا إسْتَمَعْتُمُوه قُلْتُمْ ما یَکونُ لَنـا أن نَـتَکَلَّم بهـذا، سُـبْحانَكَ هـذا بُهتـانٌ عَظیم!). ئەمه قسەیە أصحابي رَسولُ الله هەمووی دواي غَلَطي کاتِـب بکـەون؟ پێش کِتابَه کوویان خوێندیتەوە؟ قِرائەتیان نەزاندرا؟ ئومێدم وایه (إبـنُ جَریـر) وای نەفەرمووبێ، لاشَك ئەوەندەی ئەزانێ که وُثوق به أصحابي مُحَمَّدی کُتّـابي

رَسولُ الله نەما، وثوق بەویش نامێنی! وە ڕجا ئەکەم أهلي إیمان، لە ڕووی إیمان، إعْراض لەو نوْعە لَغْوە بێنن. تابینە أهلي فَلاح! شُبهەم نیە (إبنُ عباس) لەبەر گەورەيي ونُفوذي كَلِمە، زۆر درۆی بەزاری هەڵبەستراوە! زاتێ عَظیم بووە، دۆستیشی بووە دوشمنیش بووە! طَبیعی أعدای دَسّاس بۆ تَنفیر شتی وایان هەڵبەستوە! وەحاجَةْ بە قَلب نیە، زێرا قَلبي عَبارەتێ لە مَقامی ئەبێ، کە نَوْعاً ما قَلْبەکی طَبیعی هەبێ! وەعُلماي بَلاغَةْ بە شَرطی (حُسن) (قَلب) قبولێ ئەکەن! ئەگەر چی نُوکْتَەو لَطافەتی تێدا نەبێ، لایان مَردودە ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ (حسن)و (أدب) لە هاتوچوونی لای یەك (مفتاح)ی (دخول)ی دار، بە (أُنس)و (سلام) زۆر باشە؛ (هجوم) بە (وَحشەت) بانگ کردن، لە دەرکەدان، وەدەرکە کوتانەوە؛ خراپە، (مُخلّ)ی (حُسْن)ی (مُعاشرە)و (آداب)ە. خوا بۆ ئەو (نوع)ە (مُعاشرە) (إرشاد)تان ئەکا ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ تێ (فکر)ن، بۆ (سائر)ی (أبواب)ی (معاشرە)و (مجاملە)و (مؤانسە)و (محادثە)و (مُباحثە)؛ ئاشکری نەبێ، هەمووی (عربی) ﴿فَإِن لَّمْ تَجِدُوا﴾ (بَعدَ الإستیناس) ﴿فِيهَا أَحَدًا﴾ (خالی) بێ ﴿فَلَا تَدْخُلُوهَا﴾ مەچوونە ناوی، (جسارەت)ە؛ (صبر) گرن ﴿حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ﴾ کە کەسی تیانەبێ، (إیذن) (ممکن) نیە ﴿وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا﴾ بگەڕێنەوە، ڕێ نیە، (عُذر) هەیە، (صاحب الدار) نوستوە کەمێ بێ (خُلق)ە؛ بێ (توقّف)و (کُدورەت) ﴿فَارْجِعُوا﴾ بگەڕێنەوە ﴿هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ﴾ پاك ترە؛ نەك (إلحاح) کەی، بە (عناد) (وَالله): ئەبێ بێمە ژوورێ. (مقتضا)ی (إیمان)و (عـزّة)ی (نفس) ئەمەیە ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ ئەوی بیکەن؛ (تَرك)یش (عمل)ە. (سبحان الله) (زمخشری) کە لە (علما)ی (قرن)ی (خامس) بوە، لە (تأریخ)ی (٥٢٨) (وفات)ی کردیە، لەو (خصوص)ە (شکایەت) لە (أهل)ی (زمان)ی خۆی ئەکا؛ ئەبێ (حال)ی ئەم (زمان)ە چۆن بێ؟! ولاتی ئەم بەریادە، (سلام)ی چی؟ (إستیذان)ی چی؟ هەڵئەکوتیتە بنەبانی؛ لەبەر ئاگردانی، لە ناو ماڵی و ژنی (صاحب) خانووی دادەنیشی؛ (واقعاً) (أکثر)یش

پێیان خۆشە؛ سڵ نابن. ئەگەر دەستەبرابن، زۆر (کیف)یان پێ دێ؛ چونکی لایان (دلالەت) لە خۆشەویستی و ڕێکی ئەکا. (أمّا) شارە گەورەکان، وەکی (موصل)و (بغدا) لەو جهەتە زۆر باشن؛ (هەولێر)یش گەلەك لە (کۆیە) چاکترە. (عقلاً)و (عادةً) و (تعلیلاً) دیارە (مُراد) لەو (بُیوت)ە (سُکنا)یە؛ کە (عائلە)ی تیا بی؛ (أمّا) (بیوت)ی (معاملە)و (مناقلە)، وەك کاروان سەراو قەیسەری، خمخانەی جوان، سلاملغ و دیوە خانان (ظاهر)ە جێی (إستیذان) نیە، بێ (مانع)ە. (أمّا) (خَرِبە)و چۆڵی، بۆ (دفع)یان نازانم چی بڵێم؟ دورە لە (مقام)؛ مەگەر بڵێین: "لەبەر (إحتراس) لە (توَهم)ی (عموم)،" إنجا بۆ (دفع)ی ئەوانە ئەفەرموی: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَدْخُلُوا﴾ (سیّد) ئەڵێ: " بێ (إستیئذان)" ﴿بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ﴾ (حتّی) (حمام)یش لێرە (ذکر) ئەکا ﴿فِيهَا مَتَاعٌ لَكُمْ﴾ (تمتّع)و (نفع)ی گوناه نیە؛ (داخل)یان بن، بێ (إستئذان). ئەو (بیوت)آنە (أساساً) بۆ هات و چۆیی (عموم)ی داندراوە؛ (خَرِبّە)ی بێ (صاحب) بۆ چوونە سەر پێشاوی ئاو، چ جێی (إستیذان)ە؟ تا بی (إستئذان) چوونە ناوی گوناهی تیا بێ. (ظاهر) وایە خانووی (سُکن)ەبی، بە پیاوەتی یا بە کرێ (بعض)ە شتی (شخص)ەکی لە ئۆدەی دا بی، (لَدی الحاجة) بچی (حاجة) بە (إستئذان) ناکا؛ (أُنس) بوە. چوونی بۆ (زیارەت)و دۆستی و (تعارف) نیە؛ ئەگەر (عائلە) لە (غرفە)یە تـرا بوون، ئاگاداری خۆیان ئەکەن ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ﴾ لەگەڵ ئەو چەند (مُلائم)ە. نەکەن بە بەهانەی (متاع)، گاهو بێ گاە بچن، تەماشای (عورات)ی (مسڵمان)ان بکەن ﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ﴾ پڕ بەچاو بە (دقّەت) تەماشای ژنان نەکەن؛ ئەوەی (مؤمن)بی، کە (أمر)ت کرد، (علی العین) (إطاعە) ئەکەن. (تفسیر)ی (غَضّ) بە چاو قوچاندن، گەرچی لە (روح المعانی) (إختیار)ی کردیە، (لکن) (إحتیاجی)مان ئەبی یا بە (زیاد)ی (مِنْ) یا بە (توَجیە)ی (وَجیە)ە؛ هەرچەند (إشارە)ی بۆ (وَجە)ی کردیە، (أمّا) بێ (وجە)ە؛ (وَخصوصاً) (نسبەت)ی (غضّ) بۆ (بصر) ئەدا، بۆ

چاو نادا؛ ئەگەر (مُراد) بایە ئەی فەرموو: "يَغُضُّوا أعينَهُم" وەهەم لە (بعض)ی (مواقع) (إیجاب) ئەکا، ژن و پیاو وەکی کوران بڕۆن، ئەمەش خۆی نیە ﴿وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ﴾ بالحدود، دای پۆشن، (ستر)ی کەن نەیەڵن، شوێنی دیار بی. لەبەر چاو قوچاندنی (مفسر)ەکان (سؤال)ی لێرە ئەکەن: بۆ نەی فەرمووە: (مِنْ فرُوُجِهِمْ)؟" (أمَّا) (بِنا) لە (معنی)ی (غَضّ) و (طَرِیّ) (مُختار)ی ئێمە (حاجەت) بە (سؤال) نیە. (فضل) لە (جواب). (واقعاً) (مقصد) لە (غضّ)ی (بصر)، (حفظ)ی (فروج)ە ﴿ذَلِكَ﴾ ئەوە بێ (شُبه)و (حیل)ە ﴿أَزْكَى لَهُمْ﴾ (أشهد بالله) وایە ﴿إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ لێ یان (صادر) ئەبی، چ بە چاو چ بە (غیر)ی چاو ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ﴾ وەکی پیاوان، هەدوو لامان بە (مکلَّف)ین بە (غَضّ)ی (بصر) (بِأيِّ معنیً کانَ) ﴿وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ﴾ (مِنْ كُلِّ الوُجُوه) (مقصد)ی (بالذّات) ئەمەیە؛ ئەوی دی (مقدّمه)یە یا (وسیل)ەیە ئەوی (جلب)ی (نظر) بکا، لەواندا، زێترە؛ زیادە (علی الرِّجال) (زێدە) بە (تحفّظ) (مُکلَّف)ن ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ مُخَشَّلات، یَعني مَواقِعي! ﴿إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ بە مُقْتَضای جبلَّةُ و جَرَیاني عادەت. ئەو مَواقِعە دەست ورووە، ظاهِر ئەبێ! طَبْعاً ئەگەر ئەنگوستیلەو خزیمەشیان تیابێ، قەیدی نیە! یاچاوی بە کل و کَنْ لە حَنا گیرابێ! با قەتارەو گوارەو زرشەمەو چۆچەو ئاگر بارانیش، عَلاوەبێ! –الحُكْمُ لله–. أمَّا زینەتی خَفي بۆ إظهار بکرێ؟ چ پەکی مَدَنیَّتو حَیاتي لەسەر کەوتوە؟ شان و مل وقۆل وران بۆ؟ پۆدرەو سپیاو سۆراو بۆ؟ بەڵێ هەزار جاری باوەکي ئێمە، پیاوان، بە حالي طَبیعی بچنە دەر! ئێمە دەست نوێژ ئەشۆین بە حالي بَسیط وسادە، ڕوو سەرو بازو بەدەر، ئەچینە دەر بۆ لَوازِم وموجِباتی حَیاة، با ئەوانیش وەکي ئێمە بن! ئەو إسْرافە بۆ؟ هەستە (إمامی نَوَوي) تەماشای دونیا بکە چی بەسەر هات! چارەێ بکەین بۆ ژنە مُسُلمانان! قابل نیە ئەمرۆ پێچەی مووی کلکي بارگیری بە ڕووي خۆیاندادەن، یان چارۆگە بوزی ڕەش، یان شینە پۆتی

و چەكمەی رەق، وەكو كۆنە ژني هەولێريان بچنە دەر. گوێ لە خلافي مُسُلمانان ڕاگرن، ئايا سُفور باشه؟ يا سَتر؟ أما چ سُفور سفوري كۆهی نُور! حَقّاً هەمووی إفراط وتَفريطه!

ئەوروپایی پەكيان بە ناموس وشەرەف نەكەوتيه، خۆی لە وولاتێ ژني لە وولاتێ، لەكن دۆست و أحْبابيان بۆ سياحەت ئەچێ، بەلام لەسەر مَسْرَح بەو نَوعه سُفوره، رَقص ئەكا پاره پەيا ئەكات. گۆڕ هەڵتەكێنه (عبدالله بنِ سَلول) ئەمڕۆ ڕۆژی تۆو بوو، بووباي بە مَسْرَح چي، پارەت پەيا ئەكرد!

ئەي أُمّةْ بە قسەی ئەوروپاييان مەخەڵەتێن! لەبەر سُفوریێ هكَذايی ڕۆژي چەند وَقايع و وَقايح ڕوو ئەدا! ئەگەر بَشَرْ بە ڕاستی تَعَهُّد ئەكا بۆ حِفظي خوارێ، با سُفور كەن! أمّا بە خوای درۆيە، مَقصَديان هَدْمي دينە، هەتكی شرەفی بَشَرْيه!! عُظَماي جاران و ووقارو تمْكينيان، گراني ئەدا أرض! ئێستا ئەمەندە سووكن لەگەڵ كچە تيوميو دانس ئەكەن. سَبَبْ بە فَحشيّاتی ئەوروپا فَحْشيات لە ناو ئێمە بلاو بوويتەوە! تا ئەوروپا إصْلاح نەبی، سائری بَشَر إصلاح نابن! ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ﴾ خِمارْيان بە سنگ و بە رۆكی خۆدادەن تا سينگ و مەمكيان دەرنەكەوێ. حالاً لەناو (دزەيي) عادەتە ژنيان مشكێ رەنگ تاريك ئەكەنە لەچەك سەرو مل و شان وبەرۆكيان دادەپۆشێ. وەقتێ لە (كۆيە) دەسماڵ هەبوو زۆر لَطيف بوو، لكنْ عَلی الأكثَر ئێستا چارۆگە بە سەرياندا دەدەن، بەلاي پشتەوە شۆڕ ئەبێتەوە، لای پێشەوە داناپۆشی، سينگ و بەرۆك ئاچوغە، زۆر ئەبێ لە يەقەياندا، سفيدی باغي سێوان دەرئەكەوێ! ئەو لێره وايە! لە بِلادی قَريب و تێكەلاوی ئەوروپاييان باسي حِجابي سەرو مل و بەرۆك، تَستُّر كردن نيه! سەر شان و كەلەكەو ڕان، مَكْشوفە! زۆريان لە بَعْضه مواقِعْ، غَيْری دوو كونەكان، ئەويتر هەموو لە گۆڕێ مَشهودي آنامه! بِالطَبع بۆ مُسُلمانانيش سِرايَتْ ئەكا. خُلاصە زينەتي حُسن وآداب، حفظي شەرف ووِقار، هەلگيرا!

﴿وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ﴾ ئي خَفي وەك (زمَخشري) ئەفەرموێ! ﴿إِلاَّ لِبُعُولَتِهِنَّ﴾ بۆ مێردیان. ﴿أَوْ آبَائِهِنَّ﴾ بابی خۆیان وإنْ عَلى ﴿أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ بابی مێردیان. ﴿أَوْ أَبْنَائِهِنَّ﴾ کوڕي خۆیان. ﴿أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ له ژنێ تر، له حضوري (قرآن) بێ ئەدەبی نەبێ، واتەبێ زۆر داك لەگەڵ زۆر کوڕ تووشي فَساد ئەبن، بەو کوڕانه کوردي ــ داکی خۆیان یان ــ پێ ئەڵێن! ئەگەر چی کەمە، أمّا تَقَیُّد لازمه — وەگەڵێ حکایەتي کۆنه لەو مَقوله نقل ئەکەن—.

﴿أَوْ إِخْوَانِهِنَّ﴾ براي خۆیان، ئي مێردیان نا! ﴿أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ﴾ برازایان. ﴿أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ﴾ خوارزایان. بووك به بابی مێردي ئەڵێ: (مامە)، به داکي ئەڵێ (خەسو). مێردي به بابي ژنی ئەڵێ (خەزور)م. هەردوکیان به داکی یەکتر ئەڵێن (خەسو).

به خوشکي مێردي ئەڵێ: (دش). بەوەلاش بووکي، یعنی ژني براي مێردي ئەڵێ: (هەوگیان). خُلاصَه إبْدای زینەتي خَفیّه بۆ ئەمانەی مۆبّدا لێك حەرامن، جائزه! بۆ غَیر جائز نیه، وَلَوْ خزمێ لێك نێزیك بن! ﴿أَوْ نِسَائِهِنَّ﴾ رفیقه یان دەست و پێیان! ﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ﴾ ئەگەر جاریه بێ ئايا بەر (نِسَائِهِنَّ) نەدەکەوت؟ یا (عَبد) بێ به شَرطي عَدالەت وَلَوْ کە مَفقودە! وە مَسأَلەی (رَقیق) له أکثَري بُقاعي أرض لَغو کرایە، وە لەناو کوردان نەبووە! طَبیعی زێده تَفْصیلاتي حِلّ وحورمەتي نَظر، له کُتُبي فِقْهِیَّة مَذکوره! بەڵێ أما إیجابي ئەکرد مەلایان، حَسَبَ الزَّمان، طَریقەیەکیان دانابا بۆ سُفوري ژنان، له بینی جەسي سابِق و إطْلاقی لاحِقْ! أمّا عُلماش وەکي أُدَبایەکان بووینه دوو فرقه ﴿أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ﴾ پیاوی پیري مَعْتوه دوائەکەون لەوێو لەوێ دەخولێنەوه بۆ پاروه نانەکی وەك طُفَیلیان —ئاگایان له مام شابي نیه— بۆ وانیش قەیدی ناکا!

﴿أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ﴾ ئەو مندالانەی ئەوتۆ ﴿لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ﴾ نازانن چیه به خاطِریاندا نایێ، وەکي ئەڵێن له عَصره ذَهَبي دان. تەماشا دەکەی مندالْ دەست به ئاو دەگەیێنن، نازانن فارِقیان چیه، ئەو بۆ وایه، ئەم

بۆ وايە؟! ﴿وَلاَ يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ﴾ پێ بە عارد دانەدەن. ﴿لِيُعْلَمَ﴾ بزاندرێ ﴿مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ﴾ وەكی خاش خاش، یا ئەوانەی زەنگوڵەدار. أما خلخالێ لە زەمانی ئێمە كلۆر نیە دەنگی لێوە نایێ.

جَنَّة مكان (سَيِّدی آلوسي) قسە لە چارشەوي كە مەرەلي سورمەدار ئەكات، في الحقيقة لَبسي جالِبي نَظَرە! ئێستا لە (بَغدا) لَغو بووە، أما لە (كۆيە) مايە، لام وایە لێرەش لَغو ئەبێ، یا مَكشوفاً ئەگەڕێن، بابە بەتیە إكْتِفا ئەكەن وەكی ژنەتوركاني زەماني (عُثماني).

﴿وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ﴾ لە آدابي جاهلیەت بگەڕێنەوە، ڕوو بكەنە دَستووري إلاهي. ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ نائلي سَعادتي دارین ئەبن ﴿وَأَنكِحُوا الأَيَامَى مِنكُمْ﴾ بێوەژن، بێوەمێرد؛ بێ ژن، بێ مێرد، بۆش نەمێنن ﴿وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ﴾ ئی دەست بدا، بۆ (زواج) لە (عبد) و (جاریە). (حق) وابوو، لە (عالم)ی (إسلامی)دا، دانرێ بێ مێردو مێردی بێ ژن، نەبێ؛ ڕێ نەدەن بە (فحشیّات).

بە یەكی لە (إنكلیـن)أنم ووت: "ئێوە (قوم)ێ بە (شهامەت)ن، نەدەبا (قەحپەخانە) لە ناو ئێوەدا هەبا" وتی: "(حقیقةً) ئێمەش دوژمنین، (لكن) ئەگەر ئەگەر (قەحپەخانە) نەمێنێ، (حكومەت) زۆر ضرر ئەكا، لە (٥) ملیۆن لیرەی زیاتر لە قیس ئەچێ. "بەڵێ پارە هەمو شت بە (إنسان) ئەكات! حاصڵی بَشَرُ و آداب و محاسنی شریعەتی إسلامیەت لێك دوورن ﴿إِن يَكُونُوا فُقَرَاءَ﴾ نەترسن، مادام مَیْلیان بوو ﴿يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ﴾ بە معاملە و كسابەت، خوا دەوڵەمەندیان ئەكات. زۆرمان دیت، (فقیر) بوون، ژنی چاكیان (نصیب) بوو، بە (كسابەت) و (إقتصاد) (سعی)یان كرد، دەوڵەمەند بوون. بەكوردی ئەڵێ: (ژن ومالْ) نەك: (مالْ وژن). زۆر دەوڵەمەند ژنیان هێنا، (إسراف)یان كرد، (فقیر) بوون، (وعد)ی (إله)ی (صحیح)ە (تأویل)ی پێ ناوێ ﴿وَاللَّهُ وَاسِعٌ﴾ (غنی)یە لە شت، (عطا) ئەكا، (جهەت)ی (معیشەت)ی (واسع) كردیە، بێ (سبب) (تضییق)ی ناكا، (نسبەت)ی بۆ هەموو یەكە ﴿عَلِيمٌ﴾

ئەزانێ (سعەت) چۆن ئەبێ، وە(تعلیم)ی خەڵکیش ئەکات. خوا (وعدە)ی لەگەڵ کەس نەدایە، ژن بێنی وپاڵ داتەوەن خوا دەوڵەمەندی ئەکات. بەڵێ (سوء)ی (فهم) (موجبی) (إضطراب)ە ﴿وَلْيَسْتَعْفِفْ الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ نِكَاحًا﴾ (أُهبە)یان نیە، خۆ (حفظ) کەن، خۆ بگرن، و(سعی) کەن ﴿حَتَّى يُغْنِيَهُمْ اللَّهُ مِنْ فَضْلِه﴾ پاشکەوتێ بکەن، ئەبنە (صاحب)ی (أهبە)و (أسباب)ی (زواج)، ئەو وەقتە ژن بێنن. لام وایە ئەو (آیة)ە، (تفسیر)ی بە (آیة)ی (کَوْن)، (یعنی) (حوادث)ی (خارجی)، (توضّح) ئەکات, بنۆڕنە زادەکان، خانەدانێ (آغایێ) و (سیادەت) و (علم) نابێ (کسابەت) بکا، (اغازادە)، سبەی ناچار ئەبێتە (کنّاس) و (کنّاف)ی (بلدیە)، ملازادە ئەبێ هەمیان بخوونن، ببنە مەلای (لما حین)ە، (کان)ە بوو، نەختێ ئەخوێنی، برسی ئەبێ، ڕووت ئەبێ، چی بکا؟ لەکارو (کسب)یش ئەکەوێ، نەشبووتە مەلا، (چارەیۆك=یۆخ)! ئەوەی ئەبێ بە ملا حاڵی چۆنە؟ مەپرسە، برسی، بێ (حرمەت) و چاولەدەستی خەڵك، بۆ (دین) و (دنیا) بێ کەڵك! ﴿وَالَّذِينَ﴾ ئەو (عبد)انەی ﴿يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ﴾ (طلب)ی (کتابەت) ئەکەن ﴿مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ چ (مذکّر) چ (مؤنث). (بیان)ێ جوانە ﴿فَكَاتِبُوهُمْ﴾ بە (مقابل)ی (مال)ی ماڵ، آزادیان کەن، ئێوە لەسەر خۆ (لازم) کەن، ئەوانیش (کذلك). (أکثری) (أحکام)ی (قرآنی) —مجمل و تفصلی— عائدی (جنابی) (رسول)ە، حتّی نوێژە لە قورآندا (بیان) نەکراوە، وە(کذا)، (نصاب)ی (زکاة) ئەفەرموێ: "کە ئەوان (کتابەت)یان لە ئێوە خواست، ئێوەش (کتابەت)یان لەگەڵ بکەن." (شرائط) و (عبارات) (کیفّیات)، (عائد)ی (سنّەت)ە. ئەوجا دەستی ئێمەو دامانی (روات)ان، وە(مجتهدین) (مخالفات)یان، وە(مقلدین) (مشاجرات)یان! لەکەم جێ، بە (حق) (إنسان) لە (حقیقەت) ئەکەوێ (تقلید)ە، ئەم ئێووی، ئەو ئی یەکێتر، (وهکذا) ﴿إِنْ عَلِمْتُمْ﴾ لە ڕەوشتیان ﴿فِيهِمْ﴾ لەواندا ﴿خَيْرًا﴾ (قوەت)ێ (مقدرەت)ێ لەسەر (کسابەت)، (حرفەت)، بزانن ئەتوانێ (نجوم)ی (کتابەت) ئەدا کات؟ وەپاش ئازادی نابێتە، سوالکەرو چەل ومل بە ملی (مسلّمان)آندا؟

(إبن جریر) لە (إبن عباس) و (مجاهد) و (عطای بن أبی ریاح) (نقل) ئەکا: (تفسیر)ی (خیر) بە مالّ. (أمّا) زۆر (لطیف) (ردّ)یان لێ ئەدا، ئەفەرموێ: "هەرچەند (مال) لە (خیر)ە، (لکن) ناگوترێ: (في العبد) بەڵکو ئەبێژرێ: (عنده)، یا (له)"، آفەرین!

(حقیقةً) بەکەسێ (صاحب) مالّ ناگوترێ: "فیه مال" لە (آیة)ی (إِنْ تَرَكَ خَيْراً) باشە، وە(عبد) ماڵی لە کوێ بوو؟

(واقعاً) (لازم)ە بۆ (مُفسِّر) (مجرّد) تەماشای (کلمه) نەکا، بێ (ملاحظه)ی (ماقبل) و (ما بعد)ی، وە(موقع) و (متعلقات)ی. ئەمانە دیویانە (إطلاق)ی (خیر) لەسەر (مالّ) ئەکرێ، لێرەش (حمل)یان کردۆتە سەر (مالّ) بێ (ملاحظه)ی (فیه) و (لَهُ) و (عِنْدَهُ). ئەو (أمر)ە بۆ (وجوب)ە، (ندب)ە؟ (خلافی)یە (مختار)ی (إبن جریر) (وجوب)ە. (واقعاً) (مختار) ئەمەیە، (أمر)ی (مطلق) لە (قرینه)ی (صارف)ە بۆ (وجوب)ە، (أمّا) (مراجعه)ی (سنّەت) (لازم)ە چونکی (تفصیل) حواڵەی ئەو کراوە. لێرە (قرینه)ی (ندب) نیە، ئەگەر لە (سنّەت)یش نەبێ، (ظاهر)، (وجوب)ە ﴿وَآتُوهُمْ﴾ (جمع)ێ ئەفەرموون: "(خطاب)ە لەگەڵ (سیّده)کان، خاوەن و(مالك)ی (عبد)و (مملوك)ەکان ﴿مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ﴾ (مراد) ئەو (مال)ە یە کە (کتابەت)ی لەسەر کراوە، کە پێی ئەڵێن: "(حَطّ)ی (نجوم)" نازانم ئەو (عبارەت)ە لەو (معنا)یە چۆن (إستعمال) ئەکرێ؟ بەڵێ (صحاب)آن لە (بعض)ی ماڵی (کتابەت) دەستیان هەڵگرتیە. (حضرەت)ی (إمام علی) ئەفەرموێ: "مقداری حط، رُبعه" (ممکن)ە لە (رأی)یە وەبێ. (زینبی بنتی قیس) (عُشْر)ی (حط) کردیە، (أبو أُسید) لە (سُدس)، (عبدالله بنی عمر) لە (سبع). وادەرئەکەوێ، بۆیە (مجتهدین) (خلاف)یان هەیە، لە (قدر)ی داشکاو. وە لە (قدر)ی (کتابەت) (متفاوت) بوویین. (طبعا) هەرکەسە بە (نوع)ی (کتابەت)ی لەگەڵ (عبد) و (جاریە)ی خۆی کردیە، وە(منع)یش نەکرێن (حضرەتی عمر) کتابەتی لەگەڵ (عبد)ەکی کرد، دووسەد درهەمی دایە، (عبد)ەکە ووتی: "بۆچی نای

هاوێیتە ناو (کتابەت)م؟" فەرمووی: "نازانم، دەگەمە ئەو وەقتەی یان نا؟" (إعطا)ی شتی لە ماڵ، (ظاهر)ی (عبارەت)ی قورآنە. (مختار)ی (إبن جریر) (سهم)ی (صدقات)ە (خطاب) لەگەڵ دەوڵەمەندانی (إسلام)ە، لە (زکات) بیاندەنێ (زاتا) ئەوانە لە (أصناف)ی (ثمانین)ن ﴿وَلاَ تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ﴾ جاریەتان. ﴿عَلَى الْبِغَاءِ﴾ زنا. ﴿إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا﴾ لە زنا. ئەوان إرادەی تحصّن بکەن، ئێوە إکراهیان بکەن، حقاً بێ مروەتی وبێ شرفیە! لئامتێکە فوقی جاریەتی! ﴿لِتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ بەڵێ ناموسی چی، شەرەفی چی، ماڵ دەست کەوێ. بعضێ ئەڵێن إکراهیان ئەکردن زنا بکەن، تا منداڵیان ببێ، مملوکیان زیاد بێ. أما ئەمە جێی توقّفە! ممکن بوو جاریەیان لە عبدیان مارەکەن، وەئەگەر لە حُرّانییش مارەکەن، أولادیان بۆ سیّدی داکیانە! ﴿وَمَنْ يُكْرِهُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِنْ بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ﴾ إکراه وتۆبزی سیّدەکان، لەوان! ﴿غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ جاریەکان عذاب نادا، ئەوان مُعَذَّب ئەبن. لە دونیا بێ شرفی، لە قیامەت عذابێ مقابلی ماڵی هیچ! ناشُکری نەبێ ئەمڕۆ نەبوو زاتی قیادەت پەناە (إبن أبی سلول)جاریەکانی خۆی بنێرێتە مسرحی (هولیود) بعد التعلیم لە فلمێ هەر یەکە هەزار ودوو هەزار دیناری تقدیم کەن. یالە جێی وەکی محلّەی کەللەچیانی بغدا، إحرازی رئاسەت بفەرموێ، لە جاریەکانی زێدە إستفادە بکات. فی الحقیقە (إبن أبی سلول) خسار بوو، پیاوی زەمانی غیرەت وناموس نەبوو! پیاوی دەوری ظهور وقووەتی إیمان و إسلام نەبوو! پیاوی زەمانی خلاعە وپارە پیدا کردن بوو! لەگەڵ أکثری أهلی عصری نور وحُرّیّة، هەم مشرب بوو.

وەممکنە بڵێن ئەگەر ئارەزووی مێردیان کرد، بە مێردیان بدەن، مجبوریان مەکەن لەسەر زنا، لە ترسی ئەمە مەبادا بعضە زەمانێ خزمەتتان لە قیس چێ! ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ آيَاتٍ مُبَيِّنَاتٍ﴾ والله وایە! ئەگەر زانابن، تێی ئەگەن! ئەگەر (فطرة) پاك بێ، إتّباعی ئەو آیاتە ئەکرێ! أما لە مزاجی أنامی ئەمڕۆ لە عصری نور ومدنی، عصری نهبی پارە پەیاکردن، عصری مودّت وخّلە و

صداقە، لە بینی نێرو مێ، دوورە إعتبار لە آیاتی بیّناتی قران بکرێ! نێزیکە إنسان بلّێ سوادی أعظم عدّوی قرآنە! ﴿وَمَثَلاً مِنَ الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلِكُمْ﴾ آثار وأحادیثی عجیبە، موافقی ما نحن فیه! أزجملە إفکي أمّی (عیسی) حضرەتی (مریم)ە، باوجودی ولدی بوو، جەنابی حەق تبریەی ئەکا! وەهەر کەسێ إیمانی بە إیمان وحسنی آداب وأخلاقی (مریم)ە هەبێ، تبریەی ئەکات! مندالێ بۆ (براءَتی) (مریم)ە هاتە گوفتار! جەنابی کبریائی -زاتی أقدس- خۆی آیاتی (بَراءَة)ی بۆ (عائشة) ناردە خوار. مەلایێ گەورە لە زەمانی (عبدالملك بن مروان) بە ایلچیەتی چووە (ئەستەمبولێ) لەگەڵ إمپراطور بعضە گفتوگۆی کرد، أز جملە سؤالی لە مسألەی إفکی (صدّیقە) کرد، مەلا فەرموی: "بەلّێ دوو ژنی گەورە تهمەتیان پێ کرا، یەکێ (مریم)ە یەکێ (عائشە)، (مریم)ە کوڕی بوو، أما (عائشە) لە مێردی خۆشی ولدی نەبوو!" بەو جوابە زۆر مخجول بوون؟ کە مەلا هاتەدەر گوتی: خوایە خۆت ئەزانی إیمانم بە براءتی (مریم)ە هەیە، أما مقام وای إیجاب ئەکرد دفعیان بە تەرزە بکەم. ڕاست ئەفەرموێ، إیجابات إنسانی مجبور ئەکا! گەلێ مەلا ترسی لە سەریان غلبە ئەکات، ناتوانن لەو نوعە مقامە چ بلّێن! لە زەمانی سابق یەکێ لە أدبای تورك مشهورە بە (قلینجی زادە إسماعیل حقّی) مدافعەکی لەسەر جنابی رسالەت پەناە کردبوو، هەرچەندە مەلایانی دینی لعنیان ئەکرد، أما قسەکەی زۆر لە جێ ئەچێ! ئەوان طعنیان لە رسالەت پەناە دابوو بە أنواعی طعن، ئەویش مفصّلاً جوابی دابوونەوە، لە فذلکەی مدافعە ئەلّێت: (محمد هەرچی هەبێ، خۆ داك و بابی معلومە، محصولّی نکاحی مشروعە).

بۆ مللەت هەموو نوعە أسلحە لازمە ﴿وَمَوْعِظَةً لِلْمُتَّقِينَ﴾ ئەگەر متقین لە گوێی بگرن. آیاتی بیّناتی إلاهی کەلە قرآنی کریم دایە، هەمووی نوری هدایتە، وعظ ونصیحەت وإعتبار حکمتە! کەسێ لە نوری إقتباس بکا، لە ظلماتی دونیاو آخرەت نجاتی ئەبێ بە مقصد ئەگا! ئەدی ئەو آیتەی ناردیە کە ﴿اللَّهُ﴾ە. زاتی أرحم وأقدس، مجرّد، لە أکدار ومیولی مادّیانە! حقاً ﴿نُورُ

السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ە. ظاهری بالذّاته، مُظْهِری أشیایه ئەو نوره آیاتی هدایەتی بۆ ئێوه ناردوه، تاپێی منوّر بن له ظلماتی آدابی جاهلی، بچنه دەرّ خودا نووره! رسولی نووره، سراجه! كتێبی نووره، ضیایه! علم نووره! إیمان نووره!. ئەو أنوارانه، به نووری عقلێ، درك ئەكرێن! نووری حواس، پێیان ناكەوێ! بۆ تێگەیشتنی حس پەرستان، تمثیل وتشبیهی معقول، به محسوس ئەكرێ! ﴿مَثَلُ نُورِهِ﴾ كتاب وآیاتی منزّل. (سیّد) تفسیری به أدله ئەكاتەوه، بەلاّم من رام لێ نیه! آیتی إلاهی، من حیث العبارة والمعنی والدلالة، ﴿كَمِشْكَاةٍ﴾ دەلاقه، پەنجەره نا، (كوه)یه (غیر)ە (نافذ)ە، وەك قوبّەیی كلاّو زرێیی (مشهور)ی (داودی)، لایەكی ئاچوغ بێ، ئەوه (نوره)كەی گرد ئەكاتەوه، بۆ یەك (جهەت) (توجیه)ی ئەكات. ئەگەر (مشكاه) تاقی دیواری بێ، دەوڵەمەندان شەمعدان وشووشەواتی تێدا دادەنێنن، با(مُشبّه بِه) بێ، بۆ (عبارەت)ی قورآن و (آیات)، یاخود بیكەینه (قلب) (كمصباح فی مشكاه) (ویعنی) (قلب)ی (صفا)ی (زیت) و (حفظ)ی (نور) له پەڕاگەنده (لیاقەت)ی داوەتێ، ببێته (مشبّه به) بۆ (نور) ﴿فِيهَا﴾ لەو (مشكاة)ەی دا ﴿مِصْبَاحٌ﴾ چرایه، رەوشنی (لامع) ﴿الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ﴾ لامپا یار قندیلی، كلۆپێ وەكی ئی كارەبا، دروست كرابن له (زجاج)ە ﴿الزُّجَاجَةُ﴾ بلورێ وەك شوشەیی ئێستا خاوێن كراوه، مینایه (مكدّر) بێ، ڕەونەقی نیه ﴿كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ﴾ (تلألأ) ئەكا، ئەدرەوشێتەوه، وەك ئەڵماسی پەرلاّغ. (مزایا) و (دقائق) و (معانی) (ثانوی)، له مەیانی (معنا)ی (عبارەت)ی، (معنا)ش لەناو (عبارەت)، هەموو پاك و خاوێن و (یلبغ) و ڕەوشەن و (لامع ) و (ظاهر) و بێ (كدورەت) ﴿يُوقَدُ﴾ چرایەكه له (وقود)ێ ﴿مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ﴾ له ڕونی داری، سەوزو حورّەم و بەبەرگ وبارو (حیات)ێ (قوی) ﴿زَيْتُونَةٍ لاَ شَرْقِيَّةٍ وَلاَ غَرْبِيَّةٍ﴾ له (موقع)ێ (متوسط)ە، نەك (نسبەت) به (أرض)، (نسبەت) به (مزرعه)، سبەینان زوو هەتاوی لێ ئەدا، زۆر لەبەر سێبەر نامێنێ، ئێواران زوو نسێ بەسەردانایه، (إستفاده)یه تەواو ئەكا له (شمس) (كه (مدار)ی (حیات)و (طبّاخ)ی (عالَم)ە

﴿يَكَادُ زَيْتُهَا﴾ لەبەر (صافی) وبێ (غشّ)ی ﴿يُضِيءُ﴾ (شعله)ی بدا ﴿وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ﴾ لە خۆڕا وەك (قوە)ی (کەهرەبائی) (أحکام)ی (نظریه)ی بە (براهن)ی (لامع) و (ظاهر)و (بدیهی) لە خۆڕا بۆ (إنسان) دێ، بەس (إحتیاج)ی بە (تصوّر)ی (موضوع) و (محمول) هەیە، (علی الاقل) وەك (قضایا)ی (قیاساتها معها)ن. لادانیان لە (وجە) (دەلالەت) لەبەر (قووّت) و (ظهور)ی (حدّ)ی (أوسط) بۆ ئەم (طرف) ئەو (طرف)، (غیر)ە (قابل)ە. (دلائل)ەکان (خالّی)ن لە (میل)، (تابع)ی (أفکار)ی (شقّی) و (غبی) نین ﴿نُورٌ عَلَى نُورٍ﴾ (ألفاظ) لەسەر (معانی) و (أحکام) و (مقاصد). لام وایە (تفسیر)ی (آیەت)ی (کریمە) بەو (نوع)ە زۆر (مناسب)ە، (منتظم)ە. (علما)ی (إسلام) لە (فلاسفە) و (أدبا) زۆر قسەیان لەم (آیەت)ە کردیە، (غایەت) (لطیف)ن ئەگەر چاك بهۆندرێتەوە ﴿يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ﴾ (لنوّرە) ﴿مَنْ يَشَاءُ﴾ ئەوانەی (فطرەت)یان نەگۆڕاوە، لەسەر (نور)ی (طبیعی) ماون، لە (ظلمات)ی (تقالید) و (عادات) ڕوونەچووبین ﴿وَيَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ لِلنَّاسِ﴾ (عامّ)ە، (غایەت)ی تێگەیشتنی ئەوێ، (إنسان) تێی بگاو پێی بگا ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ ئەزانی زۆر کەس لە (ضرب الأمثال) (إستفادە) ئەکەن، (عقل)ێو (خیال)ێی بە (قوەت) (مستغنی)یە لە (تمثیل)، ئی (غیر)ی (قوی) (إحتیاج)ی هەیە.

بنۆڕنە (علما)ی (هیئەت)، ئەو (أوضاع) و (أشکال)ە (عظیمە)ی کە هەموو (خیال)ێی پێی (ضبط) ناکرێ، وە (حسْ) نایگاتێ، چۆن بە (دوائر) (تمثیل)ی ئەکەن، ئەیهێننە بەر (نظر). هەروەکی چاو (خوف الضّوء)ی (عارض)، ئەبێتە سەر، (کذلك) چاوی دڵی هەندێ کەس لە ڕوناکی (عقل)ێی ئەترسێ، ناتوانی (ملاحظه)ی بکات، (حتّی) نفرەتی لێ ئەکا، زۆر پێ (متألّم) ئەبێ. (نور) بۆ (عقول) ئەگوترێ، (ملائکە) ئەڵێن: "(أجسام)ی (نورانی)ن" دیارە ئەو (أنوار)ە، (فوق)ی ئەو (نور)ەیە کە لە (نەوت) و (کبریت) و پووش پەلاش پەیا ئەبێ. (ثنوی) کە ئەڵێن: "خوای خێران (نورە)" نالێن: "ئەو (کیفیّەت)ە لە قشپلیش پەیا ئەبی" (إلە) (خێر) بە (نور) (تمثیل) ئەکەن، (کە (مدار)ی

(منافع)ی (بَشَر)ە، (إله)ی (شَر) بە (ظلمەت)، کە (مانع)ی دیتنە. ئەو چرایە لە کوێ خزمەت ئەکرێ، کێ خزمەتی ئەکا؟ ﴿فِي بُيُوتٍ أَذِنَ اللَّهُ أَنْ تُرْفَعَ﴾ بڵند کرێ، بۆ هەموو کەس وەك یەك، (مساجد)ی پاك و خاوێن ﴿وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ﴾ (وَحْدَهُ) ﴿يُسَبِّحُ لَهُ فِيهَا بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ﴾ (صباح) و (مساء)، سبەینێ و ئێوارە (تقدیس) و (تنزیه) لەگەڵ (نور)ی (صاف)ی بێ (کدورەت) زۆر (ملائم)ە. کێ (تقدیس)ی ئەکا؟ ﴿رِجَالٌ﴾ پیاو، بە (حق) (بنی آدم)، ئەو مەردانەی کە ﴿لَا تُلْهِيهِمْ﴾ (مشغول)یان ناکا ﴿تِجَارَةٌ﴾ تجارەت بۆ إنسانی دەوڵەمەند ئەبێ، (طبیعی) (تجّار) کاروباری زۆرە، جێی ئەوەیە (مشغول) بێ ﴿وَلَا بَيْعٌ﴾ کە خۆی بیکا، (ولو) زۆر بە (ربح) بێ ﴿عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ﴾ دیارە هەیانە (مشغول)یان ناکا. (أما) (رهبنە)و تەرکی دنیا لە (مغاران) بە (عبادەت) بەسەر بردن، کاری (إسلامەت)ی نیە ﴿وَإِقَامِ الصَّلَاةِ﴾ لە (أوقات)ی خۆی بەجێی ئێنن، ﴿وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ﴾ (زکاة)ی (فرض) لە (مال). (ذاتاً) (فائدە)ی دەوڵەمەندی، (مواسات)ی (فقرا) و (مساکین)ە، (لدی الأیجاب) خدمەتی (ملّەت) و (دەوڵەت) و (وطن)ە. ئەو (رجال)ە زۆر ئاگادری ئەو چرایە ئەکەن، نایەڵن بلورو لامپای گەرد بگرێ، ئەوانە لە کێ؟ (فقیر)ی (صابر) لە کێ؟ (سبحان الله)! (فقیر)ی بەستە دەست وپا، چی لە مست دێ؟ بۆ (أمەت)ی (محارب) کەڵکی چیە؟ (فقیر)ی بۆ (عالم)ی (إسلامیەت) زەهری (قاتل) بوو، (أکثری) دەوڵەمەندەکانیش، بەبێ هوودەماڵیان (صرف) ئەکرد، مزگەوتیان زۆر (بنا) ئەکرد، ئێستا مزگەوت لە (بغدا) ئەوەندە زۆرە، گەلەکیان (معطل)ن، خەریکن بیانکەنە (بعض)ە (مبانی) (نافع)ە بۆ (حکومەت). فەریادی چەند کەسێ (مانع)ە (وإلاّ) تا ئێستا ئەکرا، ئەمڕۆ نا، سبەی ئەکرێ (سبحان الله) (إنسان)یش وەك (طبیعەت) خەریکی بۆری وزۆری یە، گوایە (٢٢) مدرسەی هەبوو، ئێستا دووی لێ زیادە، بەخێو ناکرێ، بنۆڕە ئەو (إنسان)انەی لاوانەی (جبر)یان لە (جاریە)یان ئەکرد، بۆ (زنا)! (تفسیر)ی (زکاە) بە (إخلاص)ی (طاعەت) بێ (معنا)یە (ولو) لە (حِبْر الأمّة) (نقل) کرابێ. لام وایە لەبەر

(فیها)یە، (أمّا) لازم نیە، هەرچی ئەوانە ئەیکەن لە (طاعەت) و (عبادەت) هەمووی (فیها) بێ، (زاتا) (تجارەت) و (بیع) و بازار، لە مزگەوتاندا ناکرێ، (ممنوع)ە ﴿يَخَافُونَ يَوْمًا﴾ ڕۆژی واپەسین. ﴿تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالْأَبْصَارُ﴾ لە هەژمەتان وەرئەگەڕێن. إنسان ولو خۆی لە عذابدا نەبێ، کە أهوالی زۆر گەورەو بەدەهشەتی دیت، دڵی لێ ئەدا چاوی وەرئەگەڕێ. إیماندار لە خوا ئەترسێ، بە طاعەت مغرور نابێ! ئەوانە خەریکی أعمالی خیریَن، مع الخوف! ﴿لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا﴾ هەرچەند (ل)ی (تعلیل)ە أمّا ضِمْناً وعدە! أعمالێ ئەیکەن، صرف بۆ خوایە، بێ أمل و درۆو ڕیایە! وەکی رسلی عظام أجریان لە خوا ئەوێ! حسنیان بە أحسن جزا ئەداتەوە! ﴿وَيَزِيدَهُمْ مِنْ فَضْلِهِ﴾ ئەوی خۆی ئەیزانێ کە لە فضل و فیضی خوا بوەشێتەوە. ﴿وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ نایەتە ژمارە. دیارە أملیان دێنێتە جێ. ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بە نووری هدایەت و إیمان ﴿أَعْمَالُهُمْ﴾ ئی چاکە. ﴿كَسَرَابٍ﴾ لە کوردی ناوی نیە. لام ایە هەر نیە! أکثری جبالە، چۆڵی وصحرای بێ ئاوی کەمە، مەگەر لە دەشتی هەولێرو قەراج شتەك ببێ. لە ڕێیە لە دوور وادێتە بەرچاو، ئاوە حرکە ئەکات! ﴿يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً﴾ طبیعی لەبەر چاوی وان زێدە تمثُّل ئەکات، بۆی ئەچن، ئەوی تێنی نەبێ، دیارە مەیلی ناکات! ﴿حَتَّى إِذَا جَاءَهُ﴾ بۆ ئەوجێی بە ڕووباری ئەزانێ ﴿لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا﴾ چش! نە مُحقّق نە مَطنون! ئەوانە لە ڕۆژی جزا بۆ أعمالی خۆیان ئەچن کە ئومێدیان پێیە، گۆییا بە کەڵکیان بشێ! ﴿وَوَجَدَ اللَّهَ عِنْدَهُ﴾ عمل نیە. ﴿فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ﴾ جزای لایەقی خۆی. ﴿وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ بە هیچ مشغول نابێ، لە عملی خیری! ﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ﴾ عَمَلی شرّی، وەك تاریکیانە! ﴿فِي بَحْرٍ لُجِّيٍّ﴾ قوڵ. ﴿يَغْشَاهُ مَوْجٌ﴾ موجی بەسەردادێ. ﴿مِنْ فَوْقِهِ﴾ ئەو موجە. ﴿مَوْجٌ﴾ یەکێ دی، لەوی گەورەتر و بڵندتر. وهکذا یەك لە دوای یەك. ﴿مِنْ فَوْقِهِ﴾ بحر، یاشخص! ﴿سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ﴾ هەور، هەورێ تیروتار، حسب المواقع! ئەوەندە تاریك ئەبێ ﴿إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ﴾ بەرانبەری خۆی ڕابگرێ. ﴿لَمْ يَكَدْ

﴿يَرَاهَا﴾ نێزیك نیه ببیینێ. (به كوردی ئەڵێ: (چاو چاوی نابینێ!) لام وایه ئـەو شخصه له دەهشەتێ وادایه، ئاگای لێ نیه! رُئیەت به خروجی خطّی شعاعیه، یابه إنطباعه؟ ئایا أهلی لغەت شتی وەها ئـەزانن؟ وە بـەیان وتفـصیلی جـرح وتعدیلی مذاهب، بـه غـیری علـم فرۆشـێ، چ لزومـی تـری هەیـه؟. مـەلا مـەلابێ ئەتوانێ له (شرحی قۆشەجی) تۆمارێ بێنێتەدەر وەهەروەها له سائری كتبـی كلامی.

﴿وَمَنْ لَمْ يَجْعَلْ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِنْ نُورٍ﴾ لـه دونیـاو آخـرەت. مـەلا قـران ئەخوێنێ، تفسیری ئەكات، سبب بـه بگـره بـەردەی (نحـو) یـان (صـرف) یـان (بُلَغا) یان و (نقّالان) و (فقهـا) یـان، ئاگـای لـه نـووری آیـة نامێنـێ! ناشـوكری نەبێ إقتباسی لێ ناكا! علاوەی ئەمانه تفصیلاتی (إمام) و (سیّد) له فلـسفیات توسعی كردیه، ناتوانێ كه نووری پەیا كا، رۆژی عرصات تاریكه، پردی صـراط باریكه، (حقیقةً) رێی راست زۆر باریكه، بۆیه (أكثر) له (هداة)ی رێ ئاگایـان لێ نیه، لێی لائەدەن. جەنابی حەق أنـواعی أنـواری لـه مـەیانی عناصـر دانـا، مَـعَ الأسَـف كـشفی هیـچی نـصیبی ئێمـه نـەبوو! روومـان كـرده أنـواری مجـرّده، عالەمی فوقی عالم المادّه، ناشكری نەبێ نەگەیشتینه هیچ، گەڕاینەوە ظلمـات، تا پەلەكوتەمان كرد! عالەمی مادیّات گەلێ نوریان إظهار كرد. عالەم منـوّر بـوو علم تەرەقی كرد، أمّا علی الأكثر قلـوب لـه ظلمـاتی تقالیـد دامـاوە. هەرچـەند (رۆنتكین) به أعماقی بدن نفوذ ئەكا، بـەڵام ظلمـاتی إعتقادیّـاتی لانـادا! ﴿أَلَمْ تَرَ﴾ نەتدیوە؟ نەتزانیوە؟ ﴿أَنَّ اللَّـهَ يُـسَبِّحُ لَـهُ مَـنْ فِـي الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئەوی بێ نور نەبێ، ئەبینێ! به نظری تأمّل وإعتبار تەماشای كائنات ئەكا، لـه أحواڵی كائنات إنتقال ئەكا بۆ (معرفـةُ الله)، كـه فـوق الكائناتـه، لـه هـیچ شت إشتراكی حقیقی نیه، تَنَزُّه وتَقَدُّسی مَحْظَه! ﴿وَالطَّيْرُ﴾ ئەویش تسبیحی إلاهـی ئـەكا ﴿صَـافَّاتٍ﴾ وەقتـێ كـه بـاڵ لێـك ئـەدا بـەولاو بـەولادا راسـت لێكیـان ئەكێشێتەوە ئەشفرێ به سرعه! زۆر حكمته! دلیلی بـاهره لەسـەر كمـالی علـم وقدرەتی صانع! بەو حاڵه فرین بۆ طیره گەورەكانه، ئـەوانی گـچكه نـاتوانن وا

بەهـەوادا بـڕۆن بـاڵان زۆر لێـك ئـەدەن. إنـسان کـە ئەتۆڕێتـە صـفوفی قـازو قولێنگان کـە دەڕۆن و دێنـەوە بـۆ کوێستان ولـە کوێستان، حـیرەت ئـەیگرێ أساسی فکری فڕین لە بشری، تەماشا کـردن وتـدقیقی نظـر لـە فڕینـی طـیران بوو. ئێستا بنۆڕە صفی سربی طیّاران! بەلاّم مَعَ الأسَفِ إختراعی نصیبی ئێمە نەبوو! ! هەڵدەدەینەوە، أما عمل نیە! ﴿كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلاَتَهُ وَتَسْبِيحَهُ﴾ ئـی (شرع)ی (فطر)ی، هەریەك (عبارەت)ی خۆی ئەزانی، لە (لما خلق لە) (تجاوز) ناکـا بـە (غریـز)ە کـاری خـیرەت مەندانـە ئـەکات، لـە گـەڵێ (أمـور) (بـشر) (إستفادە)ی لە (صنع)ی (حیوانات) کردیە. (دقّەت) لە (تدبیری)ی (إلە)ی کـە، ئەو (طیر)ی وەکی (حیوان) لە (أرض)یدا (فرخ)ە هەڵدێنی، چونکی (فـرخ)ی (حسب الضرورة والفطرة) زوو دەڕوا، ئەوی ماڵـەکی بـێ، نافڕێ، ئـەوی چۆڵی بێ، وەکـی کـەوو سووسـکە، لەبـەر تـرس نـەختێ ئـەفڕێ، ئەگـەر تـرس نـەبا، هەندەش نەدەفڕی، ئەوی فرخەی لە هێلانەدا دەبێ، تاگەورە دەبـێ، لـە جێـی خـۆی (سـاکن)ە، نـاڕوا، دوای یـە چـاك ئـەفڕن، بـە (دوام) لـە فـڕین. (طـیر)ە حەواویلە، چونکی (أصلا) بەسەر عەردی دا نافڕێ، لام وایە لە هـەموو (طـیر)ێ زیـاتر لـە هـەوادا دەخولێتـەوە، زێـدە (سـبب)ی فـڕین و خولانـەوەی (طـیر) و (حیوانات) بو (طلب)ی (رزق)ە.

لە تحفەی (طبیّە)ی (فارسی)دا دیومە، باسی (نبات)ی ئەکا، ئـەڵێ: "بیخـی بۆ (عقم) إستعمال ئەکرێ، ئافرەتێ لەو رەگە بخوا، ئیتر ئـاوس نـابێ. ئەمـەش لە پڵنگ وەرگیرایە، پڵنگ بۆ (وضع)ی (حمل) (غایەت) (متأذّی) ئـەبێ، رەگـی ئەو گیایە ئەدۆزێتەوە، ئەی خـوا، جـاریتر ئـاوس نـابێ". تەماشـای کـە چـەند (عجایب)ە، ئەو (علم)ەی لە کـێ بـوو؟ کـێ فێـری کـرد؟ (محیّـر العقـول)ە، وە (سعي) (بشر)یش جێ‌ی (تقدیر)ە، وە (عُطالە)یی (کورد)یـش مـوجبی تکدیرە ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ ئەوی (کائنات) ئەی کا (لا يَعزُبُ عَن علمه مثقالَ ذَرّة) (الآیـة) ﴿وَلِلَّـهِ مُلْـكُ الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ چـۆن (إطاعـە)ی ناکـا؟ هـەمووی (مملوك)ە، چۆن (عبادەت)ی ناکا؟ ﴿وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ﴾ بە (فنا) بـە (بعـث) و

(حشر) ﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي﴾ (سوق) ئەكا ﴿سَحَابًا﴾ هەورێ (وَمِنْ التَّشَكّل) چاك دروست نەبوویی، پارەیە بۆ پارەیە ئەبا ﴿ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ﴾ لە (بين)ی (أجزا) لێك نێزیك ئەبنەوە ﴿ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَامًا﴾ (متراكم) (بعضه فوق بعض) ﴿فَتَرَى الْوَدْقَ﴾ باران ﴿يَخْرُجُ مِنْ خِلاَلِهِ﴾ لە (نوافذ)ی (مسامّ)ی، (تكونّ) و (تألف) و (تراكم)ی (سحاب)، (خروج)ی (قطرات)ی باران لە مەیانا، هەمووی (محسوس)ە (غایەت) چاو بە تەواوی (إحاطە)ی پێنادا، وەکی گەلێ لە مسائلی علمی هێنەت، معاونەی خیاڵی ئەوێ ﴿وَيُنَزِّلُ مِنْ السَّمَاءِ﴾ تەزرە ئەبارێنی، لە سحابی بلّند ﴿مِنْ جِبَالٍ﴾ سحابی لە چیایەکەوە نشأت ئەکا ﴿فِيهَا﴾ تیای هەیە ﴿مِنْ بَرَدٍ﴾ لە تەرزەی مادّە بلّوری طبقاتی هەوا لە بلّندی (متفاوت)ە، ئەو جباله عبارەتە لە طبقەیە بلّوری بۆیی ئاوەکەی دێتە خوار، تبلّور ئەکا وەك (بلّور) ئەدرەوشێ، ئەو طبقە لای أوائل نەزاندراوە، من لە بعضه کتبی مدارسی (رسمیە)م دیت، ئی (حکما)ی تازە، زۆرم لەبەر ئەو (آیەتە) پێ خۆش بوو ﴿فَيُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَصْرِفُهُ عَنْ مَنْ يَشَاءُ﴾ لە کوردی دەڵێ:" لە سەری کۆتری ئەدا، لە کلکی نادا".

(حقیقةً) (عجایب)ە، ئەو پارچە هەورانە ئەڕۆن، وەك ڕێیە (مخصوص)یان هەبێ، زۆر ئەبێ (مزرعە)یە ئەگرێ وێرانی ئەکا، (مزرعە)یە لە تەنیشتی وەیە، پێی ناکەوێ ﴿يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِ﴾ تەزرەی ڕاستی بێ (برق) نابێ، بروسکی سوورە دەنگی هەوری بە تریقە تریقە، ئەڵێی خەراری گوێزان هەڵ ئەڕژێنن! نێزیکە ڕوناکی بروسکەی ﴿يَذْهَبُ بِالأَبْصَارِ﴾ کە بردی، بە قوەت نایەتەوە، (أمّا) (إذهب بکتابی) وانیە، وەك ملایان ئەفەرموون، (فتأمّل). ﴿يُقَلِّبُ اللَّهُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ﴾ فصولی پێ ئەگۆڕێ (وەقت)ی باران و تەرزە لێ ی (ظهور) ئەکا ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِأُوْلِي الأَبْصَارِ﴾ ئەوی (نور)ی چاوی مابێ، لە (ظلمات)دا نەبێ، بە (نور) کۆر نەبوویێ، دیتن لەگەڵ (بصیرەت) نەبێ، زۆر (إعتبار)ی پێ نیە، چاو بۆ (حیوان)یش هەیە ﴿وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ﴾ ئەوی لەسەر (أرض)ی بڕوا، با ماسیش (داخل) بێ، (أمّا) جنّ و

ملك لێرە مناسبەی نیە. بەڵێ لە آیەتێ مشعرە بە إطلاقی دابّە لەسەر ملك. بالەوێ عام کرێ، معنایە مناسب لە دابّە بدرێتەوە، داخلی تری نیە ﴿مِنْ مَاءٍ﴾ لە دوای تقرّری أصول، (أمّا) لە إبتدای یعنی أوّلی سلسلە چۆنە؟ حقیقەتی مجهولە!

﴿فَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ﴾ وەك: مار، وەك: ماسی. ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ﴾ وك: (إنسان)و (طیور) ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ﴾ چوارپا، بەو دووی پێشەوە، ئەشڵێن: "دەست" (شکر): هەمووی (مَن)ن، (في الحقيقة) لەو تەرزە جێیە، بە (عاقلْ) و (غیر)ە (عاقلْ) (تفاوت) نیە ﴿يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ﴾ لە ناو (أرض) لە (هوا) (مرأی) و (غیر)ە (مرأی) (سبحان الله): (سیرە کێوی) زۆر پوو ئەچێ، گەڵێ جار هەڵی ئەقەتێنین، چەند (لفاف)ی لە (دوو)ە، لێکی ئەکەینەوە، کرمەکی (لطیف)، بە مرەنگی تیایە، خەریکی خواردنیەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئەوی شایانی (مقام)ی (ألوهیەت) بی، (زاتا) (خلق) (عائد)ی ئەوە، ئیدی (جمع) و (تفریق)ە ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَا آيَاتٍ مُّبَيِّنَاتٍ﴾ بۆ عمومی خلقی عام، آیتێ عامّە! بۆیە نافەرموێ (لَكُم)! ﴿وَاللَّهُ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾ با ئەوە بۆ ئێمە بێ. ئەوانەی بە بصری بصیرة تەماشای آیات ئەکەن، وەبە گۆش و هۆش گوێ لە آیات ئەگرن ﴿إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ راست ورەوان پێدا ئەڕون، مطیع ومنقاد ئەبن. ﴿وَيَقُولُونَ﴾ جمعێ ئەڵێن ﴿آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا﴾ الله ورسولە! ﴿ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّن بَعْدِ ذَلِكَ﴾ نزول وائەگەیێنێ دەرحەق شخصێ وارد بووبێ! جنّە مکان (سیّدی آلوسی) توجیهی (یقولون)ی کردیە، لکن تەماشای (فریق منهم)ی نەکردیە! دیارە ئەمە قولی یەك ودوان نیە! رحمە لە نقّالانی أسبابی نزول بێ. فریقێ لەوان إعراضی دێنێ لە مقتضای إیمان وطاعة، إطاعەی ئەوی و رسول ناکەن! ﴿وَمَا أُولَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ﴾ فریقی تریشی، وەکی وانن، غایەتی لێیان نەقەوماوە تا ظاهربێ! وەهەردوو لایان دیارە لێك وپێکن! بە إعراضی فرقەیێ مزخرەفی، فرقەی آخر هەم دەرئەکەوێ! دیارە ئەوە قولی بێ دەعوەتە ﴿وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ﴾ حکمی

رسول حکمی خوایە، وجریانی خصام ئەریبێ، لای وی ئەبێ! ﴿إِذَا﴾ مُفاجَئَـةً. ﴿فَرِيقٌ مِنْهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ نایەنیە لای پێغەمبەر، ئەزانن ئەدۆڕێنن! ﴿وَإِنْ يَكُـنْ لَهُمُ الْحَقُّ﴾ بزانن ئەیبەنەوە خصمیان ئەدۆڕێنێ ﴿يَأْتُوا إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ﴾ منقـادن. ئەو نوعە کەسانە لە هەموو عصریدا زۆرن. ئەگەر شرعیان بـردەوە زۆر مـسرور ئەبن ئەڵێن: ئەدی برام ئێمە بەچی موسڵمانین؟ دەستێ شرع بیـبڕێ، خـوێنی لێ نایە!.

ئەگەر بدۆڕێنێ ئـەڵێ: نـا والله هـیچ وانیـەو هـیچ! شـرعت گـۆڕی، ئـەمن بـە شرعی ناکەم دەچمە محکمەی مدنی! ئەگەر بشزانێ لەوێش بۆی ناکرێ ئـەڵێ: ئەچمە تجارەت! قەومێ هـەن جَسور بـێ أدب ئـەڵێن: شـرعیش بتـداتێ ئـەمن ناتدەمێ. شخصێ لە أهلی إیمان دائمـاً بـە تـسبیحات وصلواة وطالـب الجماعـة ڕۆژێ لەگەڵ کرمانجێ هاتنە لام بۆ شرع، زاتێ دِیانَةً پەناهی فـەرموی: قوربـان کەسێ عربە گەنمێ بچێنێ، پاش شین بوون نیوە عەربەی ئەوتۆیەی بە کەسـێ بفرۆشی، بەیعێ دێت؟ ووتم: نـا بـەیعی هاکذایی باطلـە! ووتـی: بـابم نـەمگوت حرامە، پارەکەم بدەوە دەغڵەکە بۆ خۆت! کرمانجەکە گوتی: باشە ئەوە هـەر بۆ ئەو ساڵ حەرامە یا هەموو وەقتێ؟ ووتم: ئەوە معنای چیە؟ گـوتی: قوربـان ئەوە چەند ساڵە ئەو زاتە معامەلەیێ هکذایی لەگەڵ مـن ئـەکات، هـەموو سـاڵێ مقابلی پارەکەی گەنمی چاك و زۆری وەرگرتیـە، بـێ دەنـگ وبـەنگ، ئەمـساڵ گەنمەکە کەمێ خراپە پێکبڕە لێیدا و بـاران کـەم بـوو، خـراپ ژیـاوە، مـع هـذا کیسەڵەشی بوو، ئەڵێ بابم بە شرع ئـەو معاملـە دروسـت نیـە. ئەگـەر ئەمـساڵ دروست نیـە، بـا سـاڵەکانی ڕابـردووش دروسـت نـەبێ، بەسـەر هـەردوو چـاوم، ئەوەنـدەی گـەنمت لێ وەرگرتیمـە بمـدەوە، ئەوەنـدەی پـارەم لێ وەرگرتـوی ئەتدەمەوە. منیش گەلەکم تکدیری زاتی دیانەتلوکرد، بە مخجولی ڕۆیی. ﴿أَفِي قُلُوبِهِمْ مَـرَضٌ﴾ حبّـی دونیـاو طمـع. ﴿أَمْ ارْتَـابُوا﴾ لـە إصـابەی حـەق ئەوزاتـە ئەمەیە؟ کو دەتوانی فصڵی قضاء بکات؟ ﴿أَمْ يَخَـافُونَ أَنْ يَحِيـفَ اللَّـهُ عَلَـيْهِمْ وَرَسُولُهُ﴾ جۆری لێ بکەن، حەقی بەدوو نەدەن. ئەوانـە هـەمووی هەیـە لایـان!

أمّا حماقەتە! بۆچى بە (لە) راضي نين. بۆ چى بە (عليە) راضي نين؟ هەر ئەو زاتەيە! ﴿بَلْ أُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ تجاوزێكى كەرانەيە. رۆژێ لە مزگەوت هاتمەوە مالێ تۆرپيم لە هەيوانێ دوو ئافرەت لە پشت پەنجەرە دانيشتينە، يەكێ جميلە يەكێ پير، لاى بابم شرعى ئەكەن، بابم رەحمەتى خوداى لێ بێ زۆر مطيعى شرع بوو، بەناوى شرع بانگيان كردبا كولانێ إطاعەى ئەكردن، وەلەگەلێ مخاصمان زۆر بالێ قوولێ بوو وە بە تحمّل بوو، چوومە خزمەتى لە هۆدە -بعد المحاكمە-، بە پيرەژنى فەرموو: حەق ئى تووە، جميلەكە گوتى: والله مەلا شرعت گۆرى. گوتى: نەمگۆرى. گوتى: گۆريت، گوتى: نەمگۆرى. گوتى: بەلێ والله گۆريت. فەرموى: نا والله نەمگۆرى، لە قسانت ديارە تۆ جميلەو تەنگ وتۆلى، ئەوى تر پيرەژنێ فەرت وفۆلە، بۆ پيرێژنێ فەرتووتى نافرە جا شرع ئەگۆرم؟ من تەمام بوو لێيان توورە بم دەريان بكەم، فەرمووى: آمان تحمّل كە! مادام بەناوى شرع هاتينە، چى دەلێن بابلێن. خلاصە موسلمانى بە رۆژوو نوێژ زۆرن، أما مطيعى حكم بە دلێ وجان زۆر نادرن. ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (مقتضى)ى إيمانە ﴿إِذَا دُعُوا إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ﴾ خصوص داعى غيرى دين ﴿لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ﴾حكمى قضائى ﴿أَنْ يَقُولُوا﴾ (بعد الحكم) ﴿سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ يا كە دەعوەت كرانە ئەمە، ئەمە بلێن. ديارە رفعى لازم مستلزمى رفعى ملزومە. كەسێ إيمانى هەبێ بە خوا، بە رسولى بەجزاى، (أمّا) ئەوەى خواو پێغەمبەر بفەرموون، إطاعە نەكات، هەرچى بەدى يە، دەرحەق أمّەت بيكا، ئەمە كوو (مؤمن)ە؟ إيمانى بێ أثر چيە؟ إنسان نازانێ بلێ چى؟ (معتزليەتى)، (أشعريەتى) لە ئێمەيان تێك دايە. خوايە خۆت ئەزانى بعضێ هەن، ناو (مسلمان): (أحمد) و (محمود) و سائرى ناو (إسلامى)، بۆ (مسلمان) و (مسلمانى) لە (عروس) و (فەرەنگ) خراپترن. فەرخە جوێ زيندى (مسلمان) بوو، چووە لاى ئاغايە، دەستى كرد بە دزى، ووتم: "تا جوو بووى، (مسلمان) لە شەرت (أمين) بوون، كەبووى بە (مسلمان) ئەوجا ضررت بوو." ﴿وَأُولَئِكَ﴾ مؤمن و مطيع ﴿هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ نازانم تعبيرى فلاح و فوز بە كوردى چۆن

بدەمەوە؟ ﴿وَمَنْ يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ (عن قلب) ﴿وَيَخْشَ اللَّهَ﴾ لە خوا بترسێ، (مانع) لە گوناهان (خشیەت)ە ﴿وَيَتَّقِيهِ﴾ کە (خشیەت)ی بوو، (تقوی) ئەبێ، خۆ ئەپارێزێ ﴿فَأُولَئِكَ﴾ ئەوانە ﴿هُمْ الْفَائِزُونَ﴾ ئەوانە بە (مطلب) ئەگەن، قانزاج ئەکەن، (ولو) لە (دعوا)ی (دنیوی) ماڵیان لە (کیس) بچی ﴿وَأَقْسَمُوا﴾ ئەو (مطلوب)آنە، ئەمە (عود)ی (علی إبتدأ)ە ﴿بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ﴾ سوێندی زۆر بە (قوەت)، (مؤکد) بە أنواعی (مؤکدات) ئەخۆن، ئەوی بە ڕاستی مسڵمان بێ، شتی (هکذا)یی (عرض)ی (رسالەت) پەناه ئەکاو سوێند ناخوا. لە (مواجهە) واسوێند ئەخۆن، وە(عرض)ی (رسول) ئەکەن، ئەگەر (أمر) بفەرموێ: لەماڵ دەرئەچین ئەگەر بۆ (جهاد) بێ، بەو (معنا)یە، ماڵ (منّەت)ی نیە سەر لە ئۆغرە، وە(إلا) (مقام) (مقام)ی (حرب) نیە ﴿لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ﴾ بە (خروج) لە ماڵ، لە سەروماڵ ﴿لَيَخْرُجُنَّ﴾ بە (کمال)ی (إطاعە)و (إنقیاد). (نقل)ی (کلام)یان (بالمعنایە) ، (عبارەت)یان (لَئن أمَرتَنا لنَخْرُجَن)ەیە ﴿قُلْ لَا تُقْسِمُوا﴾ سوێند مەخۆن، بەو (طران)ە، ئەوی ئێمە (طلبی) ئەکەین ﴿طَاعَةٌ مَعْرُوفَةٌ﴾ (حسب الإستطاعە) ئەمە زۆر لە (حد) بەدەرە. ئەگەر (مؤمن)ن وەك (سائر)ی (مسڵمان)ان لە (دائرە)ی (إستطاعە) (إطاعە) بکەن ﴿إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ (سر)و (علن) ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ وە(معلوم)ە خواو (رسول)ی (تکلیف) (بما في الوسع) ئەکەن ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا﴾ (إعراض) بینن (قبول)ی نەکەن، (ضرر)ی خۆتانە، (ضرر) بە (رسول) ناگا ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ﴾ (إدارە)ی (رسالەت) ئەو بە (إعراض)ی ئێوە، لە (إدارە)ی (رسالەت) سست نابێ، پەکی ناکەوێ ﴿وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ﴾ لە (تکالیف)ی (دنیا) و (عذاب)ی (آخرەت)، (قدرەت)تان نیە لە ژێر دەستی (رسول) دەرچن. ئەو لاساریەتان (محض) ی (ضلال)ە (ضلال)ێ بی (فائد)ە ﴿وَإِنْ تُطِيعُوهُ﴾ ئی (رسول)ی خوا بە دروستی ﴿تَهْتَدُوا﴾ ئەگەن بە (حق)، (نائل)ی (مطلوب) ئەبن. (إطاعە) بۆ وان، مایەی (سعادەت) و (سیادەت)ە، پێ ی گەورە ئەبن، ئەبن بە (تاج)ی سەری (أمم) ﴿وَمَا عَلَى الرَّسُولِ﴾ (في جمیع الحالات) ﴿إِلَّا

الْبَلاَغُ الْمُبِينُ﴾ (من آنچی شرط بلاغست باتو میگویم توخواه از سخنم پند گیر خواه ملال) (محقق) بزانن (رسولی أكرم) (طماع)ی لە مالی ئێوە نیە، (سعی)وی بۆ(سعادەت)ی ئێوەیە ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ﴾ بە (إيمان)ی ڕاست و دروست و بێ (نفاق) و (شقاق) وەك (سائر)ی (مسلّمان)ەکانی بێ (غلّ) و (غش) ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ ئەوەی بگونجێ و دەست بدا، بە گوێرەی (وقت) و (ظروف). (واقعا) (إيمان)ی بێ (عملی صالح) بۆفە، بێ (عمل)ە، هیچی پێ ڕێك ناکەوێ، وە ڕاستی بە (إيمان) (حساب) ناکرێ ﴿لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ﴾ (طول البلاد وعرضها) ئەکەوێتە ژێر (إدارە) و (تصرف)یان (تصرف) لە (ارض)ی ئەکەن، وەکی (ملوك)ان، یا ئەیانکاتە (خلفا)ی (امم)ی ڕابردوو ﴿كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ ئەوانەی (قوی الشكيمه)، (صاحب)ی (قدرة) و (دولّەت) و (سطوەت) و (مكنەت)، (إيرانی)یان و (رومانی)یان ﴿وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمْ﴾ ئەیانکا بە (ثابت) و (مستقر) (لايتزلزل)، (فی الواقع) (تمكن)ی (دين) لە (عز) و (إستقلال) ئەبێ. ئەوی (أسير) و ژێر دەستی (أممم)ی (أجنبی) (غير)ە (دين)بێ، (دين)ی وی چ (قرار) و (ثبات) و (مكنەت)ی هەیە؟ خۆی (تمكن)ی نیە، تا (دين)ی ببێ ﴿الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ﴾ (دين)ی مەردان، دینی بە (ناموس) و مەردو (غيرەت) و (شرف)ان ﴿وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا﴾ هیچ ترس نامێنێ، نە لە خۆیان، نە لە (غير)، ئەکەونە (أمن) و (أمان) ﴿يَعْبُدُونَنِي﴾ بە (كمال)ی (حريەت) ﴿لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا﴾ نە (شرك)ی (خفی) نە (جلی)، لەکەس ناترسن، (إحتياجی)یان بە خوانەبێ، بەکەس نیە، ئەوی (موجب)ی (شرك) نیە ﴿وَمَنْ كَفَرَ﴾ لە (دين) وەرگەڕێ، یا (كفران)ی (نعمەت) بکا، پێ ی (مغرور) ببێ، لە (إطاعە) دەرچێ، (شقاق) و (نفاق) لە (بەین)ی خۆ پەیاکەن ﴿بَعْدَ ذَلِكَ﴾ پاش ئەوە (يعنی) پێك هاتنی (موعود) ﴿فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ هەر ئەوان (خارج)ن لە (دائرە)ی (مَروَّت) و (إنصاف) و لە (شَرَف)ی (بَشَری). (حقيقة )خوا وعدی خۆی هێنا جێ، بە مدەکی کەم ظاهر بوون إستيلای جيهانيان كرد، بوونە سيدی ساداتی خۆیان،

إیران و رۆمیان فتح کرد، تاج و تەخت و عملی کسراو قیصریان بە تـالآن هێنـا. بێ خوف و ترس، إقامەی شعائری دینیان کرد. بـەلآم مَـعَ الأسَـف زۆر نەچـوو، لێیـان وەرگـەڕا متفـرق بـوون، بـە دەسیـسەی أجانـب بونـە دوشمنـی یـەك حکومەتی عەرەب لە شرق و غرب مەحو بوو، سنی و شیعی بەگژ یەکدا چوون، لە بەینی دەوڵەتی عثمانی و إیران حەرب دەوامی کرد، هەردوو دەوڵەت سـست بوون هێزیان نەما، ئەوروپا قیامی کرد، ڕوویـان کـردە ممـالیکی إسـلام صـبرە صبرە إستیلایان کرد، حکومەتی ایران طرفداری عروسي پێ چـابوو ئـەیکرد تـا وای لێ هات ایران بووە جەولانگاهی رووسی. نهایەتی حربی عمـومی چ إیـران چ طـوران، هـەمووی کەوتـە ژێـر پـای إنگلیـز. خـوا کـردی دووەلی غالبـە لێـك هەڵوەشان، بە تقسیمات راضـی نـەبوون، خـوا (مـصطفی کمـال)ی موفـق کـرد (عصمت پاشـا)ی بنـودی معاهـدەی (فرسـای) پارچـە پارچـە کـرد، إمتیـازاتی أجنبیان إلغا کرد. سبحان الله (بۆلشەویکی رووسی) زۆر بە سماحة بوون لەگەڵ (کمال)یـان. لەشـکرو أمـرای إنگلیـز و خُلفـا وولآتیـان بـەجێ هێـشت، إیـرانیش دەرچوو، ئەو أساسە بـە نیـوەی لـە بـەینی إنگلیـز و رووسـی تقـسیم کرابـوو! ئەمڕۆ چەند حکومەتێ لـە عـەرەب تـشکیلی کردیـە -گوایـا مـستقلن-). عِراق ،یمـن، مـصر، و نجـد، و حجـاز خـەریکی مـسألەی فلـسطینن. وفـدی عـەرەب چووینە (لندن) دەعوەت کراینە سەر مائدەی مستدیرە، بـزانن سیاسـەت چۆن دەوەران ئەکا؟! (إیران) لە سایەی (رضا شاهی پەهلوی) حیاتێ نوێی هاتیتـە بەر. (أفغان) باشە! گەرچـی صـدماتی ڕۆژێـی بەسـەر هـات، طغیـانی (بەچـکە سەقا) و و فراری (أمان الله خان) مع أسرەی مالکە غلبەی (نـادر شـاه) بەسـەر (بچکە سەقا)و، لە وەقتێ ناسك إغتیالی (نادر شاه)، خوفی دا بە موسڵمانان!! بـەلآم ئـەوروپا مـشغول بـوو، وەإلاّ ئـەڕۆیی. الآن رجـالی سیاسـەت وامـشغولن، رجالی علم نزاعیان لەسەر خلافەتی (أبـوبکر) و (علـی)یـە! ئـەو آیتـە دەلالـەت ئەکا لەسەر حَقیّەتی خلافەتی (أبوبکر) و (عمـر) و (عثمـان) و (علـي)، چـونکی ئەو وعدی إلاهی لە زەمانی وان هاتەجێ!! مەلای شـیعی آیتـی خێـر! لا تُـسلّم

ذلك به دوورو درێژ حتا لەو سالآنە مەلایێ شیعە تألیفێکی کردیە طعن لە (أبا هريرە)و أمثالی ئەدا. ووتم دەوجا بنۆڕە (أباهريرە)ی فقیری بە ستە زبان، تۆ ئەچی بەگژیا؟! بۆ ئێوە ناچن بەگژ (موسولونی) ئەوا إسلامیەت لە أفریقا مەحو ئەکا؟! دخلتان چیە بە سەربردەی لە (١٣٠٠) هەزارو سێصەد سالێ مُقَدَّم؟ (سَیِّدی آلوسی) لێرە مەیدانداری کردیە، (حقیقةً) نسباً (حیدری)یە أما مشرباً (عُمر)ی یە! أکثری مباحثی لە (توحفەی إثنا عَشَرّیە) هێنایتەدەر، ئەو کتێبە الآن لای منە مطالعەم کردیەو زۆر کتێبی قیمتدارە! ئەوو (منهاجی السُّنّي)ی (شیخی إبن تیمیة) شایانی إعتنان. ئەمە وا! ئێمە صرفی نظر ئەکەین لە ڕوایاتی (حَدَّثَنا فُلانٌ) تەماشای تأریخی بشر ئەکەین إستدلالە بە أثر دێنین نە بە خَبَرْ! بنۆڕە آثاری پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد شیرازی دین و دونیا تێك چوو. عالەمێ مرتد بوون، عالەمی دعوای رسالەتیان ئەکرد، شرذمەی ماوە، خۆیان زۆر بە ضعیف ئەزانی، راضی بە قضاو قدر، نوێژو ڕۆژی بکەن و بگرن، تا بزانن چییان بە سەردێت. (أبوبکر) بەو حالە قایل نەبوو ووتی: إلا حرب ئەکەم، ئەوی مرتدن ئەبێ بگەڕێنەوە یاخود بکوژرێن، وە ئەو کذابانە ئەبێ دفع بکرێن، ئالای رسول الله(ﷺ) نابێ بخرێ، لەشکر ئەبێ بڕوا بۆ لای (سوریە) حربی رۆم! ئەیهوو ئێمە لە چ حالدأین؟! (أبوبکر) لە چ فکردا؟! لێك دورین!! نهایەت إصراری کرد بالمجبوریە یارانی(مصطفى) (ﷺ) موافقەیان کرد. (ناپلیون)ی إسلام یعنی (خالدی بن ولید) بوە قائد—القائد الذي لم يُغْلَب— تاکو أمور ڕێك کەوتەوە، کذّابەکان نابووت بوون، دەست کرا بە فتوحات، هەم لە جهەتی (إیران) هەم لە جهەتی (ڕۆم). ئێوەو خودا بنۆڕن ئەمە چۆن بوو؟ والله دەهشەتە حیرەتە لەو هەموو گەرداوو گێژەلۆلەی فِتَن و مصائب دەرچون و سەرکەوتن! شتێ نیە قەلەم و زوبان بتوانێ بە تەواوی تحریرو توصیف، تقریرو تقدیری بکات! وە (عمر)یش فی الحقیقە عضدی (أبوبکر) بوو دینیان لە مرتد نجاة داو کردیانە مایەی حیاتی أمم. لە جێی تریشم نوسیە رجالی نایاب و نادر الوجود لە عالەمی تاریخ سێن، هەریەك لەگەلێ معاونی (١) (أبوبکر)

معاونەکەی (عمر) (٢) (محمد چلبی عثمانی) مؤسسی ثانی معاونەکەی (یعقوب پاشا) (٣) مُحْیِـی تورکیـا رەحمـەتی لێ بـێ (مـصطفی کمـال —أتـاتورك—) معاونەکـەی رئیـسی حـالی (عِـصْمَتْ پاشـا). تـا دِقّتیـان لێبکـەی مـتحیر ئـەبی دەهشەت ئەتگرێ! أمّا بَشَر بلّێم چی بعضێ ترجیحی (غانـدی) ئـەدەن بەسـەر (مـصطفی کَمـال) (لا حـول ولا قـوة إلاّ بـالله) قیاسـیان لێـك نـاکرێ. مـوقعی (أتاتورك) لەکێ؟ حالّ و وضعیەتی (غاندی) لە کێ؟ (حبزبون) رەحمەتی لێ بێ ئـەیوت: (غانـدی) بەکلکەتەشـی مقابلـەی طـوپ و طیـارە و أسـطولی بریطانیـا دەکات؟چشی پێ نەکرا! منیش وتوومە:

منیش هەروەکو غاندی هەناسە ساردو ماندی

لە قەومی کورد و هندی چی مقصود بوو نەماندی

ئەوروپای (أبوبکر) و (عمر) و (خالد)ی لە زومرەی نابغی و عبقری حساب ئەکەن. حتّـا تفـضیلی (أبـوبکر) و (عمـر) بەسـەر (ئەسکەندەر) و (فردریـك ی کـبیر) دا ئـەدەن، وە (خالـد)ی لـە (نـاپلیون) مـاهر حـساب ئەکـەن. ئەمـە وا ئەنورێ عـەرەبی رەش و رووت، بـێ دەرپـێ، عـەورەت نەشـۆرو لـچ ئەسـتوورو پیـسی بۆگـەن، مردۆخـی مـردار، دەرحـەق بـەو زاتانـە زوبـان درێـژی ئەکـەن، ئەمەش لە بێ أدبی مەلایەکانە، حقاً بێ تربیەن! إنسان دەرحەق پیاوی گەورە ولو دوشمـن بێ، قـسەی نـا لایـەق کـوو ئـەکات؟ مـن کـوو جنێـو بـە (هتلـر) و (موسولینی) بدەم؟ ئایا ئەوان لە جێیێ بن من ئەتوانم لەوێ ڕاوەستم؟ ئەتوانم پڕ بە چاو تەماشایان بکەم؟ إمپراطوری بریطانیا سـەرداری (٤٥٠) چـار صـەدو پـەنجا ملیـون نفوسـی بـشری مـن چـیم قـسەی سـووکی پـێ بلّـێم؟ گۆییـا مـن موسولّمانم؟ بەلّێ موسولّمانم! وە موسولّمان ئەبێ بـە تربیـەبێ! جنێـودان بـە گەوران چ مقتضای دینە؟ حاشا!. وە حضرتی (إمامی علی) بە علـم و بلاغـة و شـجاعة لـە نوابغانـە ممتـازە! ئـەی علمـای إسـلام لـە کلـی موقـع لـە مـواقعی خصامی حزبی عرضتان ئەکـەم (تلـك أمـە قـد خلـت، لهـا مـا کـسبت ولکـم مـا کسبتم ولا تسئلون عما کانوا یعملون) ئەو آیەتـە بـۆ چـی إهمـال کـرا؟ إلاهـی!

﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ بۆ تفرقة ﴿وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ ئەتوانی بلّێی مەلای شیعە زەکات ئەدا؟! مەلای سنّی لە ولاّتی ئێمە هێندەی نیە پێی بژێ، چ جایێ زەکات بدا! دەولّەمەندان زەکات ئەدەنە مەلا، أمّا هیچ! مەلاییّ بە قەدەری پیرەژنێ وەرئەگرێ؟ ئەویش ئەگەر لە مەنسوبانی دەرگا بێت، ئەوجا وەرە دین بنجوبنەوان بگرێ!! ﴿وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ سائری زەوات، رسولی ئێمە نین! ئەوەی لە إطاعەی رسول دابێ، ئێمەش بە أمری رسول، إطاعەی ئەکەین! هەموو گەورەو مصطفی بن؟ نابێ! ئەگەر خصوصیەتی أشخاص لە بەینا نەمابا، رێك ئەکەوتین! زاتاً هەر فرقە، هەر میللەتە، پابەندی کەسێکە، ئەوی تری لا چ نیە! ئەوەیە رێك کەوتن نابێ!! ﴿لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ بە ئومێد بن مغرور مەبن! دوای نیلی مطلوب، سعی بۆ دەوامی لازمە! لە پاش أمن، غافلّ مەبن، رابطەی إطاعە مەپسێنن! ﴿لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ لەسەر ئەو قدرەت وقووەت ومکنەتی هەیانە ﴿مُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ﴾ ناتوانن ئێوە عاجز کەن طرد کرێن لە أرض. أرض ئەبێتە مالّی ئێوە، هەراس ویأس بە دلّ مەدەن! سعی کەن، تێکۆشن! ئومێدم وایە بحول الله وقوّتە ئەوروپایی لە ئاسیا لە ئەفریقیا دەرکرێن هەموویان لە ئەوروپا خڕبنەوە یەکتر بخۆن وەکی ئاگری. ﴿وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ﴾ لە قیامەت. ﴿وَلَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ بە سوێندو بە مبالغە مأوایێ ناخۆش وخراپە! ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ إطاعەی رسول کەن، متأدّب بن بە آدابی فاضلە، ئاگاداری تربیەی عائلەی وی بن! ﴿لِيَسْتَأْذِنكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ واقعاً ظاهر لە عَبد، أمّا موقع مساعدەی عموم ئەکات. نێرومێ، لە وەقتی خلوەت، بێ أذن، نەیەتە سەرتان، وایان أمر پێ بکەن تربیەیان بدەن! ﴿وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنكُمْ﴾ حُرّ، عبد نا!. تەماشای خلافی فقهایان ئەکەی، نازانی بە ڕاستی ئەوانەی (حلم) کێیە؟ تا بزانی ئەوانەی نەگەیشتونە (حلم) کێن؟. نازانم صحابە کوو عملیان بەو ئایەتە کردیە؟! بەلاّم مناسبی مقام (أقلُ ما قیل)یە! وادیارە ئەوانە لە غیری ئەوسێ وەقتە، ئەتوانن شرعاً بێ إذن بچنە مالّی یەك! ﴿ثَلَاثَ مَرَّاتٍ﴾ سێ دفعە لە سێ وقتا. ﴿مِن قَبْلِ

صَلاَةِ الْفَجْرِ﴾ وەقتی بەخەبەر هاتنی عمومیە، وەقتی دەفعی حاجەتی دەست نوێژ وغسلە! وەقتی وەی نیە کەس بچێتە ماڵی کەس! حتّا طُفَیلی، ئەوانەی (لَم یَظهَروا علی العَورات)! ﴿وَحِینَ تَضَعُونَ ثِیَابَکُمْ﴾ جلکتان دادەنێن، خۆتان ڕووت ئەکەنەوە. ﴿مِنْ الظَّهِیرَةِ﴾ لەبەر گەرمی نێوەڕۆ، لەو وەقتەدا إنسان إستراحەت ئەکا، نان ئەخوا، لا قیدی لە ماڵی خۆی دادەنیشێ ولو زستانیش بێ. ﴿وَمِنْ بَعْدِ صَلاَةِ الْعِشَاءِ﴾ وەقتی نوستنە، چوونە بن لێفە. ﴿ثَلاَثُ عَوْرَاتٍ لَکُمْ﴾ أوقاتی کشفە. ﴿لَیْسَ عَلَیْکُمْ﴾ کە مەنعیان نەکەن. ﴿وَلاَ عَلَیْهِمْ﴾ عبدو ئەمانە! ﴿جُنَاحٌ﴾ جُنْحة، جِنایة تَشکیل ناکا. ﴿بَعْدَهُنَّ﴾ لە پاش ئەو أوقاتانە. عبدو جاریە، مملوکن، هاتوچونیان بۆ ناو ماڵ، ضروریە! ئەویتریش، بوون ونەبوونی، یەکسانە! لام وایە جنحە بۆ غیر مکلفانیش ئەبێ، خصوص کە نێزیکی بلوغ بوون! ﴿طَوَّافُونَ عَلَیْکُمْ﴾ ئەوانە. بَیانە بۆ علّەتی رخصەت. ئەوی بێ ئیش و بێ کارە، چی بەسەر منەوەیە؟ بۆ دێتە ماڵی من؟ ئەبێ بە خۆڕایی نەبێ! ﴿بَعْضُکُمْ عَلَی بَعْضٍ﴾ بعضێ دەور لە بعضێ ئەدەن، بناءاً علیە، رخصەت درایە! ﴿کَذَلِکَ یُبَیِّنُ اللَّهُ لَکُمْ الآیَاتِ﴾ آیاتی تربیە و حفظی شەڕەف. (حقیقةً)معجزەیە! (کفاك بالعلم في الأمّي معجزةً في الجاهلیة، والتأدیب في الیُتمِ)! ﴿وَاللَّهُ عَلِیمٌ حَکِیمٌ﴾ علم وحکمەت لەویە! بۆ إستکمالی نفس، آدابێ حەکیمانەتان بۆ وضع ئەکات! ﴿وَإِذَا بَلَغَ الأَطْفَالُ مِنْکُمْ الْحُلُمَ﴾ یعنی أحرار، لەبەر (منکم)! ﴿فَلْیَسْتَأْذِنُوا﴾ ولو مألوفیش بووبن لە پێشدان. ﴿کَمَا اسْتَأْذَنَ الَّذِینَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ رجال کوویان بۆ داندرایە، وا إستئذان بکەن! ﴿کَذَلِکَ یُبَیِّنُ اللَّهُ لَکُمْ آیَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِیمٌ حَکِیمٌ﴾ ئەوە شاهدە ئەو حکمە منسوخ نیە، ولو عملیشی پێ نەکرابێ. گەلێ شتی وا هەیە مساهلەیان تێدا کردیە!. ئەمشەو شەوی شەمو، بیست و یەکی، ماهی قوربان، لە مجلەی (کَلُّ شَيْءٍ)ی مصری ئی یازدەی شعبان (١٣٥٢هـ) دیم باسی لە قبیلەیێ أفزامی (ئەفەریقیە) کە لە غابات ئەژین و ژیان بەسەر ئەبەن، ئەکرد. لە مەیانی ذکری عاداتی بووك گوێستنەوەیانی ئەیوت: (دەست گیران لەگەڵ دەست گیرانی ممکن نیە پێك

بگەن و وێکرا قسە بکەن، إلا لە حضوری أهل وأقاربی. ئەو قومە زۆر بە إعتنان بۆ حفظی کچیان، کچێ خۆی بدۆڕێنێ یا لە مواقعی سوءی جێی تهمەت خۆی نەپارێزێ، بێ حرمەت ئەبێ کەس مارەی ناکات، نابێتە ژنێ صاحب ماڵ و مێرد، نایانخوازن، إلاّ بۆ خزمەتی زوجاتی صالحات). ووتم: سبحان الله أقزامی ئەفریقیە رعایەتی ئەو شرفە ئەکات، ئەوانی ئێمەش لە صدری صورەت چی ئەفەرموون؟! ل الحقیقە ئەو ئایەتە بۆ زانی و زانیە، سدّی عجیبە! وە رعایەت نەکرا! ئەوی رعایەت نەکرا، بە منسوخ حسابە! ﴿وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ﴾ دانیشتوو، لێ کەوتوو. ﴿اللاَّتِي لاَ يَرْجُونَ نِكَاحًا﴾ طمعیان تێدا نەماوە. ﴿فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَنْ يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ﴾ چارۆك ودەسماڵ و سەرپۆش. ﴿غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ﴾ مواقعی زینەتی خفی، دەرنەخەن! خۆیان والاّ نەکەن! ﴿وَأَنْ يَسْتَعْفِفْنَ﴾ بەخۆپۆشین. ﴿خَيْرٌ لَهُنَّ﴾ چاترە. ئایا مەبادا تووشی شتێ بن وەکی ئەڵێ: (لکل ساقطة لاقطة) (إبن منیر) ئەفەرموێ: (مراد ئەو پیرەژنانەیە کە زینەتیان نیە، تا تبرّج بکەن)!. ﴿وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ تَفَوّە نەکەن، ئەوە ئەبێ چ نازداریێ بێ خۆی پێچایتەوە؟ دڵی خۆتان لە وسواس وخطرات پاك بکەن! بۆیە نەیفەرموو (حکیم)، ئەو پەرژینی حکمەتە!!.

﴿لَيْسَ عَلَى الأَعْمَى حَرَجٌ وَلاَ عَلَى الأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلاَ عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ﴾ مفسّرینی کرام لە مناسبەی موقعی ئەو کۆرو شەل و نەخۆشانە، عاجزن! وبعضێ أسبابی نزولیان ذکر کردیە، لەگەڵ عبارەتی قرآن موافقە ناکاتَ بعضێ لە نامداران ئەڕۆن بۆ لای جیهاد، حقاً زۆر دوورە لەگەڵ ﴿وَلاَ عَلَى أَنفُسِكُمْ﴾ حرج نیە لەگەڵ ئەوانە ﴿أَنْ تَأْكُلُوا مِنْ بُيُوتِكُمْ﴾ ولَو مِثلي (زَمَخْشَرى- إمامي بلاغة) بەو توجیهە قیام بفەرموێ! لە فەرمایشی (سیّدی آلوسی) ئەزاندرێ لزومی مناسبە، نظر بە ترکیباتی نحویە، مثلاً جملە عطف کرێتە سەر جملە، ئەبێ وەهابێ معتبری هەبێ بە وجوهی بلاغە کە لە علمی (معان)ی ئەخوێندرێ لام وایە بۆیە زۆر إعتناء بە موقعی آیة لەگەڵ آیة (قبل) وە(بعد) ناکەن! خصوصی لایان لە قرآن دا إقتضاب هەیە!. أمّا ئەو نظریە لای من زۆر

قاصره! هەمویان ئەڵێن: (نَظمی قرأنی مدوّن، لەگەڵ ترتیبی نزولی مغایره) مادام وابێ آیاتێ مکّی، له کن آیەتی مدنی، که به چەند ساڵ مقدم نازل بووە، دادەندرێ، سؤال له مناسبەو وجهی ئەو نظمه ناکرێ! سورەتێ دوای سورەتێ نازل بوو، له کتابی مکتوب، به پانزده سورەت مقدّم ئەنوسرێتەوە، موجبی جلبی نظر نابێ! لزومی نیه توجیهێ وجیهی بۆ بکرێ!). من زۆرم مەراقه- لام وایه إعجازی قرآنی، لەو نظمەی دایه! هەر ئەمەیه، کتابێ (حسب الوقایع والحاجات المختلفه) نوسرابێ، دوایه جمع کرێ به نوعێ غایة لطیف ومنسجم ومربوط، رأساً علی عقب رعایەتی مواقعي وقوع نەکرێ!! بەڵێ ئەگەر دقّة بکەین ئەزانین ئەمه له طَوْقی بشر نیه، زاتاً کتێبی بێ وقایع وبێ ترتیب ئەبێ؟ بۆ نظم وترتیبی، ئەبێ له سلکی تأریخی دەریخەی، وه بیهاوێیه سلکی فکری وخیاڵی متسلسلن حلقاتی تێك هەڵکشاوەن!. ئیتر بابێینیەوه سەر تفسیری آیة، خصوص تفسیری آیة به (أعمی)، لەگەڵ حاڵی إنسانێ زۆر مناسب دێت که خودا بصیرەتی نەداتی بلاغەتی قرانی پێ دەرك کات! هەرچەند ظاهری عبارەت نفی (حرج)ه له کۆرو شەل و نەخۆش، أمّا مقصدی نصیحەتی صاحب ماڵه، بۆ تحمّلی مشقّه وإیذایان! دیاره ئەوانه وەکي إنسانی صاغ نین، خصوص بۆ خواردن، مرافقه له حەقیان زیتر لازمه! نوعاً ما به تکلّفن! ئەوانی صاغیش مراد تحکیمی قرابه دۆستیه، (حرج) لەسەر هاتنیان نیه! وه قسه له صاحب ماڵ ناکرێ! بەڵکو ئەو ئەبێ مسرور وممنون بێ، که ئەو خزمه ئەو دۆسته خۆشەویسته هاتینه ماڵی نانیان عافیێت کردیه! بۆیه (تعرّضی) بۆ نفی (حرج) فەرموه، تانەیکەنه معتادو دوری دائم، یعنی ئەگەر وا رێك کەوت، بأسی نیه! وه إشاره بۆ بێ فرقی و جیاوازی، بیوتی خۆیان مقدّم علي البیوت ذکر ئەکا. وەقسمێ ئەفەرمون مراد بیتی أولاده! ﴿أَوْ بُيُوتِ آبَائِكُمْ﴾ نەمدیتیه بڵێن: (وإن عَلی)، تا شاملی جدّ بێ! ﴿أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَاتِكُمْ﴾ من یەکم لەسەر قرائەتی (أمّهات) بکسرة الهمزة وفتح المیمي نەکەوتوه، خاصّه، یا شاملی جدّاتیشه؟ چ نافەرمون! رەنگه إکتفاء به بحثی إرث بکەن ﴿أَوْ بُيُوتِ

إِخْوَانِكُمْ﴾ برا. ﴿أَوْ بُيُوتِ أَخَوَاتِكُمْ﴾ خوشك. برازاو خوارزا باسيان نيه! ﴿أَوْ بُيُوتِ أَعْمَامِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّاتِكُمْ﴾ مام پوور. ﴿أَوْ بُيُوتِ أَخْوَالِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَالَاتِكُمْ﴾ له كوردى ئێمه به خوشكى داكيش هەر ئەڵێين (پوور)، كۆيى ئەڵێين: (پلك) به هەردووكيان. ئەوانه ظاهرن شوكر خلافيان تێدا نيه، بەلام إضطراب له ﴿أَوْ مَا مَلَكْتُمْ مَفَاتِحَهُ﴾ى دايه. به زەحمەت إنسان مفتاحى چەنگ ئەكەوێ! أنسب، مختارى محقّقەكانه! يعنى ئەوى له ژێر دەست و تصرّفتان دا بێ، مثلاً به وكالة، وەكو باغ ومێگەل وماشيه چێڵ وگامێش ومزروعات، خۆزيا بەشى صاحبيان دابا، له تصرّفاتى خۆيان گەردنيان آزاد بێ، بڕوام پێ بكەن باغەوانى خۆمه ئيشى پێم نەبێ، ميوەم بۆ نايەنێ، وكذا شوانكاره! ﴿أَوْ صَدِيقِكُمْ﴾ دۆست، حقاً دۆستى ڕاستى فوق الكلّه، زۆر ممنون ئەبێ دۆست بێته ماڵى شتى بخوا ئەوى لازمى بێ بێ پرسى بيبا. (مەلا أحمد چلبى) (ڕەحمەتى خواى لێ بێ) دۆستێ، براێ، برادەرێ، ڕەفيقێ چابوو. سەڵتەيەكى چۆغەى مەيلەو زەردم هەبوو، ڕۆژێ دەمەو بەهار چوو بووه ماڵێ طلبى سەڵتەكەى كردبوو، عائلەش تقديمى كردبوو، لەبەرى كرد، هاتە مزگەوت به تبسّم ووتى: ئەو سەڵتەم كڕيه ڕات لێيه؟ ووتم: ياخوا مبارەكت بێ زۆر باشه! له بينى بَشَرى عصر زۆر حقى لەسەرم هەيه، (مَعَ الأَسَف) بۆم ڕێك نەكەوت لەگەڵ وەرەثەى وەفادارێ لايەق بكەم — الفقر سواد الوجه فى الدارين—.

له زاتەكيان پرسى خزمت خۆشتر ئەوێ يا دۆست؟ فەرمووى خزم ئەگەر دۆست نەبێ بۆ چيمه! بەلام دۆستى جانى به ڕاستى زۆر كەمه، (خاصّةً) ئێستا! محبتى قلبى نەمايه هەمووى بويته سياسەت! حقاً سياسەت دنياى بەبادا! فضائلى مەحوو كرد! شەرەفى بَشَرى نەهێشت! ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَأْكُلُوا جَمِيعًا﴾ وێكڕا. ﴿أَوْ أَشْتَاتًا﴾ جودا جودا يەك يەك. له زەمانێ (حاجى حسن أفندى) له كۆيه قائيمقام بوو، ئێوارەێ رمضان مدعو بووين نوێژمان تەنها تەنها كرد، وێكڕا نانمان خوارد، زاتێكى گەورەى ميوان ووتى: ئەمه چۆن وا ئەبێ؟ ووتم ئێمه عادەتمانه نوێژ به منفردى ئەكەين نان به

جماعە ئەخۆین! ووتی: (حقیقةً) زۆر باشە!. ئەو حکمە غیر منسوخە، مادام خزمایەتی و دۆستایەتی و عواطفی إسلامیەت نەفەوتێ! ئەگەر گۆڕا، طبعاً حکم ئەگۆڕێ! زاتاً تا حکمی طبیعی نسخ نەبێ، حکمی شرعی نسخ نابێ! بێ بانگ کران نەچوویمە ماڵی هیچ خزمێ، دوور و نیزیك، أمّا چوویمە ماڵی (مەلا أحمدی چلبی) و (مەلا مصطفی مام یحیی) لە دۆستان، (حاجی کاکە أفندی کوڕی خاڵە مفتی) لە خزمان! حتّا نەچوویمە ناو باغی (نورالدین)ی برام، (مع أنّەُ) باغچەمان لە تەنیشت یەکە لە چنارۆك! برایێ واشە ئەگەر هەموو باغەکەی لە ڕەگ وریشە دەرێنم پێی ناخۆش نیە، وە بە هیچ وجە خۆی بە صاحب ماڵ نازانێ! خوا لێکمان نەستێنێ وازوو!!!. ﴿فَإِذَا دَخَلْتُمْ بُيُوتًا﴾ لەو بیوتانە! ﴿فَسَلِّمُوا عَلَى أَنفُسِكُمْ﴾ لە خۆتان. دیارە بِنا لەسەر یەکیەتیە، وە إستئناس هەیە! ﴿تَحِيَّةً مِنْ عِنْدِ اللَّهِ﴾ ثابتی بأمرە بێ، مشروع بێ!.

﴿مُبَارَكَةً طَيِّبَةً﴾ لە طیّب النفس بۆ طیّب النفس. ﴿كَذَلِكَ﴾ بەو طرزە. ﴿يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ﴾ دائر بە آدابی معاشرە. ﴿لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ حسنی آداب. قیام وقعود چوونە لای یەك، لەماڵی یەکتر نان خواردن، بە مناسبەی خزمایەتی ودۆستایەتی و تعاون، لە نتائجی عقڵە! مواکلە لەگەڵ بێ دەسەڵاتان، مقتضای أخوّەتی دینە! وەلازمە بزانن ئەو تربیە بۆیە نیە دەرگا لێك ببەستن هاموشۆ نەکەن لە غیری ئەوانە! ئەو آیاتە کأنە بۆ دفعی توهُّمە ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ بە إیمانێ إجلالی حبّی داعی بۆ إطاعە، إیمانی أجوف چ نیە، ولو بۆ قیامەت بە کلکی صاحبی بێ، بۆ هیئەتی إجتماعی بۆفە! ﴿وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَى أَمْرٍ جَامِعٍ﴾ أموری عامّەی هامّە، وەك حرب، ئەوی إحتیاجی هەبێ بە مشاورەو معاونە! لام وایە جێی نوێژی جمعە وجێژنە و إستسقا نیە! ﴿لَمْ يَذْهَبُوا﴾ بەلایێ ترا نەڕۆن لە جەنابی رسالەت پەناه دانەبڕێن! ﴿حَتَّى يَسْتَأْذِنُوهُ﴾ إستیذانی پێشی بۆ دخولی بیوت بوو! إستیذانی ئێستا بۆ خروجە! ئەگەر إذنی دان بچن، وەإلّا نەڕۆن! لە هەردو حاڵ مخلص بن! ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ﴾ مطلقاً، یا (إذا كانوا على أمر جامع).

﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ بە ڕاستی ودروستی، ظاهر وباطن، طیّب وطاهر. ﴿فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ﴾ طبیعی مؤمن لەو نوعە وەقتە بۆ کاری زۆر مهم نەبێ طلبی رخصەت ناکا ﴿فَأْذَنْ لِمَنْ شِئْتَ مِنْهُمْ﴾ ئەوی هەوەست لێ بێ إذنی بدە! دیارە ئەو زەواتە فرقیان هەیە! بعضێ وەکی (صدّیق) و (فاروق) أرکانی رأی وتدبیر، إذن ناخوازن! وەإذنیش بخوازن إذن نادرێن! ئەوانەی لە إذن درانیان چ خلل نەبێ وەطلبیان مُوَجَّهْ بێ، إذن ئەدرێن!. لێرە (سیّدی آلوسی) مسألەی تفویضْ –مع إختلاف الأصولیون– بەیان ئەکا: بۆ خوای دروستە تفویضی حکم بلێ: (أُحْكَمْ بِما شِئْتَ فَإِنَّهُ صَوابٌ؟). الحق نیزاعێ بێ معنا، وە لێرە ئەو تفویضە نیە! کارێ مهم بوو إحتیاجی ئەکرد موسڵمانان کۆببنەوە، تدبیری لێ بکەن، قرارەکی لەسەر بدەن، هەندێ زەوات مقصودەکی خصووصیان بوو لایان ملتزم بوو، ئەوانە بۆیان دروستە طلبی إذن بکەن! رسولیش مختارە لە إذن لە منع!. ئەمە تفویضی مطلقی تێدا نیە تا ببێتە دلیل بۆ تفویضی مطلق بۆ مجتهد! ﴿وَاسْتَغْفِرْ لَهُمُ اللَّهَ﴾ بەڵکو (خلل) مای نەبێ ﴿إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ خصوص تووشی طلبی غفرانیان بۆ بکەی، خوا لێیان خۆش ئەبێ! بحولە مرامیشیان دێتەجێ. ﴿لاَ تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ﴾ بانگتان بکا بۆ أمرێ ﴿كَدُعَاءِ بَعْضِكُمْ بَعْضًا﴾ طبیعی قیاس لێك ناکرێن، چونکی دەعوەتی رسالەت پەناە بۆ حیاتە، سعادەتی دنیاو قیامەتە! (حقیقةً) ئێرە جێی دوعاء بە معنا تَضَرُّعْ وپاڕانەوە نیە، وە لو کە دوعای رسالەت پەناە مقرونی إیجابەیە! دوعای رەسول دوعای خەڵکی دی، لای خوای وەکی یەك نین! ئەگەر وابا، ئەیفەرموو: (لا أجعل دعاء الرسول کدعائکم)! لام وایە کەس بە وەهم وگومانی دانانێ، ئەو تساویە!. حقّاً حملی دوعا لەسەر پاڕانەوەو طلبی مأمولی لە خوا، نوعە تسلّەکە ﴿قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الَّذِينَ﴾ ئەڕۆن بێ إستیئذان ﴿يَتَسَلَّلُونَ مِنْكُمْ لِوَاذًا﴾ لە پەنای ئەم و ئەو بە دزی، صَبْرَه، صَبْرَه ئەچنە دەر، خۆیان ئەدزنەوە، ئەگەر لە رسولیش بزر ببن، لە خوای بزر نابن! ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ﴾ دەعوەتی

فەرمایشی. ﴿أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ﴾ بە بەلایێ گرفتار ببن. زۆرمان دیتیە كەسێ لە كارێ خۆی ئەدزێتەوە، تووشی مصیبەتێ ئەبێ بە هیلاكەتی ئەدات. حتّا دێتە یادم لە أوائلی حربی عمومی شخصی لە أهالی أطرافی كۆیە هەلاتبوو، هاتبۆوە بۆ دێی خۆی، لە نێزیك دێ، سەگ بۆی دێن، دادێتەوە بۆ بەرد، لە پشتەوە سەگێك گونی ئەگرێ ئەیپچڕێ، زۆر نەچوو مرد. شخصێ لەو چەندانە لەبەر إجباری دائماً لە شاخ دەبێ، نایەتە ناودێ، شەوێ چەند زەلامێكی تووش دێن ئەیكوژن، كەلەشەیان هێنا سەرای حكومەت (في الحقيقة) ألآنیش ئەو نوعە تخلفە تأثیری هەیە، أمّا خەلكی عبرەت ناگرن. ﴿أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ لە ڕۆژی جزا. ﴿أَلاَ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ هەرچی هەبێ بە كلّی (وجە)ئی وییە. ﴿قَدْ يَعْلَمُ مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ﴾ حالّی حاضر لە أحوالّ وأوضاع إخلاص ونفاق. ﴿وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ﴾ ئەوانی متسلّل ئەمرۆ خۆ ئەكێشنەوە، بۆ كوێ ئەڕۆن؟ رجوعیان بۆلای خوایە! دەرناچن! كردەوەی خۆیان ئەبینن چەند قبیحە! ﴿فَيُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا﴾ إعلامیان بە جزا ئەكا. ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ چی لێ گوم نابێ! نوور شت ظاهر ئەكا، كوو شتی لێ بزر ئەبێ؟!

ئەی نوری سماوات وأرض! ئەی نووری سەروەری! حفظی مجد وشرف وعرض ناموسی موسلّمانان، تَفَوّقی شرق لەسەر غرب، إنعامی عام بە نشری نووری إسلام بكەی!!.[1]

---

[1] ـ تەواو بوو تفسیری سورەی (نور) ڕۆژی دووشەموو بیست وسێی مانگی قوربان، ٣١ مانگی كانونی ثانی ڕۆمی، سنەی ١٣٥٧ هجری.

# سورەتى (الفرقان)

سورەتى (فرقان) مكيّە، ولو (إبن عباس) ئەفەرموێ: إلاّ آيتـى (٦٧) (٦٩) و (٧٠) سێ آية! عَددى آيـاتى (٧٧)ە، (سـيّدى آلوسـى) ئەفـەرموێ بـێ خـلاف! وە(زمخشرى) ئەفەرموێ پاش سورەى (يس) نازل بووە! بۆ لێرە إيراد كراوە؟ لا سؤال ولا جواب!! ئەمە سەيرە لە (ضحاك) نقلە ئەو سـورەتە (مـدنى)يـە إلاّ أوائلى نەبێ، تا (نشوراً)، ئەوەندە مكيّە! مـع أنـە ئێمـە يـەكمان لەسـەر ئەمـە نەكەوتووە، مناسـبەى ظـاهرە، نـور، فرقانـە! فـەرقى أشـياو دەركـى متوقّفـە لەسەر نور!

پاش ئەوەي أهلـى نظـر، صـاحبى بـصر، سـورەتى (نـور)ى ملاحظـە كـرد ئەڵێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾ (حقيقةً) فضل ڕەحمەتى إلاهى، بۆ وى، زۆر نومايان ئەكا. خاصةً لە سموّ وعلوّو نزاهـەت و آدابـى ، نـوورى هدايـە، سراجى منير، رسالەت پەناە، مقابلى ئەو ظلماتى إفك و أفّاكانە كە بە كمالى رزانة وحلـم ووقار ئەينوينێ! پاشى (بسملە) ئەڵێ: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي﴾ نـوورى سمـاوات وأرض خاوەنى خێرو بەرەكەت ﴿نَـزَّلَ الْفُرْقَـانَ﴾ كتـابى فاضـل، بَيْنَ الحـق والباطـل! ﴿عَلَى عَبْدِهِ﴾ ئەو عبدە خالصە، مختارە، ممتازە، نوورى هدى، خۆشەويستى خـودا! ﴿لِيَكُـونَ لِلْعَـالَمِينَ نَـذِيرًا﴾ بـۆ (جـن) و (إنـس) و (عـرب) و (عجـم). (إرسال)ى (رسول)ى بە (إنذار)، (عين)ى (ڕەحمەتە) زێرا (طبع)ى (بَشَر) لەبەر (خاطر)ى (بعض)ەكان، ئەڵێم: "على الأكثر" بە (إنذار) نـەبێ، نايەتـە ڕاى. بـۆ (ردع)و (زجـر)ى ئەوانـەى، (إقتراحـات)ى (آتيـە) ئەكـەن، (نـذير)ى زۆر (مناسب)ە. (معنا)ى (بركـەت)، (حتّـى) (كـورد)يـش ئـەيزانێ، خـەرمانى هـەڵ

ئەگرێ، زۆری ئەکا، ئەڵێ: بە(برکـەت)ە" (حقیقةً) (إرسـال)ی ئەو (رسوله كريم)ە، بۆ (خلاصی بشر) له (ظلمات)، خیرەکه فوقی (کلّی خیرات) خوای (تعالان)، بـه (برکـەت)ی خۆی لـەو خێرەمان محروم نـەکا. (واقعاً) (سوادی أعظم) له إنسان ئەمڕۆ لەو خێرە محرومن، له ظلماتی هـواو هـەوەس و فـسق و فجور و خلاعەتدا، ڕۆچووین.

(إستكراه)ی هدایەتی (رسل) ئەکەن. وابزانم ئەوانەی ئەفـەرموون: "جنـابی رسـالەت پـەناه، مبعوثـه، حتّـی بـۆ جمـادات" ئـەو جـۆرە حیـوان و جمـادەی مراده، ڕوحی فضائلیان نەماوە.

بعضێ قرائەت هەن، إنسان له توجیەیان عاجزە خۆزێ نقل نەکرابان، کـوو له (صدری إسلام) قبولێ نەکران، دواییش دەرنەخرابان ﴿الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ (خلق)ی (عامّ)ە، (دعوەت)یش (عامّ)ە ﴿وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا﴾ نـه بەشـەر نه مطیع نه عاص نه(مَلَك)، (تميّز)ەکی وای نەدايتـه کـەس، بلـێ‌ی (نوعـاً مـا) (توهّم)ێك بڕوا، بۆ نازلـه ومنزلـه کردنـی ولـد. (إتخـاذ) نیـه، فـضل لـه بـوونی. (فرضـاً) (عیـسی) لـه سـاعەتی (ملیـّون)ی نفـس زینـدی کاتـەوە، (نقـض)ی (ظاهر)ە، (حیات)ی به خواردنه (علم)ێ وکی (علم)ی خۆی، (قدرەت)ێ وەکـی (قدرەت)ی خۆی. نادا به کـەس (ممكن) نیـه. (مقتـضا)ی (ذات) نابەخـشرێ، (إختیار) (مداخله)ی نیه ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُ﴾ نه بـه (إذن) نەبـه (تفـویض) ﴿شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ﴾ (مقابل)ی (ذات)ێ (مستقل) (غیر متفرع) لەوێ، (حتّـی) (شـریك)ی هـەموو مـوڵکی بـی ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ (وحـده) بـێ (معـین) لـه (جمـادات)و (حیوانات) و (نباتات). (أصول) به تەواوی (زێده)و (نقص)ی نیه. (مواليد)یش به (تطوّر) له (تجدّد) و (تكرّر) دایه، (داخل)ی (قواعد)ی (طبیعی) کرایـه، هـیچ (خالق)ی تری پێ ناوێ ﴿فَقَدَّرَهُ﴾ به (إعتبار)ی (خلایـا)ی (عُـرض)ی (مـزاج)، (مقدار)ەك ڕوناکی (کهربائی)و (أجزا)ی (عناصر)، له چی ئـەبێ؟ چۆن ئـەبێ؟ بۆچـی ئـەبێ؟ چـی لێ ئـەبێ؟ ﴿تَقْدِيرًا﴾: (بـدیع)و (عجیـب)و (محیّـر العقـول) (قوم)ی له (أوائل) بەخوا ئەڵێ، "(مهندس)ی (أعظم)" (الحق) (بسێ نادراست

هندسەیی کردگار) ئەگەر (أشاعره) لێ ی گەڕێن، ئەڵێم: کیمیا گەری (أعلم). (ذاتاً) (علم)ی (صانع) (علم)ێ (عملی)یە، (علم)ی (کیمیائی)و (میکانیکی)یە. (تصوّر) و (تصدیق) بۆ (نظریات)ە، (عمل) شتێ تری گەرەکە. ئەو (خلق)ە (بدیع)ە بێ (علم)و (قدرەت) و (تدبیر) نابێ، (بلا) (علم) (صنع)ی (بدیعی) (عقل) نای هینێ ﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ آلِهَةً﴾ (أساساً) نیە، دروست کردن وهەڵبەستنە ﴿لاَ يَخْلُقُونَ شَيْئًا﴾ لە (طراز)ی (فطری) ﴿وَهُمْ يُخْلَقُونَ﴾ ئەگەر (فرضنا) (خلق)یش بکەن (مادام) خۆیانیش (مخلوق)ن (إله) نین. (أدیسون) ڕۆژێ لە (سیّارە) دێتە خوار، نینۆکەکی (عذاب)ی ئەبێ، بە (رفیق)ی خۆی ئەڵێ: "هەرچەند من (مخترع)م، (أمّا) لە (صنع) و (ترکیب)ی نینۆك (متحیر)و (عاجز)م". بەڵێ ئەوانی (مخترع) (إیمان)یان بە خوا لە (غایەت)ی (فوق)ە. دیارە بت و (أصنام) و (هیاکل) (أثر)ی (صنع)ی (بشر)ە، (مع أنه) (صانع) (مصنوع)ی خۆی ئەپەرستێ، بە (ممثل)ی (معبود)ی ئەزانێ. (بشر) تا بڵێی سەیرە (ألعیاذ بالله) ئەگەر (تصوّر)ی (تمثیل) بکەین (بشر) بۆ (ممثل)ی لە (فوق)ی هەموو (کائنات)ە (صوفی) کە بە سەی ئەڵێ: "هذا ربّی" زۆر غافڵە، أحمقە، ئاگای لە (مسلك)ی خۆی نیە، نازانێ (حصّە)ی (وجود) لەوی، (فوق)ی (حصّە)ی (وجود)ە لە (حیوانات) بەس (شێخی عربی) (تفطّن)ی بۆ ئەو (دقیق)ە کردیە ﴿وَلاَ يَمْلِكُونَ لأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلاَ نَفْعًا﴾ خۆیان (عاجز)ن لە (دفع)ی (مفسد)ە، وە(جذب)ی (مصلحه) ﴿وَلاَ يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلاَ حَيَاةً وَلاَ نُشُورًا﴾ مردن وژین و(بعث)یان، بەدەست نیە ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ لە قریش و سائری کفّاری أهلی کتاب، سوادی أعظم، وا ئەڵێن ﴿إِنْ هَذَا إِلاَّ إِفْكٌ﴾ درۆی بێ (وجه) ﴿افْتَرَاهُ﴾ خۆی هەڵی بەستوە، (وحی) (إله)ی نیە ﴿وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ﴾ لە (أنصار)و (أعوان)ی لام وایە، چونکی (أساس)ی ئەو (تفوّە)ە لە (طرف) خزمانی (قریش)ی (مکّە)ی بوە، (ضحّاك) ئەفەرموێ: "لەو (آیەت)ەوە (مدنی)یە" بەڵام ئەوە لازم نیە ﴿فَقَدْ جَاءُوا﴾ ئەو (کافر)انە هینایان، لە خۆڕا هەڵیان بەست ﴿ظُلْمًا﴾ (ظلم)ی (عظیم)یان هینایە ﴿وَزُورًا﴾ درۆیە لە

(إحتمال)ی (صدق) دوور. (مستشرق)ەکانی ئێستاش دەڵێن: "بعضه کی لە وحی یە"، (أما) (وحی) لای ئەوان بۆ (رسل) لە خەون دا ئەبێ، "(بعض)ەکی لە (تورات) و (إنجیل) وەرگرتیە، وە (بعض)ە معلوماتی خۆی علاوە کردیە" ﴿وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾ حکایاتە ﴿اكْتَتَبَهَا﴾ گۆی یا خۆی بۆ خۆی ئەی نووسیێتەوە ﴿فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ﴾ بەسەریا ئەخوێندرێتەوە بۆ (خاطر)ی (حفظ)ی کا ﴿بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ سبەینەو ئێوارە یاخود دائما ﴿قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ أسرارو حکم و أخبار ومزایاو لاهوتی قرآنی شاهدە، کە لە طرف (عالم السر) ناردراوە. لە دنیا مأخذی حق و (حقیقە)ی (تورات) و (إنجیل) بیان ئەکا، تحریف و تبدیلی (أهلی کتابین)، (ضلال)و (إضلال)یان إظهار ئەکات. ئەڵێن هەشت ئایەتی لە حەق (نضری کوڕی حَرثی بنی کلای بن علقمە بن عبد مناف) نازل بووە. چوو بووە (حیر)ە حکایاتی شاهانی (إیران) و (ڕۆستەم و ئەسفەندیار)ی فێر ببوو، کە پێغەمبەر لە مجلسی أحواڵی أممی بائدەی بەیان ئەفەرموو، کە پێغەمبەر ئەڕۆیی، دەچوەجێی وە، ئەی گوت: "ئەی (قریش) وەرن، گوێ ڕاگرن حکایاتی من لە أحادیثی (محمد) خۆشتر و جوانترە" ئەوجا حکایەتی ملوکی فارس وڕۆستەم وئەسفەندیار بۆ ئەکردن دوایە ئەی گوت: (محمد) لە من قسەی خۆشتر نیە" (أمّا) تێ فکرە، عبارەتی (قورآن) لەگەڵ قسەی قائل و ناقل موافقە ناکا ﴿إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ لە (ڕەحمەت)ەوە ئەو (کتاب)ەی ناردیە، تا لە (ظلمات)ی (کفر) قورتار بن لێتان خۆش بێ، (حکایەت) لەکێ؟ قورآن لەکێ؟ ﴿وَقَالُوا﴾ (آلوسی) ئەفەرموێ: (نزلت في جماعة من کفّار قریش). بەڵێ ممکنە لەگەڵ (نضر)ی لێکیان دابێتەوە. ﴿مَالِ هَذَا الرَّسُولِ﴾ ئەگەر ڕاست ئەکا ﴿يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ﴾ طعامی ئەخوا، بۆ طلبی رزق لە بازار ئەگەڕێ. مادام رسول بێ، نابێ بخوا! نابێ إحتیاجی هەبێ بە معاملەو گەڕان! بۆ وجهی معیشەت و گوزەران!.

نازانم غفلّەتە، یاغرورە ؟ ممكنە لە آیەتیان وەرگرتبێ! جەنابی رسالەت پەناه بۆ ردّی إعتقادی نصاری دەرحەق (عیسی بن مریم) ئەیفەرموو: (كانا یأكلانِ الطَعام ویَمشیان في الأسواقِ). ئەمە حقّە (إبن الله)، (أم الله) نابێ لەو حالّەدا بن! أمّا (رسول الله) بۆچی؟ بە رسالەت لە مقتضای بشریەت وحیاة دەرناچێ! في الحقیقە ئەمە زۆرە، دلیل لە وجهی خۆی، لای ئەدەن! دلیل كە لە جیهەتی تر دەلالەتی لادرا، باطل ئەبێ! گەلێ لە مەلایانی ئێمە، لە كلام ولە حِكْمَە، دەلیلێ كە حكمایان وەرگتیە، لە وجهی لائەدەن! مَعَ الأسَف ناچێتە سەر!. ﴿لَوْلاَ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيرًا﴾ نازانم ئەوانە ملكیان ناسینە؟ ئەگەر زاتێ هات لەگەلّ إنسانێ ووتی: من ملكم بۆ تأیدی وی هاتیمە، چۆن ئەزانن ئەوە ملكە یا ملك نیە؟ كە ملك هات چ حاجەت بە رسولی بَشَر نامێنێ؟ ئەوساش ئەلّێن: (با خۆی فەرمایشی ئیلاهیمان بۆ بێنێ). ﴿أَوْ يُلْقَى إِلَيْهِ كَنزٌ﴾ لە طرف خوا، بۆی باوێژرێ، نەگەرِێ بۆ طلبی رزق، لە بازارِان نەخولێتەوە! ﴿أَوْ تَكُونُ لَهُ جَنَّةٌ﴾ باغێ میوەجات. ﴿يَأْكُلُ مِنْهَا﴾ لێی بخوا، إستغنا بكا لە كسابەت. ﴿وَقَالَ الظَّالِمُونَ﴾ متجاوزانی لە حد. ﴿إِنْ تَتَّبِعُونَ إِلاَّ رَجُلاً مَسْحُورًا﴾ سحری لێ كراوە، عقلّی تێك چووە. أصلی لغەتی (مسحور) بە مكانێ ئەلّێن باران تێكی دابێ بە فسادی بردبێ. هەرچەند (سحر) بە معنا (رئة) هاتیە، أما تفسیری مسحور بە (ذي سحر) یعنی صاحبی سیپەلاك، وەكی ئێمە، بێ معنایە!! لە پاش (یأكل الطعام ویمشي في الأسواق) چ حاجە بە بیانی مماثلە ئەمێنێ؟ (سیّدی آلوسی) بعضە قیل قیلان نقل ئەكا، بە قسەی مسحوران ئەچن! ﴿انظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا لَكَ الأَمْثَالَ﴾ بێ تفكّر وتأمّل بێ مناسبە. دەعوەتی عباد بۆعلم وعقلّ وشرف وإنتظامی معیشة وإستمراری حیاة بە راحەتی وخۆشی، چ دەخلی بە گەنج و خەزنەو باغ و بوستان هەیە؟ زاتاً ثروەت وسامان نزهەتی مناظر، رَغدي عیش ونازو نعمة، إنسان لە رِێی دەرئەكات! ﴿فَضَلُّوا﴾ كومراە بووین.

﴿فَلاَ يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلاً﴾ چ ڕیٚ‌یان نیە. بەو قَدح وطَعْنَە، هەرزەگۆیی ئەکەن! . ئەو أصنامی ئەوان سجدەی بۆ ئەبەن، تماثلی عزراء، کە ئەمڕۆ أمر دراوە لە طرف دکتاتۆری إیطالیا أولادی مکاتب کە منوّەر و حور بوون، هەموو ڕۆژێ بەرانبەری رکوع ببەن، چ ملائکەت هاتیە بلێ ئەوانە إلاهی ئێوەن یا مُمَثّلی إلاهن، صاحبی خزنەو باغ وباغاتن؟ عجائب بۆ رسالەتی بشری ئەوە إیجاباتە؟ بۆ ألوهیەتی حجر وبقر، هیچ! ئەمە چیە؟ سبحان الله جەنابی رسالەت پەناە لە دەستی أفّاکان نجاتی نەبوو! أمّا هیچ نەبێ أفّاکی ئێرە نظر بە أفّاکی سورەتی (نور) نوعاً ما مەردن! أفّاکی سورەتی (نور) (حقیقةً) نامەرد و بێ مروەت وشەڕەف بووین! ﴿تَبَارَكَ الَّذِي إِنْ شَاءَ﴾ لە مشیّەتی وی عاصی نابێ سهلە ﴿جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِنْ ذَلِكَ﴾ لە مُقْتَرَحْیان. ﴿جَنَّاتٍ﴾ نەیەك نەدە، إلی ما شاء الله لا تُعد! ﴿تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ وەکی بەهەشتێ زۆر بە سەیرو صفاء. ﴿وَيَجْعَلْ لَكَ قُصُورًا﴾ قصورێ بێ قصور کە خیالێ لە تصویری قاصرە. ئاە ئەمڕۆ ئەو دَنیٌّ النفسانە بعضێ مواقعیان دیبا، ئەوجا ئەیانزانی لە قصر و کاشانە و شانوشین دانیشتن، زۆر جێی حورمەت وکرامەت وگەورەیی نیە! ﴿بَلْ كَذَّبُوا بِالسَّاعَةِ﴾ إیمان نەهێنانیان لەبەر بێ آیتی نیە! لەبەر تکذیبە بە آخرەت! مانعە لە أتبّاعی شهوات! ئەوی إیمانی بە آخرەت هەبێ، لەزەتی بێ کدورەتی نابێ! لەزەتی صاف بێ غش و کدر، لەزەتی ئەوانەیە کە إنکاری ساعە ئەکەن! ﴿وَأَعْتَدْنَا لِمَنْ كَذَّبَ بِالسَّاعَةِ سَعِيرًا﴾ مقابلی باغات وقصور. ﴿إِذَا رَأَتْهُمْ﴾ جَهَنَّم ئەوانی دیت. ﴿مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ﴾ لە جێگای دوور. ظاهری آیات وأحادیث وائەگەیێنێ (سعیر، جهنّم) شتێ بێ، ببنێی! قسە بکا! خۆی لە دەست ملائکەتان ڕاپسکێنێ! أمّا تمثیل وتشبیهیش لە لسانی عرەب وقران، کەم نیە! گەرچی ئێمە لامان دروستە (نار) حیاتی تیا پەیا بێ وە قسە بکا! بەڵام تفسیر بە وجهێ مألوف ومعقول ومقبولێ ترە ئەمە لازم نیە لەبەر (معتزلیەتی)بێ! ئەلێ: مالی فلان لەگەڵ مالی فلان دوورە؟ یەکدی نابینن؟ ئاگریان یەکدی نابینێ؟ ئەو خانیانە متناظرن، تەماشای یەك ئەکەن!

یعنی ئەوەی تیایان بێ، یەکدی ئەبینن لە دوور! یا کە خەڵکیان دیت! ﴿سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا﴾ دەنگی غضب آلود. ﴿وَزَفِيرًا﴾ دەنگی هەناسە دەرخستن، یا هینان و بردنی هەناسە﴿وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا﴾ لە (سعیر) ﴿مَكَانًا ضَيِّقًا﴾ جێی تەنگ. ﴿مُقَرَّنِينَ﴾ لێك بەند کرای. ﴿دَعَوْا هُنَالِكَ﴾ لەو جێیە. ﴿ثُبُورًا﴾ هیلاك ماڵ وێرانی خانە خشتوری ﴿لاَ تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُورًا وَاحِدًا﴾ چونکی خەسارەت مەندی هەر لە جهەتێ نیە، بە ثبوری إکتفاء بکرێ، جهاتی زۆرە! ﴿وَادْعُوا ثُبُورًا كَثِيرًا﴾ زۆر بێ حدّ وحساب. ﴿قُلْ﴾ ئەی (رسول)ی (حق) ﴿أَذَلِكَ خَيْرٌ﴾ ئایا ئەمە چاکە؟ چاترە؟ (سعیر) ﴿أَمْ جَنَّةُ الْخُلْدِ﴾ لە (داری آخرەت) ﴿الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ﴾ ئەوانەی خۆیان ئەپارێزن، لە (شرك و سیّئات) لە مخالفەی فەرمایشی خواو (رسول) ﴿كَانَتْ﴾ ئەو (جنّة)ە ﴿لَهُمْ﴾ بۆ وان ﴿جَزَاءً﴾ ئی (أعمال)ی (صالح)ە، ﴿وَمَصِيرًا﴾ ئەچنە ناوی، گەڕانەوەیان بۆ لای وی یە، وەك کەسێ ئێواران —(مثلاً)— بێتەوە بۆ ماڵی خۆی. یا تیای دێن ودەچن، جێیە (واسع) (مطلق العنان) وەکی جێی (جهنّمی)یان تەنگ نیە، ئەوانەی بەندەیی دار بین ﴿لَهُمْ فِيهَا﴾ لە (جنّة الخلد) ﴿مَا يَشَاءُونَ﴾ ئەوەی ئارەزوو بکەن، لە (ماکل) و (مشارب) (لذائذ)ی (طیّبە)، (طبیعی) هەر کەسێ بە گوێرەی حاڵی خۆی ئارەزووی (أشیاء) ئەکا، کەس لە (أمّەت) ئارەزوو ناکا جێی (رسول الله)ی ببێتە ئی وی، (تخصیص)ی ئەو نوعە (عامّ)انە، دیارە.

هەر (عامّ)ە (عامّ)ە بە (مقام)و (موقع)ی خۆی ﴿خَالِدِينَ﴾ لە (جنّة)ەکە ﴿كَانَ﴾ (وعد) بە (دخول)یان و (خلود)یان ﴿عَلَى رَبِّكَ﴾ لەسەر خوای توو ﴿وَعْدًا مَسْئُولاً﴾ لێ ی ئەتۆزرێتەوە، خواش (حتماً) بەجێی ئێنێ، (خلف)ی (وعد) —(بالاتّفاق) (ممنوع)ە، (إتفاق)یانە (وجوب)ی (بالأختیار) (موناف)ی (إختیار) نیە، (فاعل)ی (بالأیجاب)ی (بلا شعور) (وعد)ی نیە، تا (مسؤل) بێ. (بعث)ی (رسول) و (تشریع)ی (أحکام) —(حسب الوقائع الجزیة).

بێ (إختیار) و(علم) به (جزئیّات) (تصوّر) ناکرێ. (نکته)یه هەیه، نە ئێمە نە (حکیم)، نالێین: "خوا (مختار)ە، وەکی "حیوان" نە ئێمە نەحکیم) نالێین: "(فاعل)ی (بالأیجاب) وەکی (طبیعەت) بێ (شعور)ە" وە نەئێمە و نەئەوان بە تەواوی ناتوانن (مقصد) (تحریر) کەین ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ﴾ (مشرك)ەکان ﴿وَمَا يَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ (حتّی) (الأصنام)، (لکن) (مقام) وائەگەیەنێ، کە (عقلا) بن، (جواب) و (سؤال)یان لەگەڵ بکرێ ﴿فَيَقُولُ أَأَنْتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِي هَؤُلَاءِ﴾ (جناب)ی (حق) (سؤال) له (معبود)ەکان ئەکات، ئایا ئێوە ئەوانەتان گومڕاه کردیە؟ ﴿أَمْ هُمْ﴾ یان خۆیان، بێ (إغوا)ی ئێوە ﴿ضَلُّوا السَّبِيلَ﴾ ڕێیان بزر کرد، له (طریق) (صواب)یان لادا ﴿قَالُوا﴾ له (جواب)ا ﴿سُبْحَانَكَ﴾ تۆ له (شیء) (مقدس)ی، ئێمە (تنزیه)ی تۆ ئەکەین، له هەموو (نقص) ﴿مَا كَانَ يَنْبَغِي لَنَا﴾ (لایەق)ی ئێمە نیه، باسی (غیر) (ممکن)ە ﴿أَنْ نَتَّخِذَ مِنْ دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَاءَ﴾ (ظاهراً) ئەوە (جواب)ی (مسؤل) و (عنه)وان نیە. لە حاڵی (عبید)ەکان ئەوەشێتەوە، لام وایه بۆ (توفیق حسن) و(زیدی بنی قعقاع) یعنی هەر ئەودوو ذاتە (نُتَّخَذَ) به (ضمّ)ی (نون) ئەخوێننەوە.

بنا له قولی (سیّدی آلوسی)، گەلێ ذواتی گەورە، حتّی (أبو الدرداء) و (زید بن ثابت) وایان(قرائەت) کردیه. (لکن) (زجّاج) و (إبن جریر) پێی (راضی) نین. (إبن جریر) به (٣) وجهان ردّی ئەکا، آخری ئەفەرموێ: "ئەگەر (مِنْ) نەبا، جوان بوو" (زجّاج) و (إبن جریر) هەم (عصر) بوون، (أمّا) بۆم (تحقیق) نەبوو، یەکیان دیتیه؟ (تألیف)ی یەکیان چاو پێ کەوتیه؟ وە(زمخشری) (توجیه)ی بۆ ئەو (قرائەت)ە کردیه، نازانم مقبوله یان نا؟

(لکن) (معنا)ی لەسەر (قرائەت)ی (جمهور) جوانە. (خلاصه) ئێمە (حدّ)ی ئەوەمان نیه، (إتخاذ)ی (ولی) بکەین، (غیر)ی توو. (فکیف) خۆمان ئەکەین بە (ولی) و (دعوەت)یان بۆ (عبادەت)ی خۆمان ئەکەین؟! خەیلی، خەیلی دوورە بەڵێ ئەوانە لە (ذات)ی خۆیان (محتاج)ن، وەك (سائری کائنات) (ممکن الوجود)ن. ئەگەر (دعوەت)ی کەسێ بکەن، ئەبێ (إتخاذ)ی کەن بە (ولی) و

(ناصر)، زێڕا (معبود)ەکان (محتاج)ی (عباد)ەکان ئەبن، (عباد)ەکان هیچ پەکیان لەسەر ئەو (معبود)انە نەکەوتوە. (حاشا ثم حاشا) ئێمە ئەوانەمان (ضال) نەکردوە، خۆیان دوای هەوای (نفس) کەوتوونە ﴿وَلَكِنْ مَتَّعْتَهُمْ وَآبَاءَهُمْ﴾ بە (أنواع)ی (نِعَمْ) (مغرور) بوون، لە (شهوات)ی (بَهیمیّە) ڕۆ چوون لە ڕێ دەرچوون ﴿حَتَّى نَسُوا الذِّكْرَ﴾ (غافل) بوون، یادی توو ناکەن، بە (خیالٚ)یشیان دا نایی ﴿وَكَانُوا قَوْمًا بُورًا﴾ (أساساً) (قوم)ێ بەد بوون، بێ (خیر) (فاسد الأخلاق) (تربیە) کوێر لە دیتنی (حق). (حقاً) (أول وآخر) (ثروەت)و (سامانی) (عموم)ی (سوق)ی (قوم) ئەکا، بۆ (فحشیّات)، لە خوا دووری، (خصوص) کە (فساد)ی (سیّئات) و (وقایع) زێتر مالّی پێ پەیاکەن وە(قوم)ی تری پێ وەرگێڕن. وە(سیّدات)ی (کاسیات)ی (عاریات)ی (راقصات) (دانسات)، بە ڕاستی خەستیان کردیە، (عالم) لە ڕێ دەرچوون ﴿فَقَدْ كَذَّبُوكُمْ﴾ (أیّها العَبد)ە (معبود)ەکانتان (تکذیب)ی ئێوەیان کرد ﴿بِمَا تَقُولُونَ﴾ کەئەوانە ئێمەیان لە ڕێ لاداوە ﴿فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا﴾ لادان (عذاب) ﴿وَلاَ نَصْرًا﴾ (عون)و یاردەمی خواتان نەبوو، ئەوانیش هیچ، چیان پێ ناکرێ، (حتی) بشکرێ بەرین لە ئێوە، چتان بۆ ناکەن. جا (أیّها المشرکون) لە خۆتان بگەن، بزانن لە ڕۆژی (جزاء) کەستان بەهانا ناگا، لە ڕووە پێتان ئەڵێین ﴿وَمَنْ يَظْلِمْ مِنْكُمْ﴾ پاش بیانی حالّی شرکاتان، ئەوجا (فی الحقیقە) شرك تجاوزی بێ ئەندازەیە، بێ معنایە بە وهم وخیالّیش توجیەی بۆ ناکرێ ﴿نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا﴾ بە نسبەت ظلمیان.

زۆر جار (تأمّل) ئەکەم، ئایا (ضلال)ی(سوادی أعظم) لە (بشر) (أساساً) خطای خۆیانە؟ قراری قطعیم پێ نەدراوە، (أمّا) (تحمّق)ی أهالی دخلەکی زۆری هەیە، لەسەر (تشجیع) (رأساً) بۆ (إضلال) و(تسخیر)و (إستخدام)یان. أهالی بێ محاکمە هەمووشی عاجباتی قبولٚ ئەکا، جارێ نالّێ: "کوو وائەبێ؟" ئەوە خۆشە، ئەوی (حقیقەت)یان (تعلیم) ئەکا، لەگەڵیان ساغ بێ، نایانەوێ،

به سووکی ئەی نۆڕنێ، بەڵکو بە چاوی (عداوەت)! ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ (نوح)، (إبراهيم)، (موسی)، سائری رسل.
﴿إِلَّا إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِي الْأَسْوَاقِ﴾ تنافی له بینی رسالەت وبەینی خواردن وگەڕان له بازاڕان، نیه! چتاقیان صاحبی قصرو قصورو باغات وجنان نەبووین. خزینه و دفینەیان بۆ نەهاتیه. ﴿وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً﴾ رئیس بۆ مرؤسی، آباء وأولاد، ذی حشم وحشم، رَسول وأمّة. رسولەکانی دیش، معارضەیان کراوه، گەلێ کەسیان پێ به هیلاك چووین. حاصڵی دنیا مجالی جِداله، مەیدانی حربه، مکتبی إمتحانه، مەردی دەوێ صبر بکا! ﴿أَتَصْبِرُونَ﴾ بەلێ صبر الکرام! ﴿وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا﴾ لبَي أشياء ئەبینێ، صبری لەسەر ئاگاداریه!. لەو بعض وبعضه مفَسّرین خلافیان زۆره.

# ناوەڕۆکی بەرگی شەشەم